ناوی کتێب : برایم ئەحمەد ژیان و بەهرەو داهێنانی
نووسینی : ئەحمەد شەریف عەلی
تیراژ : ١٠٠٠ دانـــــــە
تایپی کۆمپیوتەری نیاز عومەر عەلی - دیاری جەمال عەبدوڵڵا
بەرگ و جیاکردنەوەی رەنگەکان : دیاری جەمال عەبدوڵڵا
سەرپەرشتیاری چاپ : عەبدولقادر ئەمین ئەحمەد
چاپ : چاپخانە و کۆمپیوتەری بەدرخان
لەسەر ئەرکی وەزارەتی رۆشنبیری چاپ کراوە.
ژمارەی سپاردن : ( ١٣٨ )ی ساڵی ٢٠٠٢ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێشکەشە

به

**ڕێبوارانی ڕێبازی کوردایەتی،**
**هەڵگرانی مەشخەڵی ڕۆشنبیریی**

# برایم ئەحمەد..
# ژیان و بەهرە و داهێنانی

## پێشەکی

دوای شەڕی یەکەمی جیهان و لەناوچوون و نەمانی پیاوە نەخۆشە لەش بەبارە کەنەفتەکەو، دابەش بوونی میراتە بەجێماوەکەی لەسەر ئەوگەلانەیکەوتبوونە ژێر ڕکێف و چەپۆکیەوە، هەستی نەتەوایەتی بەخۆدا هات و گەشەی سەندو بیروباوەڕی ئازادی و سەربەخۆیی لەڕۆژهەڵات و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەتایبەتی بڵاوبووە.

دروست بوون و دامەزراندنی چەندین دەوڵەتی سەربەخۆو ئازاد هاتەکایەوە.

دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی باشورو دانانی شێخ مەحمودی حەفید بەمەلیك و گەڕانەوەو هاتنەوەی ڕووناکبیرو ئەفسەرو کادرە ئیداریە کوردەکانی نێودەوڵەتی عوسمانی بۆ وڵات و سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەڕوسیا، زاڵ بوون و سەرکاری دەسەڵاتی ئینگلیز لەناوچەکە. بەرپابوونی

بزوتنـەوەی شۆڕشـگێڕی و ڕۆشـنبیری لـەباکوری کوردسـتان، هـەموو ئـەو فاکتەرانـە کاریگـەری خـۆی بینـی و بوونـە مـاك و بنچینـەی بزووتنەوەیـەکی ڕۆشنبیری و ئەدەبی و، گەشەکردنی هەستی نەتەوایـەتی، لـەناو کۆمـەڵانی خـەڵکی بەگشتی و خوێندەوارەکانی شاری سلێمانی بەتایبـەتی بزوتنـەوە شۆڕشـگێرییەکە کەلەمـەیدان و دەرەتـانی فیکـری و ئـەدەبی و مێژوویـی و کەلتووری و زمان و ڕۆژنامەگەری و خوێندەواری و مەدەنیەت و شارستانیەتدا بوو، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پترو خێراتر گەشەی دەکرد و بەرەوپێشەوە تـەکانی دەدا.......

لـەئاکام و ئـەنجامی ئـەو ڕووداو و گۆڕانکاریانـەی لەپێشـەوە ئاماژەمـان پێکرد، کۆمەڵە لاوێکی پێگەیشتوو لەبوارو مەیدانی ڕۆشنبیری و ئەدەبی‌دا ڕۆڵی سەرکیان بینی، لەنێو ئەوانیش دا بەتایبـەتی (پـیرەمێرد، بنەماڵـەی سـائب، ڕەشـید نـەجیب، ئـەمین زەکـی، ڕەفیـق حیلمـی، تۆفیـق وەهبـی، بێکەس، شێخ نوری شێخ ساڵح، گۆران، برایم ئەحمەد) دیار بوون.

هێنانی چاپخانە بۆ شاری سلێمانی لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە واتە لەسەردەمی حکومدارێتی ئینگلیز- بووە فاکتەرێکی بەبایەخ و گرنگی تری گەشەسەندنی ئەو بزاڤە ڕۆشنبیری و ئەدەبی‌یە هەڵچووە.

لـەنێو ڕوناکبیرو خوێندەوارانـی شـاردا، کـوڕە نـەدارو هـەژارێك، لاوێکـی خوێنگەرم و سوور لەسەر مەبەست، چوست وچالاك، بەهرەدارو بەتوانست، کارامەو لێهاتوو..

لەسـەرەتای سـیەکانی سـەدەی بیسـتەمدا هاتـە مـەیدان و گۆڕەپـانی ڕۆشنبیری و ئەدەبیەوە.

ئەو گەنجە هوشیارو هۆشمەندەش ناوی (ئیبراهیم ئەحمەد فەتتاح) بوو ناسراو بە (بلەی ئەحە ڕەش).

لەسەردەمی یەکەم شەڕی جیهانی‌دا چاوی بەدنیای ڕووناك هەڵهێناوە، دوو جار دامەزراندن و تێکچوونی حکومەتی کوردستانی بەچاوی خۆی بینیوە.

گرانی گەورەو برسێتی و نەهامەتی کوردو، جەورو ستەم و زۆرداری داگیرکەری ئینگلیزو عەرەب و تورك و فارس کاری تێکردووە..

کارەساتەکان وەکو فیلمی سینەما هەموو ڕۆژێ چەندبارە دەبوونەوە. ئەو ڕووداوو کارەساتانە بوونە ئیلهام بەخش بۆ داهێنانەکانی (بلەی ئەحە ڕش) لەبوارو دەرفەتی خەباتی سیاسی و فیکری و ئەدەبی و زمانەوانی و ڕۆژنامەگەری‌دا.

لەناو میللەتانا بەدەگمەن پیاوێك هەڵکەوتووە کۆمەڵێ بەهرەی تیادابێ و ڕۆڵی سەرەکی لەهەموو بوارەکانی ئەو بەهرانەیدا پێیداوە ببینێ!!.

لەکۆمەڵی کوردەواریدا گەلێك قارەمان هەڵکەوتووە ..... لەبواری سیاسی و خەباتی شۆڕشگێڕی و نیشتمان پەروەری‌دا قارەمانی وەك (محمد پاشای ڕەواندوز، کوڕانی بەدرخان پاشا، شێخ سعیدی پیران، عبدالقادر شەمزینی، شەریف پاشای خەندان، سمکۆی شکاك، شێخ محمودی حەفید، قازی محمدی نەمر، مەلا مستەفای بارزانی، مام جەلال تاڵەبانی هەڵکەوتووە.

لە بواری کۆمەڵایەتیدا.. (مەلا محمدی کۆیی، مەلا فەندی هەولێری، عەلی کەمال، نەجمەدین مەلا، ڕەفیق حلمی، عزەدین فەیزی و شێخ عزەدین حوسێنی) هەڵکەوتووە..

لەبواری زمانەوانی و فەرهەنگیدا.. (تۆفیق وەهبی، جەمال نەبەز، عیزەدین مستەفا، ئەورەحمانی حاجی مارف، عەبدولڕەحمانی زەبیحی، مەسعودی مەلای گەورە، ئەنوەر مائی و صادق بەهادین ناسراون).

لەبواری مێژوویدا.. (شەرەفخانی بەدلیسی، ئەمین زەکی، حوزنی موکریانی، مەردۆخی، عەلادین سوجادی، کەمال مەزهەر) ناوبانگیان دەرکردووە.

لەبواری ئابووریدا.. بەداخەوە کورد تا ئێستا پسپۆڕی ناوداری گەورەی تیا هەڵنەکەوتووە یان ئێمە ناوبانگمان نەبیستووە.

ناوبردن و بە نموونە هێنانەوەی ئەو بەهرەمەندانە لەبوارە جیاجیاکاندا ناویان هاتووە، ئەوە ناگەیەنێ کە خەڵکی تری بەتواناو قارەمان و بەهرەدار لەکوردا نەبووە! بەپێچەوانەوە خەڵکی ژیرو لێهاتوو زۆر زۆرن، بەڵام ئەوانە شاگوڵی سەر چڵەکانن و گیابەندی کێوی قەندیلن..

بەڵام برایم ئەحمەد.. بلیمەت و داهێنەر بووە، چیرۆك نووس و شاعیرو وەرگێڕو ڕۆژنامەنووس و پارێزەرو نیشتمان پەروەر بووەو لە زمانەوانیدا پەنجەی لەگەڵ تۆفیق وەهبی گرتووە.

بەلای ئێمەوە ئەم کەڵە پیاوە ڕێکخەرو داڕێژەری بیرۆکەی ڕێکخستنی کوردایەتیش بووە، بەو شێوەو شکڵەی ئەیبینین..

بەبەڵگەی ئەوەی لە ساڵی ١٩٣٧ز نامیلکەی (برایەتی کوردو عەرەبی) نووسیوەو بڵاوکردووەتەوە، ئەو نامیلکەیە بوو بە بەرنامەی پەیڕەو کراوی بزاڤی کوردایەتی و تا ئێستا کورد لەسەری کۆك و تەبان.

بۆیە بە پێویستم زانی ئەم کتێبەی لەسەر بنووسم، هەرچەندە ژیان و داهێنانی ئەم پیاوە زیاترو زیاتری دەوێ.

هیوادارم توانیبیتم خزمەتێکی بچووکی نەتەوەکەم بکەم و ئەمە سەرەتایەك بێ بۆ نووسینی ژیان و داهێنان و قارەمانێتی ئەو قارەمانانەی کە لەڕێی کوردایەتی و زمانی شیرینی کوردیدا ژیانیان بەسەر بردووە.

هەموو ژیانی خۆیان بەخشیوە بە کۆمەڵگەی کوردایەتی.

لە کۆتاییدا دەڵێم:

دیارە هیچ کارو نووسینێك بێ کەم و کورتی و ناتەواوی نابێت، بۆیە تکا لە ڕۆشنبیران و ئەدەب دۆستان دەکەم لە هەڵەو ناتەواوی و کرچ و کاڵی باس و نووسینەکان ئاگادارمان بکەنەوەو بۆمان ڕاست بکەنەوەو نووکی خامەکانیان بخەنە کار بۆ شەن و کەو کردنی ناوەڕۆکی ئەم کتێبەو سوپاسیان دەکەم..

ئەحمەد شەریف عەلی
سلێمانی
ساڵی ٢٠٠٢ی زایینی
٢٧٠٢ی کوردی

# ژیان و بەسەرهاتی برایم ئەحمەد

ناوی ئیبراهیم ئەحمەد فەتاحەو، بەبلەی ئەحە ڕەشی فەتاحە ڕەش ناسراوە. دایکی ناوی (خونچە)ی کچی (عەبەی دەروێش قەمچیە[1])و (دایك و باوکی) هەردوکیان نەخوێندەوار بوون. لەبەهاری ١٩١٤ز لەگەڕەکی دەرگەزێنی شاری سلێمانی لەدایك بووە... پاشان چونەتە گەڕەکی سابونکەران- بەیەکێك لەبەرچاوترین و دیارترین و کەڵەترین کەسایەتی کوردەکانی عێراق دەژمێردرێ لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا. پیاوێکی ئازاو بوێرو چوست و چالاك و خاوەن بیروباوەڕێکی پتەوو چەسپاو بوو... لەساڵی ١٩٢٢ز چووەتە (قوتابخانەی نموونەیی سەعادەت)، کەبۆ منداڵی وەك ئەو لەپۆلێکا دایاننناوە پێیان ئەوت (احتیاط). لەساڵی ١٩٢٣ز چووەتە (قوتابخانەی لەتیفیە)و بەناوی کوڕە بچکۆلەکەی مەلیك مەحمودەوە ناونرابوو. لەدوای ئەوەی ئینگلیزەکان هاتنە سلێمانی گواسترانەوە بۆ (سەرەتایی یەکەم) کەلە ماڵەکەی (بەهێ خانی) خێزانی شێخ محمودداا بوو. پاشان گوێزرانەوە بۆ شوێنێك، کەپێیان دەوت (مەکتەبی سیاسی)، کەهەندێ جار کاربەدەستە ئینگلیزەکان و هەندێ جاریش مەلیك مەحمودی لێ دادەنیشت. تاساڵی ١٩٣١-١٩٣٢ز لەوێ خوێندوویەتی، لەپۆلی سێی ناوەندی چووەتە بەغداو لەناوەندی (کەرخ) پۆلی سێی بڕیوە. پۆلی چوارو پێنجی دواناوەندی لەئامادەیی (مەرکەزی) بەغدا تەواوکردووە.

---

[1] کوردستانی نوێ، ژمارە (٢١٣٨) شەممە ٢٠٠٠/٥/٦، ڕۆژنامەی The Time

لەساڵی ١٩٣٤ز لەکۆلیژی ماف (كلية الحقوق) لەبەغدا وەرگیراوە.
لەساڵی ١٩٣٧ز لەکۆلیژی ماف دەرچووەو بووە بە (ئەوقات) (پارێزەر).
لەساڵی ١٩٤٢ز لەدادگای هەولێر بووە بەدادوەرو دواتر لە دادگای هەڵەبجە کاری کردووە.
لەساڵی ١٩٤٦ز داخوازی ژنی کردووەو شەکراوی بەخشیوەتەوەو نیشانی کردووە.
لەساڵی ١٩٤٧ز گواستویەتیەوەو ناوی خێزانەکەی (گەلاوێژ خانە) کچی سالح فەتاحە لەعەشرەتی کۆچ بەگی خەڵکی شارۆچکەی زاخۆیە. دوو کورو شەش کچی لێ بووە، ناوی کوڕەکان (هەڵۆ، هاوڕێ)یەو ناوی کچەکانیشی (هێرۆ، شاناز، هەتاو، لیلۆز، هەیڤی، مژدە)یە. کەئەم ژن خواستنەشی بەرێکەوت بووە(٢).
برایم ئەحمەد پێنج خوشك و دوو برای هەبووە. بنەماڵەکەیان لەسەرەتاوە هەندێکیان (بەرەی باوکی) لەهەورامان و هەندێکیان (بەرەی دایکی) لەکەرکوکەوە هاتوونەتە سلێمانی و بەکارو کاسب-ی یەوە خەریك بوون.
خێزانێکی هەژارو بێوەیی و بێ کێشە لەسلێمانی جێ نشین بوون و خەریکی نان پەیداکردنی خۆیان بوون. لەبەرئەوەی باوکی برایم ئەحمەد دەستڕۆ نەبووەو نەیتوانیوە وەك پێویست یارمەتی بدات، بۆیە (ڕەمزی فەتاح)ی مامی کەئەفسەری سەردەمی عوسمانی(٣) بووەو وەزعی باش بووە، ئەو مامەی زۆر یارمەتی برایمی داوەو مەسرەفی بۆکردووەو پشتگیری

---

(٢) فاکسی تایبەتی خۆی لە ١٩٩٩/١١/٢٥ بۆ نوسەری ئەم باسە.

(٣) ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٢١٣٨)، شەممە ل٩.

زۆری کردووە. تابتوانێ خوێندنی حقوق تەواو بکات و هاوکاری باشی کردووە تاخوێندنی تەواو کردووە، برایم بۆ خۆشی لەخوێندن زیرەك بووە و هیچ ساڵێك لەخوێندن دوانەکەوتووە و نەماوەتەوە.

لەساڵی ١٩٤٩ز درایە دادگای عورفی و ساڵونیوێك حوکمی بەندکردنی بەسەردا دراو ڕەوانەی بەندینخانەی بەغدا کرا، ئەو ماوەیەی لەزیندانی بەغدا بەسەربرد گۆڤاری (گەلاوێژ) داخراو قەدەغەکرا. لە (توقیف)دا لەئەبوغرێب بوو، ئەو کاتە ئەبوغرێب تەنها مەوقوفی لێبوو، تەوقیفەکە شوێنی عەسکەری بوو لەبەرئەوەی وڵات حوکمی عورفی لەسەربوو خەڵك لەوێ (تەوقیف) دەکران، بەڵام کەحوکم دەدران دەنێردران بۆ شوێنی ترو، برایم ئەحمەد نێردرایە بەندینخانەی بەغدا.

برایم ئەحمەد لەساڵی ١٩٥٤ز کەخەریکی ئەوقاتی (پارێزەری) بووە لەدژی ئاغاکان بەرگری لەجوتیارەکانی کوردستان دەکرد. دەرەبەگەکان ڕقیان لێ بووە و هەوڵی تیرۆرکردنیان داوە دایانە بەر دەستڕێژی گوللە و بەسەختی بریندارییان کرد بۆ ئەوەی چاوترسێنی بکەن و چی دی بەرگری لەمافی جوتیاران و زەحمەتکێشان نەکات و پارێزەرەکانی تریش زاتی ئەوە نەکەن بەرگری لەمافی جوتیاران بکەن [٤] تاوانبارەکەش ناوی (ئەحەی ڕەشە قوڵچی) بووە پیاوی (حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا) بووە.

برایم ئەحمەد لەوفاکسەیدا، کەلە ١٩٩٩/١١/٢٥ بۆی ڕەوانە کردووم، لەوەڵامی ئەو هەشت پرسیارەی لێم کردبوو لەبارەی ژیانی خۆیەوە دەڵێت:

((ڕاپەڕینی شەشی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ز بەردەرکی سەرای شاری سلێمانی کەتەمەنم ١٦ شانزە ساڵان بوو لەناخەوە هەژاندمی و هەستی

---

(٤) ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٢١٣٠) چوارشەممە ٢٠٠٠/٤/٢٤ نوسینی کاکە حەمەی فەرەج.

کوردایەتی تیاجۆش دام و لەگەڵ هاوڕێکانمدا کەوتمە جموجوڵی کوردایەتی و شیعر خوێندنەوەو شیعر نووسین و شەڕە شیعر، لە ساڵانی سییەکاندا لە هەڕەتی لاوێتیدا لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا چالاکی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و سیاسیی نوواندووە. لە چالاکی ناو لاواندا گروپێك پێکهاتبوو بەناوی (لاوانی کورد)ەوە هاتووچۆی یانەی (سەرکەوتن)یان دەکرد، کە تایبەت بوو بە کوردەکانی بەغداو دوو نامیلکەیان دەرکرد بەناوی (یادگاری لاوان و دیاری لاوان)ـەوە، شیعرو چیرۆك و وتاری سیاسیی کە هەستی نەتەوایەتی لاوانی دەبزواند لەو نامیلکانەدا بڵاو دەکرانەوە.

لەسەر ئەو بابەتە پرۆفیسۆر (بوخارد بریتس)[5]ی مامۆستای زانکۆی (هالە) لە ئەڵمانیای دیموکرات لە باسێکدا کە لە ساڵی ١٩٦٤ز دا لە گۆڤاری زانستی زانکۆی ناوبراودا بڵاوی کردووەتەوەو لەژێر ناونیشانی (دەربارەی هێندێ کێشەی مێژوویی جوڵانەوەی نیشتمانی کورد) دەنووسێت:

(لە بەغدا ئەڵقەیەك لە خوێندکارانی کوردی هوشیار لەدەوری برایم ئەحمەد کۆبوونەوەو گۆڤاری (دیاری لاوان)یان دەردەکرد، لەناویاندا دژایەتی فاشیزم بەدی دەکراو لەناو جووڵانەوەی نیشتمانی کورددا، برایم ئەحمەد وتاریشی لە دژی فاشیزم لە ڕۆژنامەکانی بەریتانیاوە وەردەگێڕا، برایم ئەحمەدو هەڤاڵەکانی بیرۆکەی خەباتی یەکگرتوو، یەکگرتنی کوردو عەرەب دژی ئیمپریالیزمیان بۆ یەکەم جار بڵاو کردەوە).

یەکەم نووسینی برایم ئەحمەد لە ڕۆژنامەی (ژیان)ی ژمارە (٣٢٦)ی ١٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٢ز بڵاوکراوەتەوە، بەو ناونیشانەی خوارەوە، کە ئەوکاتە تەمەنی تەنها ١٨ ساڵان بووەو ئەوەش دەقی نووسینەکەیەتی:

---

(٥) ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە (٢١١٧) لە ٢٠٠٠/٤/١١- ل١.

گەورەی خۆم نووسیندەی ژیان.[٦]

کە بیستم چاکی ژیانتان گرتووە، ویستم یارمەتیتان بدەم، ئەوەی لەدەستم دێت نووسینی هەندێ مەقالەی ئەدەبییە بەکوردی پەتی، وە یا وەرگێڕانی مەقالاتە لە ڕۆژنامەکانی غەربەوە بۆ کوردی، ئەمەم لەدەست دێت، بەڵام شەرت ئەوەیە کە یارمەتییەکەم قبوڵ بکەن، نامەوێ بەرامبەر بەو چەند شیعرە کە بۆتان دەنێرم یا بەرامبەر بەو مەقالانەی کە بۆتانی تەرجەمە دەکەم چ تەشەکورێکم بکەن، چونکە دەردی عەرەب دەڵێن: (لا شکر علی واجب).

وا ئەم جارە ئەم مەقالەیەم بۆ ناردن، وابزانم بەشی زۆری کوردی پەتییە، ئەگەر لە گۆشەیەکی ڕۆژنامەکەتانا نووسیتان، وادیارە یارمەتییەکەم قبوڵ ئەکەن، وادیارە هەر وەکو خۆتان بە پیری دەستتان داوەتە چاکی ژیان، ناتانەوێ بەگەنجی هاووڵاتتان دەستی لێ بەربدەن. قبوڵتانە ئامادەم هەموو وەختێ بۆ خزمەت، قبوڵتان نییە کارتان ڕاست بێت ئیتر خۆشی سەری ئێوە..

وەڵامی ڕۆژنامەی ژیان بۆ برایم ئەحمەد لە هەمان ژمارەدا دەڵێت:

ژیان چاوەڕێی ئەم شێوە کوردییە ڕەوانەیە، پیرەمێردیش بەهیوای نەوجەوانانە.

ئەم نووسینەی برایم ئەحمەد کە یەکەم نووسینی بووەو لەو سەردەمە کە تەمەنی ١٨ سالان تێپەڕی نەکردووەو بەو کوردییە پەتی و ڕەوانە نیشانەی زیرەکی و بەئاگایی نووسەرەو دیارە ئاستی هوشیاری خەملیوەو لە دەروونیا پەنگی خواردووەتەوەو هەر ئەو بیرو بۆچوونە وای لێکردووە بە کوردی پەتی بنووسێت و هەوڵی وەرگێڕانی مەقالات بدات لە زمانی

---

[٦] ڕۆژنامەی ژیان- ژمارە ٣٢٦، ١٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٣٢ز.

ئینگلیزییەوە بۆ سەر زمانی کوردی، بۆ ئەوەی خوێندەوارو ڕۆشنبیرانی کورد لە ڕووداوەکانی دنیا بەئاگا بن.

لەو ڕۆژەدا هونەر بووە لاوێکی تازە پێگەیشتوو بەو شێوەیە بیر بکاتەوەو هەست بە مەسئولییەت بکات بەرامبەر زمان و ئەدەب و کێشە سیاسییەکانی میللەتەکەی خۆی.

دووەم وتاری هەر لە ڕۆژنامەی (ژیان)دا لەژێر ناوی (شیرین لەسەرە مەرگا) بەناوی خوازیارەوە (نیقابداری سیاپۆش)[7] بلاوکردووەتەوە نووسیوێتی:

(ڕاکشابوو لەسەر جێ، چاوەڕێ بوو کەی مەرگ دێ، بەم شێوەیە لەسەری دەڕوات تا کۆتایی.

ئەمە چیرۆکێکی کورتە، باس لە سەرەمەرگی کچێك دەکات، هەموو هونەری چیرۆکی تێدایەو زۆر بەجوانی وەسفی کچەی ناو (شیرین دەکات لەکاتی گیان کێشان دا بەلام چۆن وەسفێك هەمووی پەخشانە کەدەلێ: برژانگی تێك شکاوو چاوی سوور هەلگەڕاو.....ئەو پەخشانە جوانەو بەو کوردی‌یە پەتیەو لەو سەرو بەندەدا زۆر گرنگەو جێگەی سەرنج و بایەخی لێکۆلەرەوەو پسپۆڕانە، چونکە کوردی نووسینی ئەوسەردەمە ووشەی تورکی و عەرەبی زۆر تێدابوو.

[7] ڕۆژنامەی ژیان- ژمارە ٣٢٨ لە ٣٠ حوزەیرانی ١٩٣٢زدا.

LAWAN

# یادگاری لاوان

بغداد ! چاپخانەی «كرخ»

1933
١٩٣٣

# برایم ئەحمەد و نامیلکەی (یادگاری لاوان)

برایــم ئەحمــەد دەیــان ووتــاری لەڕۆژنامــەو گۆڤارەکــان دا بــەناوی خوازیارەوە بڵاوکردۆتەوە، زۆر کەمو دەگمەن ناوی ڕاستی خۆی نووسیوە. ناوە خوازیارەکانی لەڕۆژنامەکانداو دواتر لەگۆڤاری (گەلاوێژ)دا بەم ناوانە بــووە: (ســیاپۆش) (بلــە) (ب. هـ. ل) (ن.ا) (أ.ب.ح). زۆربــەی چیرۆکــە وەرگێڕاوەکانی، لـەزمانی بێگانـەوە وەرگێڕاون کەلەسـەر سـەرکردەو پیـاوە ناودارو ناسراوەکانی دونیا نوسراون لەجیاتی ناوی تەواوی خۆی(ن.أ)ی بـەکار هێنـاوە. لەسـاڵی ١٩٣٣ز لـە (یادگــاری لاوان)دا کەکۆمەڵـە لاوێکـی ڕۆشـنبیرو شۆڕشـێگێڕ لەبـەغدادەریان کـردو برایـم ئەحمـەد پێشـەنگی ئـەو کۆمەڵـە لاوە بـوو، پێشــەکی‌نامیلکەکەی کردۆتــە دیـاری لاوانــی کــوردو نوسیویەتی[(٨)]!

بۆ ئەو لاوانەی درەخشی پێشکەوت هەڵئەکۆڕن.

بۆ ئەو خورتانەی ڕێگەی تاریکی ژیان بۆ کۆمەڵیان ڕووناک ئەکەنەوە.

بۆ.. ئەو بازو ئاسنینانەی زنجیری گیرۆدەیی ئەپچڕێنن.

بۆ .. ئەو دڵسۆزانەی گوێیان لەگریان و هاواری هەژاران بوو چاویان بەکەساس و لێقەوماوێ کەوت بەدەنگیانەوە ئەچن و یارمەتیان ئەدەن..

بۆ .. ئەو پاڵەوانانەی باری پێشکەوتنیووڵاتیان وابەسەر شانەوەیە.

بۆ .. ئەو دایکانەی مناڵەکانیان بەناوی خزمەتی ووڵاتەوە گوش ئەکەن..

---

(٨) یادگاری لاوان ژمارە (١)، ساڵی ١٩٣٣ز.

بەم شێوە لەسەری دەڕوات و دەنوسێت.

بۆ.. ئەو کەسانەی بڕوایەکی تەواوو نەگۆڕیان بەسەرکەوتن و ژیانەوەو وریابوونەوەی کورد هەیە.. بۆ.. ژین.. بۆ هیوا.. ئەم یادگارە پێشکەش ئەکەین..

لاوان..

خوێنەر کەسەیری ئەم پیشەکی و پێشکەش کردنە دەکات و لەلاپەڕەکانی ئەم نامیلکەیە وورد دەبێتەوەو بابەتەکانی دەخوێنێتەوە، شیعرەکانی گۆران و برایم ئەحمەد، نووسینەکانی شاکر فەتاح و عارف تاڵەبانی و جمال مەجید سلیم و محمەد عبدولڕەحمان پاشاو دکتۆر عەبدوڵرەحمان عەبدولا و زێوەری تێدا بڵاوکراوەتەوە بۆی ئاشکرا دەبێت، کەچ هەستێکی نەتەوایەتی پەنگ خواردوو لەو نامیلکەیەدا، ئەم کۆمەڵە لاوەی جۆش و خرۆش داوە.

شیعرە بەناوبانگەکەی برایم ئەحمەد (یادگارو هیوا)، کەلەو نامیلکەیەدا بڵاوکراوەتەوە، چ لەڕووی ڕووخسارو چ لەڕووی ناوەڕۆکەوە پەخشانە شیعرێکی بەرزو بڵندەو بەتایبەت ئەو دێڕە پرشنگدارانەی سەرەتایی:

*لەبەرچاوی بەد لەترسی بەدکار*
*دڵ خۆم ئەکەمە گۆڕی یادگار*
*بەگریانی ووشك بەناڵەی بێدەنگ*
*دێنمە لەرزین تەختی کردگار*

بەم شێوازە سەرکەشە هەنگاو دەنێ.. سەرپاکی شیعرەکە (١٠٤) سەدو چوار دێڕە شیعرەو لەکۆتاییدا دەڵێت:

*چاوە: وەك لێزمە بارانی بەهار*
*ئەسرینی خوێنت بۆ پیادێتە خوار؟*
*گریان کردمەوەی بێدەسەڵاتە*
*بێ دەسەڵاتان ئەرزێن لەژێربار*

ئەو هەستە ناسکەو بیرە قووڵەی لەو شیعرەدا هاتووە، ئەو بۆچوونە بەئاوەژوو ژیرە، ئەو تەحەداو بەپەرچ دانەوەیە، ئەو بەرهەڵستی و خۆڕاگری‌یە ؛ ئەو جوامێری و بوێری‌یە بەرامبەر دووژمنی کووردو لەو سەردەمو زەمانەدا، واتە بەرلە ٦٩ ساڵ پێش ئێستا کەزۆربەی خەڵك لەخەوی غەفڵەتدا بوون و تەنها ڕۆشنبیرەکان نەبێت، کەئەوانیش هەموویان نا، بەڵکو کەمێکیان، ئەو هەستەیان هەبووە، هەروەکو هێمن شاڵی (عەزیز شاڵی) دەڵێت:

*خەڵکی هەموو مردوون خوێندەوارەکانیان نەبێ*
*خوێندەوارەکانیشیان هەموو نووستوون ئیشکەرەکانیان نەبێ*
*ئیشکەرەکانیشیان بەخۆیان دەنازن پاکەکانیان نەبێ*
*پاکەکانیشیان لەڕێگای ترس و خەتەردان.*

| | |
|---|---|
| سیاپۆش= برایم ئەحمەدەو | ح.ف= حامید فەرەجە. |
| فلامورز= ڕەشید نەجیە. | ش.ف= شاکیر فەتاحەو. |
| م.ع= محمد عبدالرحمان پاشایە | ع.ع= د. عبدالرحمان عەبدوڵایە. |
| ز= زێوەرە. | ر.ن= ڕەشید نەجیبە. |

لەلاپەڕە (٣٣)ی هەمان ژمارەی (یادگاری لاوان)دا لەژێر سەرناوی (ئەدەبیاتی کوردی[٩])دا نووسیویەتی:

(شاعرەکانمان هەتا ئێستا بڕوا ناکەم لەواتەیی سوپاس و ستایش زیاتریان بیستبێ، یەکێك بە (توتی شکر گوفتار)و ئەویتربە (بلبلی شیرین کەلام) ناوی لێ ناون. هەرچەندە ئەم ناونیشانەشیان لەلاپەڕەی چ پارچە کاغەزو گۆشەی چ ڕۆژنامەیەکدا بۆ نەنوسراوە.

بەڵام لەمێشکی خۆیان و دەوروپشت و ناسیاویاندا زۆر چاك جێگیر بووە. بەڵێ، هەتا ئێستا بێ لێکدانەوەهەڵمان کێشاون لەمەشدا بیانوومان هەیە چونکە پیاو لەتاریکیدا جوان و ناشیرینی لاوەك یەکە. بەڵام لەمەودوا ئەو دەورە ڕۆشت بەزەرد بوترێ زێڕو بەسەدەف بوترێ مرواری، لەمەودوا ڕۆشنایی زانین بەرچاومان ڕوونـاك دەکاتەوە هەموو شتێ وەکو خۆی ئەبینین و پێویستە هەرشتە بەپێی بەرزی و نزمی خۆی ڕیز بکەین و بەپێی چاکی و خراپی ناوی لێ بنێین بەبێ بون نەڵێن نێرگس و بەنێرگس نەڵێن بێ بۆن..))

پاش تاووتوێ کردنی هەندێ لایەنی تر، ئەوجا دەڵێ:

((لەپێش ئەوەدا خەرمانی شیعرتان بۆ بەباکەم.. پووشتان بۆ لەکا ببێژم پێویستە گەوهەریەکانی شیعرتان بۆ بگرم تاکو خۆتان بیناسن ئەگەر دیتان شیعر تەرجەمانی دڵە، چی بەدڵابێ ئێش و ئازار، دەردو خەفەت هیواو نائومێدی، شین و شادی، شیرین و تاڵی، خۆشەویستی و قین، گوومان و باوەڕ، ترس و بێباکی، خراپی و چاکیمان بەواتەی ڕێك و پێك لەشێوەیەکی

---

[٩] یادگاری لاوان ل ٣٤ – ٣٥ بەغدا چاپخانەی کەرخ ساڵی ١٩٣٣.

دڵگیردا بۆ دەرئەخات کەهەموو کەس لەدەمی خوێندنەوەیدا شێوەیەکی دڵی خۆی تیا ئەبینێ..

شیعر: چرایەکە تاریکی ڕێی ژیانمان بۆ ڕۆشن ئەکاتەوە، یارمەتیمان ئەدات لەدۆزینەوەی ڕاستیدا.

شیعر: جوانی هەموو شتێکمان بۆ دەرئەخات، گیان تینوی جوانی و دڵیش برسی شیرینە، نەئەم تێری لێ ئەخوات و نەئەو توینێتی لێ ئەشکێ...))..

دیارە ناکرێت لەوە زیاتر دەقەکانی بگوێزمەوە نێو ئەم باسە، بەڵام لێرەدا پێویست بەوە دەکات دیدو بۆچوونی خۆم لەسەر ئەم وەسفەی نوسەر دەربڕم، چونکە ووتارەکەی ئەو دوورو درێژەو شیعرو شاعیریشی بەشێوەیەکی هونەری وەسف کردووەو نووسینەکەی هەموو بەپەخشانەو هەست و نەستی خۆی بەرانبەر بەشاعیرەکانمان دەربڕیوەو ئەو پێی وایە شاعیرەکانی ئێمە شیعری باشیان نییە بەپێی ئەو وەسفەی ئەو بۆ شیعری کردووە .

چونکە ئەو دەڵێت شیعر تەرجەمانی دڵەو جوانی هەموو شتێکمان بۆ دەردەخات. بەلای ئەوەوە شیعر ژیانە، وێنەو تابلۆی ژیانی ڕۆژانەی کۆمەلانی خەڵك نیشان دەدات. ئەو پێی وایە لەشەوانی لێکدابڕاندا فوولەکورەی دڵداری دەکاو ئاوێنەی بالانمای باری گوزەران و ژیانی ڕۆژانەی خەڵکە، ئەودەڵێت: شیعر بەخوێنی دڵ و بەفرمێسکی چاو دەنووسرێ، ئینجا دەپرسێت و دەڵێت، کەوابوو ئەگەر بەو پێودانگە بێ کورد نەشیعری هەیەو نەشاعیر، بەڵام دەڵێت من وەلام نادەمەوە هەرچەندە خەڵك واتێدەگەن شیعر ووتنێکی وەزنداری قافیەدارە، بەلام شیعری شاعیرەکانی ئێمە لەچاو ئەدەبیاتی جیهانیدا شوێنێکی دیاریکراوی نییەو لاسایی شاعیرەکانی فارس و عەرەبی حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر دەکەنەوە،

نازانن ئەوان شاعیری زەمانێك و زمانێك و ئەوانەی ئێمە شاعیری زەمانێك و زمانێکی ترن.

شاعیرەکانی ئێمە زۆربەی شیعرەکانیان لەسەرچاوی کاڵ و لێوی ئاڵی ژنانە بەبێ ئەوەی باسی جوانی سروشتی خاکی نیشتمان بکەن. یان لەکێشەی کۆمەڵایەتی و باری ئابووری و رامیاری خەڵکی وڵاتی خۆمان بدوێن، هەتا لەباسی جوانی ئافرەتیش نازانن و وێنەی ژنی لادێی کوردەواری بگرن، هەروەك مەڕ دۆشینی ئافرەتی کوردو مەشکەژەنی و تەون و گیسەو سوارەو هەوێز ماڵین و کنگرو مازو ڕێواس چنینیان نەدیبێ وایە. وێنەکانیان دزێوەو ناوەڕۆکیان بەرداوەو ڕێیان لێ ون بووەو دۆش داماون.

شاعیر دەبێ ئاوێنەی ژیانی کۆمەڵ بێت و پێشڕەوی کۆمەڵانی خەڵك بکات و لەشادی و ناخۆشی کارەسات و مەرگەساتەکانیدا.

بەکورتی بەلای برایم ئەحمەدەوە شاعیرەکانمان ژەنگیان هەڵهێناوە بۆیە خۆیان ناخەنە بۆتەی ژیانەوەو هەستی بیرکردنەوەو لێکدانەوەیان نەماوەو دوای کڵاوی بابردوو کەوتوون و نازانن چی دەنووسن و هەروەك خەڵکی ئەم خاکە پیرۆزەو نەوەی ئەم میللەتە هەژارو کەساسە نەبن، چونکە پەی بەدەردو ئازارەکانیان نابەن و خەمخۆری خەڵك نین و ڕێنوێنی خەڵك ناکەن و بەچاك ناڵێن چاك و بەخراپیش ناڵێن خراپ و ئاگاداری باری ناوەوەو دەرەوەی کۆمەڵی کوردەواری نین.

ئەوان پەی نابەن بەوەی کۆمەڵگا هەڵگری هەگبەی ئاڵوگۆڕی هەڵچوون و داچوونە بەپێی گروپە مرۆییەکانی ناو ئەو پێکهاتەیەی کەتیایەتی.

سەرە تاي ايش هەمو يەكبونە ئەويش، نابي هەتا
هەر بريێ كەلە دلداهەيە ساريژي نەكەي

داشكري

# دياري لاوان

لاوان

نرخی « ٤٠ » فلسە

لەچاپخانەی بەغدا چاپ کرا
بەغدا
١٩٣٤

# (دیاری لاوان)

ئەم کۆمەڵە بەرهەمە لەلایەن لاوانی کوردەوە لە ساڵی ١٩٣٤ز لە بەغدا دەرچووە، لە چاپخانەی بەغدا چاپ کراوە، نرخەکەی ٤٠ فلس بووە، لە قەوارەی مام ناوەندی ژمارەی لاپەڕەکانی (١٠٢) لاپەڕە بووە، پێشەکییەکەی بەناوی لاوانەوە نووسراوە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

پێشکەوت.. ((ئەوا پشت بەگەورەیی خوداو یارمەتی هەندێ مەزنان و خاوەن بیرەوە توانیمان بەناوی (دیاری لاوان)ەوە دیاریەك پێشکەش بکەین.. ، هیوامان وایە کە ئەم تەرحە نووسینانە کەڵکیان هەبێ بۆ گەلەکەمان، چونکە بێجگە لەوە کە گەلێ پەند، ئامۆژگاری، شیعر، چیرۆك و قسەی بەفەڕیان تیایە بۆ پێشکەوتنی زمانەکەمان بەتایبەتی بۆ ڕێکخستن و جوانکردنی چەشنی نووسینی کوردی، هەنگاوێکە بۆ پێشەوە..))

لەو کۆمەڵە بەرهەمەدا، یەکەم وتار لەمەڕ وەلی دێوانەیەو لەژیان و شیعرەکانی دەدوێ، کە لەنووسینی (ر.ن)ە واتە: رشید نەجیبە.

دووەم وتار لەژێر سەردێڕی (دوای سەرخۆشی زۆر شێتییە).

هەروەها نووسینێکی حامید فەرەج و، وتارێکی (م.ج)= مەحمود جەودەت و، شیعرێکی (فایەق بێکەس) و شیعرێکی (گۆران)ە..

(ڕەشید نەجیب)یش وتارێکی بەنرخی لەسەر (زەردەشت و دینی زەردەشتی) نووسیوە.

لەو نامیلکەیەدا دوو شیعری تری گۆران بڵاوکراوەتەوە، کەلەژێر ناوی (ئافرەت و جوانی) و (گوڵی خوێناوی)دان.

هەروەها شاکیر فەتاح وتارێکی نووسیوە بەناوی (دانیشتن بەبێ کورسی)..

(شەوێکی گۆیژەش) وتارێکی حامید فەرەجە. کەواتە گۆران لەم نامیلکەیەدا چوار پارچە شیعرو دوو وتاری بلاوکراوەتەوەو ئاشکراو دیارە رۆڵی بەرچاوی تیا گێڕاوە، شیعرێکی تری گۆران (بەسەرهاتی ئەستێرەیەك)..

(ژینێکی بەرزو سکاڵای پیرەمێردێکی بەختیار) وتارێکی شاکیر فەتاحەو لەلاپەڕە (٧٩-٨٥) بلاوکراوەتەوە.

دووەم وتاری گۆران.. (لاواننەوە) بۆ برادەرێکی جوانەمەرگی بەناوی (ئەورەحمان ئەفەندی) کوڕی سەعید ئەفەندی وەسمان ئاغایە، کەواتە گۆڕین لای گۆران لە کێش و قافیەدا لە زمانی کوردی پەتیدا لێرەوە دەست پێ دەکات، ئەم پارچانە نموونەی تازەکردنەوەن لای گۆران.

(باوە یادگار) وتارێکی فازڵ تاڵەبانییە لەسەر عەشیرەتی کاکەیی.. دوا وتار شیعرێکی شێخ سەلامە لەژێر ناوی (شیوەنی بەکوڵ)، دیارە لەم بەرهەمەدا وتارو شیعری برایم ئەحمەد بەرچاو ناکەوێت و نازانین هۆیەکەی چییە؟

لەساڵی ١٩٣٢ ز برایم ئەحمەد خەریکی کاری سیاسی بووەو لەگەڵ گروپێکی تری لاواندا دەستی کردووە بە نووسین و دواتر بە خوێندنی یاساو شان بەشانی ئەوەش لە چالاکی سیاسی و بەشداری بزوتنەوەی کوردایەتیدا جموجوڵی باشی هەبووە.. وتارو شیعرو چیرۆکی وەرگێڕدراوی بۆ رۆژنامەی (ژیان) ناردووە..

ئەوەتا لەم بارەیەوە ڕۆژنامەی ناوبراو دان بەم ڕاستییەدا دەنێت و لە ژمارە ٨٤٠ی ئەیلوولی ١٩٤٦ز دا نووسیویەتی ((جار جار مەقالەی بۆ ژیان ئەنارد، ناوی خۆی نەئەنووسی و پێم ئەگوت (نقابداری سیاپۆش) .. (پیرەمێرد)..

وە لە ساڵی ١٩٣٥ز برایم ئەحمەد لەگەڵ کۆمەڵە لاوێکی کورد کە هەموویان خوێندکاری کۆلێجی یاسا (ماف) بوون، لەوانە شاکیر فەتاح و فازل تاڵەبانی و عارف تاڵەبانی و بەهادین عارف لەگەڵ عەبدولڕەحمان عەبدولا کە خوێندکاری کۆلێجی پزیشکی بوو لەگەڵ شێخ ڕەووف شێخ مەحموود. داوایان لە میری کردووە کە ڕێگایان پێ بدات یانەیەك بکەنەوە بەناوی (یانەی سمکۆی شکاك) بەڵام حکومەت ڕازی نەبووە لەسەر داواکەیان.[١٠]

[١٠] گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ ژمارە (١٤٣) ساڵی ١٩٩٩ز بەغدا.

کورد و عەرەب
نوسینی
ئیبراهیم ئەحمەد
مام جەلال
پێشەکی بۆ نوسیوە
وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە
پێبەر

# برایم ئەحمەدو نامیلکەی

## الاكراد والعرب

-أصدره فريق من شباب الكرد-

كتبه إبراهيم أحمد

ئەم كتێبەی برایم ئەحمەد لە زۆر ڕووەوە لە نا میلکەی (یادگاری لاوان)و (دیاری لاوان) دەچێت.

یەکەم- لە ڕووی قەوارەو بابەتەکانەوە.

دووەم- لەسەری نووسراوە: لەلایەن کۆمەڵە لاوێکی کوردەوە دەرکراوە.

سێیەم- لە پێشەکیەکەیدا نووسراوە پێشکەش کراوە بە:

*اهداء:*

*إلى أنصار الشعوب المستمرة في كفاحها التحرري.*

*إلى أعداء الحرب والاستعمار وأصدقاء السلم والديمقراطية.*

*إلى الساعين لإحلال التآخي بين الشعوب محل البغضاء والكراهية.*

*إلى أعوان الشعوب المستعبدة والطبقات المستغلة في الشرق والغرب.*

*إلى مؤيدي فكرة جبهة الشعوب الشرقية السائرة في طريق التحرر.*

*إلى السائرين في موكب الانسانية.*

*إلى الشعب العربي النبيل نقدم كراسنا هذه فريق من شباب الكرد*

*- بغداد ١٩٣٧م.*

پێشەکی ئەم نامیلکەیە (الاکراد والعرب) لە پێشەکی هەردوو نامیلکەی (یادگاری لاوان)و (دیاری لاوان) دەچێت و دەمانباتە سەر ئەو باوەڕەی کە لاوانی کورد ڕێکخستنی خۆیان هەبووە ئەگەرچی تا ئەو کاتە ناوێکیان بۆ ڕێکخراوەکەیان هەڵنەبژاردووەو یاخود ئاشکرایان نەکردووە.

ڕوون و ئاشکرایە لاوانی کورد چالاکی سیاسی و فیکری و ڕۆشنبیری و ئەدەبییان هەبووەو برایم ئەحمەد لە پێشەنگەکانیان بووە، هەر بۆیە دەبینین نامیلکەکەی بەناوی (لاوانی کورد)ەوە بلاو کردووەتەوە. ئەو نامیلکەیە لەو سەردەمەدا دەنگی داوەتەوەو ڕژێم زۆری پێ ناڕەحەت بووەو خۆی سەغلەت کردوە، عەرەبە ڕەگەزپەرستەکانیش پێی کەوتوونەتە پەلەقاژەو ڕژێمیان هانداوە نووسەرەکەی بدرێتە دادگاو سزا بدرێت..

بەڵێ هەرواش بوو، درایە دادگا، بەڵام چونکە نووسەر پیاوێکی یاسا ناس و شارەزاو سیاسی بوو، توانی خۆی دەرباز بکات و لە دادگا بەبێ تاوان دەربچێت. ئەوانەی لەدەوروبەری (بەکر سدقی)یش بوون پێیان ناخۆش بوو، ئەو نا میلکەیە دەرچووە، چونکە لایان وابوو کە ئەمە تۆمەتی کوردایەتی زیاتر ئەخاتە ئەستۆی بەکر سدقی[11].

یەکەم بابەتی نامیلکەکە، وتارێکە لەژێر ناوی (بين الأكراد والعرب سلام ووئام)[12] (ليس نقصد من كلمتنا هذه توضيح العلاقات التأريخية التي تربط الاكراد بالعرب، إن هذا يحتاج إلى بحث ودرس عميقين لا تتوفر لدينا وسائلها الآن، وأقل مبتغانا هو أن نرد على بعض ما بثه

---

[11] پرۆفیسۆر عزەدین مستەفا ڕەسوڵ لە برایم ئەحمەدی بیستووە.

[12] الأكراد والعرب- كتبه إبراهيم أحمد- الطبعة الثانية- مطبعة صلاح الدين- بغداد- ١٩٦١

المغرضون من الآراء المسمومة الخاطئة عن نوايا الأكراد وموقفهم من العرب بمناسبة قضية الاسكندرونة..)

وتارەکەی لاپەڕە (٧)یش (في نير العثمانيين) ئاماژە بە نامەی (أمير مصطفى فاضل) دەکات، کە نەوەی (محمد علی پاشا)یە بۆ سوڵتان عەبدولعەزیز لەبارەی دەوڵەتو ژیانی خەڵك دەدوێ لە نەهامەتیو کوێرەوەری لەژێر دەستی والییەکاندا، کە بەناوی سوڵتانەوە فەرمانڕەوایی دەکەنو زوڵمو ستەم لەخەڵك دەکەنو تیایدا دەڵێت:

(فأصبح عمالك غير مسؤولين أمام رعيتك واستباحوا لكل منكر وصار الناس طائفتين، حاكم يظلم ولا من يردع، ومحكوم يطلم ولا من شفيع، حاكم يدعي أن سلطانه من سلطانك لا حد ولا قيد..)

لەلاپەڕە (١٢-١٣)دا باسی شەڕی یەکەمی جیهانو شۆڕشەکانی کوردستان دەکات، کە لە (٢٨)ی یونیەی ساڵی ١٩٢٥ز لەلایەن عوسمانییەکانەوە (٤٥) سەرکردەی تێکۆشەری کورد لەسێدارە دراون.

لەلاپەڕە (١٥٥)یشدا لەژێر ناوی (أنين المظلوم وضجيج الظلم)دا باس لە ستەمو زۆرداری تورکە کەمالیستەکان دەکات، کە دەرهەق بەکوردو خەڵکی بێ دیفاعی کوردستان چەند زۆردار بوون. لەلاپەڕە (١٦)دا لەژێر ناوی (ثورة رجعية)وە وتارێکی نووسیوەو تیایدا بەتوندی بەرپەرچی پڕوپاگەندەی کەمالیستەکان دەداتەوە، کە شۆڕشەکانی کورد بەدیاردەی ئایینیو کۆنەپەرستیو دواکەوتنی کۆمەڵایەتی لەقەڵەم دەدەنو تاوانباری شۆڕشگێڕان دەکەن بەوەی گوایە دەیانەوێت خەلافەتی عوسمانی بگەڕێننەوە.

لەلاپەڕە (١٨)دا بەناوی (الاستعمار يحرر)ەوە وتارێکی نووسیوە.

لەلاپەڕە (٢٢)دا وتارێکی بەناوی (العرب يؤيدون الكرد) نووسیوە باسی پەیوەندی دۆستایەتی لەمێژینەی کوردو عەرەب دەکات و پشتگیری گەلی عەرەب بەرامبەر تێکۆشانی گەلی کورد لەدژی کەمالیستەکان لە ڕۆژنامە عەرەبییەکاندا دەکات، کە داوایان لە تورکیا کردووە بگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست و عەدالەت و چیتر تاوان دەرهەق بە کورد ئەنجام نەدات و ڕێگای ئاشتی و دایەلۆگ بگرێتە بەر. ئەمە بۆ کەسێکی (چەپ)ی ئەوسا نموونەی زرنگی و وریاییەو دیارە یەکەم کەسە ئەمەی بەبیرا هاتبێ باسی سەربەخۆیی و دایەلۆگی کردبێ.

لەلاپەڕە (٢٤)دا وتارێك بەناونیشانی (الأكراد يثورون مرة أخرى في سبيل الاستقلال) بەرچاو دەکەوێ، لێرەدا ئەوە نووسراوە گوایە (کۆلۆنێل لۆرانس)ی ئینگلیزی دەستی هەبووە لە هەڵگیرساندنی شۆڕشی ساڵی ١٩٢٥ز کەچی ڕاستییەکەی ئەمەیە:

(لۆرانس)= دکتۆر وایزلی ڕۆژنامەنووسی ئەڵمانی کە کۆمپانیایەکی ئەڵمانی ناردبووی بۆ ئەوەی دەنگوباسی شۆڕشی کورد بلاوبکاتەوە، هەروەکو خۆی لەگۆڤاری (الدنيا المصورة) ژمارە (١٣٩)دا دەڵێت:

لەلاپەڕ (٢٥)دا وتارێك نووسراوە لەژێر سەردێڕی (لا عداء بين الشعوب)دا. لەو ڕۆژەدا ئەم وتارە بایەخێکی زۆری هەبووە، بایەخەکەی لەوەدایە دەربارەی دۆستایەتی و برایەتی گەلانی دنیاو هاوکارییان لەدژی ئیمپریالیزم و دکتاتۆرە ملهوڕەکان و ڕزگاربوونی میللەتان لەهەژاری و چەوساندنەوەی نەتەوایەتی و چینایەتی دەدوێ.

لەلاپەڕە (٣٠)ی نامیلکەکەدا وتارێك لەژێر ناوی (التعصب القومي الأعمى) نووسراوە کەتیایدا هاتووە:

وقبل أن نبين القاعدة التي نقترحها لتكون أساساً لتعاون الشعبين الكردي والعربي، يجب أن نحذر الشعبين وخاصة المتنورين منهما عاقبة التعصب القومي الأعمى، نقول للمتنورين خاصةً لأن الجماهير كما أسلفنا لا تدرك من هذه الخيالات شيئاً. أجل فإن على المثقفين من كرد وعرب ليس تجنب التعصب القومي والعنصري الأعمى فقط، بل ومحاربة نظرياتها الهدامة التي يبثها المغرضون للتفريق مابين أبناء القطر الواحد، ومعاداة الشعوب الأخرى لا لأن هذه النظريات لا تقوم على أساس من العلم والعقل فحسب بل لأنها من الأسباب المهمة في بث روح الكراهية بين الشعوب واثارة الحروب والقلاقل فيما بينها .. الخ).

وفي الختام ندعو الشعبين العربي والكردي الى التعاون والتآخي والسير معاً في مقارعة الاستعمار والاستغلال فهما رفاق في طريقهما الى التحرر.

جێی خۆیەتی لێکۆڵینەوەیەکی وردو زانستی دەربارەی ئەم نامیلکەیە بکرێتو ناوەڕۆکەکەی بەتەواوی شیبکرێتەوە...

نوسەری ئەم کتێبە لەئەنجامدا دێتە سەر ئەو ڕاو باوەڕەی کەبیرو بۆچوونەکانی برایم ئەحمەد لەو سەرو بەندەدا هێزو بیرو بۆچوونێکی نیشتمان پەروەرانەو دژ بەفاشیزمو پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێڕانە بووەو بەدڵو دەروون دژ بەداگیرکەرو ئیمپریالیومو نۆکەرەکانیانو سیستەمی سەرمایەداری جیهانی بووە.هیواو ئامانجی لەنووسینی ئەو نامیلکەیەدا دروستکردنی پردی پتەوی نێوان دوو نەتەوەی کوردو عەرەب بووە. ئەو ویستوویەتی عەرەبە شۆڤێنیو ڕەگەز پەرستەکان هوشیار بکاتەوە،

کەنەتەوەی کورد دۆستو برای عەرەبەو هیچ ناکۆکیەك لەنیوان ئەم دو میللەتەدا نییە، ئیمپریالیزمو نۆکەرەکانیان دەیانەوێت ئەم دوو نەتەوەیە لەیەکتر دڕدۆنگ بکەنو- دووربخەنەوە - وای دەربخەن گوایە بەرژەوەندی هاوبەشیان نییە. بەڵام ئەم زۆر ژیرانە چۆتە ناو باسەکەوەو بەبەڵگە ئیسپاتی کردووە، کەبرایەتیو دۆستایەتی کوردو عەرەب بەردەوامەو پێویستە لەمەودواش هەر پارێزراو بێت. چەند نموونەی زیندووشی بەبەڵگە هێناوەتەوە وەك ئەوەی لەسەردەمی ئەتا تورك لەساڵی ۱۹۲۵ز کە ٤٥ سەرکردەی کورد لەسێدارە دران چۆن ڕۆشنبیرو ڕۆژنامە عەرەبییەکان لەمیسر هەڵیان دایەو داوایان لەتورکیا کرد ئەو شۆڕشگێڕانە لەسێدارە نەدات. بۆیە دەتوانین بڵێین ئەو بەرنامە داڕشتنەی لەو نامیلکەیەدا هاتووە بۆ پەیوەندی دۆستانەی دوو نەتەوەی کوردو عەرەب لەئەنجامدا بووە بەرنامەو ستراتیژی بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد، بەحوکمی ئەوەی لەناوەڕاستی چلەکانەوە برایم ئەحمەد بووە ڕابەرو ڕێکخەری پارتی دیموکراتی کوردستانو توانی ئەو بیروباوەڕەی لەنامیلکەکەیدا هاتبوو بکاتە بەرنامەی بزووتنەوەی کوردایەتیو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لەدەوری کۆبوونەوەو پەسەندیان کرد.

هەر ئەو بەرنامەیە کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر ڕۆشنبیرە عەرەبە پێشکەوتنخوازەکان، کەبەچاوی ڕێزەوە سەیری بزووتنەوەی کوردایەتیو بەرنامە پەسەندکراوەکەی بکەن. ئاکامو ئەنجامی ئەو کارەش ئەوەیە، ئەمڕۆ دەبینین کەلەزۆربەی کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی عەرەبیو تەلەفزیۆنەکانی جەزیرەو ANN و ڕۆژنامە پێشکەتوخوازەکانو هەندێ سیاسەتمەداری عەرەب پشتگیری لەکوردایەتی دەکەن بەتایبەتی دوای ئەنفالو کیمیا بارانی هەڵەبجەو دەستگیرکردنی (عەبدوڵڵا ئوچ ئالان).

نەتــەوەی عــەرەب بەگشــتی و سیاســەتمەدارو چــەپڕەوەکان بەتایبــەتی هەڵوێستی زۆر چاك و باشیان هەبوو. ئەم هەوڵوێستەی عەرەب ئێمە پێمان وایە لەئەنجامی ئــەو برایــەتی و هاوسـۆزیەوە سـەری هـەڵداوەو هـەڵقوڵاوە کـەکورد دڵسـۆزانەو خەمخۆرانـە بەرامبـەر نەتــەوەی عـەرەب و بزوتنــەوەی ڕزگاریخوازی فەلەستین نواندوویەتی.

ئێمە وای تێ دەگەین، ئـەم هاوبەشـی و هاوسۆزیەی نێوان کورد و عـەرەب (برایم ئـەحمـەد) ڕۆڵـی گرنگی تیا بینیوە، بەتایبـەت بەهۆی ئـەوەی مـاوەی (١٥) ساڵ سکرتێری گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان بـووەو داڕێـژەری بەرنامەی کوردایەتی بووە.

کوردیش بۆخۆی میللەتێکی ئـەمین و بێ وەیـەو هەمیشـە ئاوەزو لۆژیکـی (عقـڵ)ی بـەکارهێناوە بـۆ مامەڵــەکردن لەگـەڵ دەرودراوسـێکانا و توانسـت و دەسەڵاتی خۆی و دەروبەری لێکداوەتەوە.

ئیــتر دوای ئــەوەی (برایــم ئەحمــەد) درایــە دادگــا لەســەر نوســین و بڵاوکردنەوەی ئەونامیلکەیە- الأکراد والعرب-، لەدادگا وەك پارێزەرێکی ووشیارو کارامەو زرەنگ و زیرەك، توانی داکۆکی و بەرگری لەخۆی بکات و کرۆك و ناوەڕۆکی نامیلکەکەی بـۆ ئـەندامانی دادگـا شـیبکاتەوەو ڕاسـتی بۆچوونـەکانی خـۆی بـەدادگا بسـەلمێنێ لەئـەنجامدا خـۆی و بەرهەمەکـەی ئـازادکران و بەسـەرورەری و سـەرفرازی هاتــەوە مـەیدان و گۆڕەپـانی پـان و بـەرینی سیاسـی و ئـەدەبی. وەك پـارێزەرێکی زیـرەك و لێـهاتوو گەڕایــەوە سـلێمانی و لــەکاری پــارێزەریدا نــاوو ناوبــانگی پــتر دەرکــرد... وەك تێکۆشـەرێکی زانـا و بوێـرو کۆڵنــەدەر لــەپێناو ئامانجــەکانی گەلەکــەی لـەجموجوڵدا بـوە ئینجـا بـۆ ئـەو بیرۆکـەیـەی پێشـتر لەمێشـکی دا بـوو بـۆ دەرهێنـانی گۆڤـارێکی کـوردی بـەردەوام خـەریکی پـەیوەندیکردن بــوو

بەرۆشنبیران و شاعیران و نوسەرانی ئەوکاتەوە و هەموو بەڵێن و پەیمانیان پێدا کەهاوکاری بکەن، بێتو ئەو بتوانێ ئیجازەی دەرهێنانی گۆڤارەکە وەربگرێت.

بەلام دوای هەوڵ و ماندوو بوونێکی یەکجار زۆرو تەگەرەو لەمپەرخستنەپێش دەرچواندنی لەلایەن پارێزگاری سلێمانی و دەزگا ئەمنیەکانی تری ڕژێمەوە کارەکەی هەندێ دواکەوت، بەلام لەئاکامدا دوای کۆڵ نەدان ئەوبوو لەکانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٣٩ز توانی یەکەم ژمارەی گۆڤاری (گەلاوێژ) دەربکات و بلاوبکاتەوە، لەماوەی دە ساڵدا واتە- تامانگی ئابی ١٩٤٩ز گۆڤاری گەلاوێژ (١١٦) ژمارەی لێدەرچوو.

(گەلاوێژ) بوارو دەرەتانی باشی لەبەردەم نوسەران و شاعیران و هونەرمەندان ڕەخساند. ڕێنووس و داڕشتنی زمانی کوردی لەو سەردەمەداو بەتایبەت بەکاریگەری (گەلاوێژ) زۆر گەشەی کردو پێشکەوت.

لەو گۆڤارەدا برایم ئەحمەد دەیان بەرهەمی خۆی تیا بلاوکردۆتەوە لەژێر ناوی خوازیارەوە. وەك (بلە،ب.ھ.ل.، ھ.ل.ب، أن، و سیاپۆش، هیتد...) لەساڵی ١٩٤٩ز دەگیرێ و دەدرێتە دادگای عورفی و ساڵ و نیوێك حوکم دەدرێت... ڕەوانەی بەندیخانەی بەغدا دەکرێت و گۆڤاری (گەلاوێژ)یش بۆ یەکجاری دادەخرێت و دەنگی ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد کپ دەکرێت، لەمەوقوف خانەی ئەبوغرێب شیعرە بەناوبانگەکەی (دواتیری کەوان) دەنوسێت.

- دوا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن
- دوا سەرکەوتنی تۆیەو دوا نوچی گەلە دوژمن

غەفوری میرزا کەریم لەبیرەوەری‌یەکانیدا دەنوسێت:

(حەسەن تاڵەبانی موتەسەریفی سلێمانی و حامد فرج بەگ معاونی پۆلیس بوو لە ١٩٤٧/٦/١٨ز ئاگادارکراین کەچوار ئەفسەرەکە (عیزەت عەبدول عەزین)، (خەیروڵا عەبدول کەریم)، (موستەفا خۆشناو)، (محەمەد قودسی) بەیانی لەبەغدا لەسێداره دەدرێن، ئێمەش وەفدێکمان پێکهێنا لەبەرێزان... (ئەحمەد شاڵی)و (محرم حمە ئەمین)و (مستەفا محمد)و (رەئوف معروف)و (حەمەی بکر)و خۆم داوامان لە موتەسەریف کرد دەنگمان بگەیەنێتە بەغداو داوا لەوەزارەتی ناوخۆ بکات ئەو چوار ئەفسەرە عەفو بکرێن و ئیعدام نەکرێن. بەڵام رژێم هەرلەسەر بڕیاری خۆی سوور بوو.

ڕۆژی ١٩٤٧/٦/١٩ز تەرمی مستەفا خۆشناوو موحەمەد قودسی هاتەوە سلێمانی و پەیوەندیمان بە (هاورێ فەهد) کرد گوتی لافیتەیەك بنووسن بەم شێوەیە:

(ئیستعمار بەرپرسیارە لەئیعدام کردنی ئەم ئەفسەرانە). دوای نیوەڕۆ تەرمەکانیان لەمزگەوتی گەورەوە بۆ ماڵی موحەمەد قودسی و دواتر بۆلای ماڵی (وەستا فەرەج) خەزوری مستەفا خۆشناو لەوێشەوە بۆ گردی سەیوان.

زۆر سەیر بوو کەدەستمان کرد بەرێپێوان برایم ئەحمەد پەلاماری دروشمەکەی داین و دژی وەستا. قادری نوری بەگ هاتە بەردەمی و ڕێی پێ‌گرت کەواز بێنێ چونکە برایم ئەحمەد ئەوکاتە نەلەڕیزی پارتی و نەلەدەستەی دامەزرێنەری بوو، بەڵکو لێپرسراوی لقی (ژ.ك) بوو لەسلێمانی، بۆیە زۆر بەسەرسامی‌یەوە ئەمانڕوانی‌یە ئەو هەڵوێستەی. پاش ئەوەش تێ‌نەگەیشتین بۆچی برایم ئەحمەد خۆی کردبوو بەکەوڵ سوورو میرات گری تەرمەکان؟!.

نازانین بەڕێز برایم ئەحمەد بۆ دژی ڕێپێوان و لافیتەکە بوو؟! خۆزگە ئەوگرێ کوێرەیەی بۆ ئەکردینەوەو بیرو بۆچوونی خۆی بەڕاستی ئەنووسی. چونکە سەرەڕای ئەوەی پارێزەرێکی دانا و ناسراو لەڕیزی ڕۆشنبیرانیشدا بەنووسەرو شاعیرێکی هەڵکەوتوو ناوی دەرکردووە..

بریا هەر لەسەر ئەو ڕێبازە هەنگاوی ئەنائەوسا خەرمانێکی فرە زەبەندی بۆ دەهێنایە بەرهەم.[13]

ساڵی ١٩٥١ز کەلە زیندان ئازاد دەکرێت دوای تەواوبوونی حوکمەکە لە کۆنفرانسی پارتیدا بەسکرتێری گشتی هەڵدەبژێردرێت و خەریکی کاری حزبایەتی و پارێزەری دەبێت و زۆر بەرگری و داکۆکی لە داخوازییەکانی جوتیاران دەکات لەدژی دەرەبەگەکانی کوردستان، بۆیە لەساڵی ١٩٥٤ز لەلایەن دەرەبەگەکانەوە هەوڵی تیرۆرکردنی دەدرێت و بەخەستی برینـدار دەکرێت. لەساڵی ١٩٥٦زیشدا ڕۆمانی (ژانی گەل)ی هێنایە بەرهەم، ئەم ڕۆمانە دوای (١٧) ساڵ ئینجا بڵاوکرایەوە- واتە ساڵی ١٩٧٣-. لە ساڵی ١٩٥٩ز ئیمتیازی ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی بەزمانی کوردی و عەرەبی وەرگرت، بەناوی (خەبات)ەوە کەهەر خۆیشی خاوەنی ئیمتیازو سەرنووسەری بوو. بەم چەشنەی خوارەوە (خەبات- النضال): جريدة يومية سياسية, صاحب

---

[13] غەفوری میرزا کەریم، کێومالی بەنێو بیرەوەرییەکانمدا- سلێمانی، نەورۆزی ٢٠٠٠- چاپخانەی هەمیشە- ل٤٠.

تێبینی:

١- ساڵی ١٩٤٧ز کۆمەڵەی (ژ.ك) نەمابوو، حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران دامەزرابوو- نووسەر.

٢- بەلای منەوە برایم ئەحمەد دژی ڕێپێوانەکە نەبووە، بەڵکو دژی لافیتەکە بووە- نووسەر.

الامتياز ورئيس التحرير ابراهيم أحمد المحامي- بغداد- شارع المتنبي).

یەکەم ژمارەی ئەم ڕۆژنامەیە لە ١٩٥٩/٤/٤ز بەزمانی کوردی لەبەغدا دەرچوو. (٥) ژمارەی سەرەتایی بەکوردی دەرچوو... پاشان ژمارە (٦-٧)ی بەعەرەبی و ژمارە (١٠)یشی ڕۆژی شەممە ڕێکەوتی ٦ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٩ز بەقەوارەی هەشت لاپەڕە هەربەزمانی عەرەبی دەرچوو.

بۆیە دەکرا ڕۆژنامەکە بەزمانی عەرەبی دەرچێ، تابتوانێ کێشەو داخوازیەکانی میللەتی کورد لەحکومەتی عێراق و میللەتی عەرەبی ڕابگەیەنێت، چونکە لەو سەردەمەدا گیانی شۆڤێنی لەعێراق پەرەی سەندبوو داوای تواندنەوەی کورد دەکرا لەبۆتەی عەرەبیداو بەڕاستی (خەبات) ڕۆڵی باشی گێڕا لەڕوونکردنەوەی کێشەی کورد و داخوازییە ڕەواکانی و ڕیسواکردنی عەرەبە شۆڤێنی و کۆنەپەرستەکاندا... تا (٢٨)ی مارتی ١٩٦١ز (٤٦٢) ژمارە لەڕۆژنامەی خەبات بڵاوکرایەوە. لەساڵی ١٩٦١ز ڕۆژنامەکە داخراو برایم ئەحمەدیش فەرمانی گرتنی دەرچوو لەلایەن میرییەوە، بەتۆمەتی کوشتنی (صديق ميران) لەشەقڵاوە، بۆیە ناچار برایم ئەحمەد خۆی شاردەوەو خۆی نەدا بەدەستەوە، چونکە سەرکردەکانی پارتی زۆربەیان فەرمانی گرتنیان دەرچووبوو، و هەندێکیان کەوتنە دەست حکومەت و زیندانی کران.

# برایم ئەحمەدو خەباتی سیاسی[14]

هەروەکو لەپێشەوە ڕوونمان کردەوە برایم ئەحمەد هەرلەسەرەتای گەنجیەوە هەڵوادەو عەودالی، جۆش و پەرشی سیاسەت و کوردایەتی بوو، کەچووە بەغدا لەگەڵ لاوان و خوێندکارن خەریکی خۆڕێکخستن و کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارو گەشت و وتارو شیعر نووسین و گۆڤار دەرکردن بوو.

برایم ئەحمەد پیاوێکی چەپڕەوو شۆڕشگێر بوو. لەبەندیخانەی ئەبوغرێب و بەغدا هاوڕێیەتی و پەیوەندی لەگەڵ شیوعی‌یەکان پەیدا کردو شارەزای یەکی باشی لەبیروباوەڕی (مارکس و لینین)دا بەدەستهێنا و بەئیعجابەوە باسی نامیلکەی (چەپڕەوی کۆمۆنیزم و سەرلێشێوانی زارۆکانەی) دەکرد.

لەسەروبەندی چلەکانی سەدەی ڕابردوودا واتە- ڕێک ١٦ی ئەیلولی ١٩٤٢ز کۆمەڵەی (ژ.ک)ی لەمهاباد دروست بوو لەکۆمەڵە لاوێکی خوێن گەرم، لەهەموو توێژەکانی کۆمەڵ. بەپێی قسەکانی (ئیگلتن) کۆمەڵە زۆر گەشەی کرد بەتایبەتی لەساڵی ١٩٤٤ز تاگەیشتە میاندواوو سنوری ڕوسیا، خێڵ و عەشیرەتەکانی ئێلخانی و نەغەدەو زەرزە لەشنۆو شێخەکانی هەرکی هەموو پەیوەندیان بەکۆمەڵەوە کرد.

لەمانگی ئابی ساڵی ١٩٤٤ز برایم ئەحمەد خەریکی ئەوقاتی بووە، ڕۆژێك (ئیسماعیل حەقی شاوەیس)[15] لەگەڵ (عوسمان دانش)[16] دێتەلای برایم

---

[14] کوردستانی نوێ ژمارە ٢١١٨، چوار شەممە ٢٠٠٠/٤/١٢، لاپەڕە (٢،١).

ئەحمــەدو باســی ڕووداوەکــانی کوردســتانی ڕۆژهــەڵاتی بۆدەکــەن و داوای لێدەکــەن بەشــداریان بکــات لەدامەزراندنیکۆمەڵــەی (ژ.ك) کــەوا لەمــهاباد دامەزراوەو نامەیەکی دەدەنێ لەسەرکردایەتی کۆمەڵەوە لەمهابادەوە بۆی هــاتووە. بۆ ئەو مەبەستە برایــم ئەحمــەدیش ڕازی دەبێــت بچێتــە نــاو ئــەو ڕێکخــراوەوە، بــۆ ئــەو مەبەســتە (١٥) کــەس لــەماڵی (ئیســماعیل حــەقی) کۆدەبنەوە لەوانە: (سدیق شــاوەیس، فایــەق بێکــەس، خــاتو بــەهێ مــارف، حەمە عەلی مەدهۆشی بــەرگدروو- شــاعیر، عــەزیز مــیرزا ســالح و).. چــەند کەسێکی تر.

بڕیاری دامەزراندنی لقی سلێمانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد دەدەن. [17]

لــە ١٦ ی ئابی ســاڵی ١٩٤٥ کۆمەڵــە بــوو بــەحیزبی دیموکراتــی کوردســتان. بەپێی بارودۆخی ئەو سەردەمە ئامانجەکانی بەکۆمەڵانی خەڵکی کوردستان زیاتر ئاشنا و ئاشکرابوو (قازی محمد)یش بوو بەسەرۆکی حــیزب برایــم ئەحمــەد پــەیوەندی لەگــەڵ کۆمەڵــەو قــازی محمــد بــەهێز بــوو. لەســلێمانی سەرکردایەتی ڕێکخستنی کۆمەڵەی (ژ.ك)ی دەکردو لەکەرکووکیش لقێکی کردبووە.

کــاتێ کۆمەڵــە بــوو بــە حــیزبی دیموکــرات برایــم ئەحمــەد لــە کوردســتانی عێراق لێپرسراوی بوو وە پــەیوەندی لەگــەڵ قازی محمــد بــەهێز و پتــەو بــوو بەبەردەوامی نوسراوو نامە گۆڕینەوە لە نێوانیاندا هــەبوو. قــازی بــە برایــم

---

[15] (ئیسماعیل حەقی) کۆنــە ئەفســەرێکی دەوڵەتی عوسمانی بــووە لــە ســەردەمی حکومــەتی شێخ مەحموودو حکومەتی عێراقیش هەر ئەفسەر بوو، کوردێکی چالاك و چاك بوو.

[16] (عوسمان دانش) لاوێکی چالاك و دڵسۆز بوو.

[17] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ – ژمارە (٢١٢٧)، لە ٢٠٠٠/٤/٢٣، ل٩.

ئەحمەدی دەگوت (بیلە) واتە بیلبیلەی چاوان ، چونکە زۆری خۆش دەویست لەگەڵ ئەوەشدا ، کەنەیدیبوو. لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦دا پارتی دیموکراتی کورد لە عێراق دامەزرا بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی و بە نوێنەرایەتی هەمزە عەبدوڵا . برایم ئە حمەد هەرچەندە بۆ کۆنگرەی دامەزراندنی پارتی بانگ کرابوو ، بەڵام ڕازی نەبووبچێتە ناو پارتی یەوە بەبێ ڕەزامەندی حیزبی دیموکراتی کوردستان و قازی محمد . بۆیە ڕێکخستنەکانی خۆیان لە سلێمانی و کەرکوك وەکو خۆی مانەوە تا کۆماری کوردستان لە مهاباد دامەزرا و دواتر تێکچوو ئینجا لە ساڵی ١٩٤٩ز لەگەڵ پارتی دیموکراتی کورد یەکیان گرت و تێکەڵ بە یەك بوون .

لە کۆنگرەی دووەمی پارتی کەلەبەغدا لەماڵی شەهید عەلی حەمدی بەرواری بەسترا لەساڵی ١٩٥١ز برایم ئەحمەد بەسکرتێری گشتی پارتی هەڵبژێردراو ناوی پارتیش گۆڕا بۆ (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق) لەسەر پێشنیاری برایم ئەحمەد.[١٨]

لە هاوینی ساڵی ١٩٥١ز برایم ئەحمەد نەفی کرا لەسلێمانی یەوە بۆ کەرکوك. لەکەرکوك بەیارمەتی شەهید عەلی حەمدیو میرزا عبدالکریم توانی دەزگای چاپەمەنی پارتی دابمەزرێنێو گۆڤاری (ڕزگاری) بەزمانی کوردی دەربکات کەگۆڤارێکی چەپی پێشکەوتنخواز بوو. لەماوەی کەمتر لەدوو ساڵ توانی پارتی بەرەو کرێکاران و جوتیاران و ڕەنجدەران ڕێنوێنی بکاو پرۆژەی پرۆگرامو پەیرەوێکی نوێی چەپرەوی شۆڕشگێر گەڵاڵە بکات بۆ کۆنگرێسی سێهەمی پارتی لەکەرکوك لەکانوونی دووەمی ساڵی ١٩٥٣ز.

---

[١٨] الجمعيات والمنظمات والأحزاب الكردية في نصف قرن، ١٩٠٨-١٩٥٨، عبدالستار طاهر شريف، ص١٧٠.

بەو شێوەیە برایم ئەحمەد توانی پارتی بەتەواوی بگۆڕیگۆڕینێکی نەوعی لەچەندایەتی و چۆنایەتی یەوە. پارتیەکی پێشڕەوی شۆڕشگێر کەڵك لەمارکسیەت وەردەگرێت و بووە حزبی کرێکاران و جوتیاران و ڕەنجەدەرانی بیرو بازوی کاسبکارانی کوردستان. دروشمی مافی چارەی خۆنووسین و جمهوری دیموکراتی گەلی عێراق و کوردستانی پێهەڵگرت و داوای لەریشە هەڵکەندنی دەرەبەگایەتی و دابەشکردنی زەوی و چاکردنی کشتوکاڵ بوو. مەبەستی برایم ئەحمەد لەو دروشمانە خزمەتی چینی چەوساوەی کوردستان و ڕێگرتن بوو لەڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراق لەگۆڕەپانی کوردستان...

هەرلەو کۆنگرەیەدا لەسەرپیشنیاری برایم ئەحمەد بڕیاردرا ڕێکخراوەکانی یەکێتی قوتابیان و لاوان و ئافرەتانی کوردستان پێك بێت...

لەهەمان ساڵدا پارتی پەیوەندی لەگەڵ حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و شەهید عبدالرحمن قاسملۆ بەست. لەساڵی ١٩٥٤ز بەپیلان و کەین وبەین و هاندانی دەرەبەگەکان برایم ئەحمەد بەخەستی برینداركرا، چونکە وەك پارێزەرێکی هۆشیارو ناسراو لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا بەرگری لەمافی جوتیاران دەکرد...

هەرلەسەروبەندی (١٩٥٣- ١٩٥٤)دا برایم ئەحمەد پەیوەندی بەهێزی هەبوو لەگەڵ (کامل جادرچی و عزیز شریف و هەندێ گروپ و ئەفرادی مارکسی)، وەك (نەژاد ئەحمەد عزیز ؛ خەسرەو تۆفیق؛ ساڵح دیلان؛ کاکەی فەلاح)؛ کەبەهۆی ئەوانەوە توانی پەیوەندی لەگەڵ سکرتێری حزبی شیوعی عێراقی ئەوسا (حەمید عوسمان) [١٩] پەیدا بکات.

---

[١٩] کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢٠، شەممە ٢٠٠٠/٤/١٥، ل١.

هەوڵی ئەوەی دا هەردوو باڵی حزبی شیوعی (القاعدة و راية الشـــغيلة) بگەیەنێتە یەك. برایم ئەحمەد بزوتنەوەی شیوعی بەدۆستێکی گەورەی گەلی کورد دەزانی.

بەهـــەوڵ و کۆششـــی برایـــم ئەحمـــەدو لـــەماڵی هـــەڤاڵێکی پـــارتی و بەئامادەبوونی (مام جەلال و حەبیب محمد کریم) توانرا هەرسێ باڵەکـەی حیزبی شیوعی عێراق کۆبوونەوەی یەکبوون سازبکرێت (وحدة الشيوعيين, القاعدة, راية الشغيلة). بەئامادەبوونی سەلام عادل لەلایەن حیزبی شیوعی؛ حەمزە سلێمان. لەلایەن راية الشـغيلة؛ عبدالرحیم شریف لەلایەن وحـــدة الشيوعيين.

بەم شێوەیە دەبینین پەیوەندی برایم ئەحمەد لەگەڵ حیزبی شیوعی زۆر باش بوو؛ کار گەیشتە ئەوەی چەندین کۆبوونەوە بکرێت بۆ ئەوەی هەردوو حیزب تێکەڵاو بەیەکتری بن و یەك بگرن بەڵام دوایی سەری نەگرت و هەندێ جاریش گرژی دەکەوتە نێوانیان. برایم ئەحمەد هەرلەسەرەتاوە هەوڵی‌دابوو پـــەیوەندی لەگـــەڵ حیزبـــە عەرەبیـــە عێراقیـــەکان بـــاش بێـــت و لەنزیکـــەوە بەکێشـــەو مافـــەکانی گـــەلی کـــورد ئاشـــنایان بکـــات. بـــۆ ئـــەو مەبەســتە جگـــە لـــە(کـامل جـادرچی) پـــەیوەندی باشـــی لەگـــەڵ (ســدیق شەنشـــەل) و (فـــائق ســامرائی) و دواتـر لەگـەڵ سـەرۆك (جمـال عبدالنـاصر) پـەیداکردبوو. حزبـە عەرەبیە عێراقیەکان رێزی زۆریان بۆ برایم ئەحمەد هەبوو...

لەوانە حزبی (الاستقلال الوطني الديمقراطي) و تا(حزبی بەعسیش).[٢٠] میشیل عفلق و فوئاد الرکـابی، کـە سـکرتێری حزبـی بـەعس بـوو بـەهۆی سیاسـەتمەدارانی عەرەبەوە ساڵی(١٩٥٧ز) هـەوڵ و کۆششـێکی زۆر درا بـۆ

---

[٢٠] کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢١، شەممە ٢٠٠/٤/١٦، ل١.

چوونە قاهیرەی برایم ئەحمەدو دیدار لەگەڵ (جمال عبدالناصر)، بەڵام پاسپۆرتی بۆ جێبەجێ نەکرا. لەساڵی ١٩٥٨ز دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ برایم ئەحمەد سەردانی سەرۆك (جمال عبدالناصر)ی کردو داخوازیو کێشەکانی گەلی کوردی بۆ سەرۆك ناصر ڕوون کردەوەو ناصری بەکێشەی کورد ئاشنا کردو داوای لێکرد بارزانی بەمیسردا بگەڕێتەوەو چاوی پێبکەوێت و هاوکاریو هاودەردی لەنێوان بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردو بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی عەرەب دروست بێت لەسەر بناغەی برایەتی و وەك یەکی[21]. دوای شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ لە ٢٧ی مانگی گەلاوێژ وەفدی زۆربەی شارەکانی کوردستان چوونەبەغداد بەسەرۆکایەتی برایم ئەحمەد چوونە بەردەرگای وەزارەتی بەرگری بۆ پیرۆزبایی لێکردنی مەجلیسی سیادەی تەموزو ئەندامانی مەجلیسی سیادەو ژەنەراڵ عەبدولکەریم قاسمو وەزیرەکان ئامادەبوون، برایم ئەحمەد بەناوی وەفدی کوردستانەوە وتارێکی بەپێزی خوێندەوە پیرۆزبایی لەسەرکردایەتی شۆڕش کردو باسی چۆنیەتی داگیرکردنو دابەش کردنی کوردستانی کرد لەدوای شەڕی جیهانی یەکەمو کوردستان (ویلایەتی موصل) خرایە سەرعێراق بەمەرجەکانی پاراستنی مافەکانی کوردو باسی ئەو زوڵمو زۆرەی کرد کەبەدرێژایی مێژوو لەگەڵ کورد کراوە، هەروەها باسی خەبات و تێکۆشانو ڕاپەڕینو شۆڕشەکانی کوردی کرد لەپێناو ئازادیو سەرەبخۆیی خاکی کوردستان[23]. هەروەها باسی برایەتی لەمێژینەی گەلی کوردو گەلی عەرەبو داوای دیموکراسیو چەسپاندنی مافەکانی گەلی کوردی کرد.

---

[21] کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢٠، شەممە ٢٠٠/٤/١٥، ل١.

[23] کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢٣، شەممە ٢٠٠/٤/١٨، ل١.

بەهەوڵ و کۆششی برایم ئەحمەد ڕۆژنامەی (خەبات) و پارتی بوونە خاوەن چاپخانەو لەو ڕۆژنامەیەدا جگە لەبرایم ئەحمەد، (جەلال تاڵەبانی) و عبدولرەحمان زەبیحی) و (د. سەید عەزیزی شەمزینی) و (حلمی عەلی شەریف) نوسەری هەمیشەیی ڕۆژنامەکە بوون.

جارێکیان لەسەر وتارێك دەربارەی مادە (٣)ی دەستوری کاتی عێراق برایم ئەحمەد درایە دادگای عورفی، برایم ئەحمەد دلێرانەو نەبەزانە بەرگری و داکۆکی لەخۆی و ڕۆژنامەکە کرد...

جگە لەوەش دەیان پارێزەری کوردو عەرەب چوونەدادگا و بەرگریان لەبرایم ئەحمەد کردو دادگا ناچار ئازادی کرد.

لەسەرەتاوە برایم ئەحمەد لەسەرپەرشتی کردنی ڕۆژنامەکە دوورخرایەوەو جڵەوی کەوتە دەست باڵی هەمزە عەبدوڵلاو حەمید عوسمان و ساڵح حیدری. ئەوانە ویستیان ڕۆژنامەکە بەرێڕەوێکدا بەرن کەلەخزمەت حزبی شیوعیدابێت، بەلام دواتر بەفەرمانی سەرۆکی حزب مستەفا بارزانی ئەو باڵەی مەکتەبی سیاسی دوورخرانەوە لەحزب و لەڕۆژنامەکە، برایم ئەحمەد گەڕایەوە جێگەی خۆی وەکو سکرتێری گشتی پارتی و سەرنوسەری ڕۆژنامەی خەبات و ڕۆژنامەکە بەوتاری تێروتەسەل و چالاکانە کەوتە خۆ تائەو ڕۆژەی داخرا.

# ناکۆکی نێوان مەکتەبی سیاسی و مەلا مستەفای بارزانی ساڵی ١٩٦٤ز

دوای بەرپابوونی شۆڕی ١٤ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٥٨ز مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و سەرکردایەتی پارتی دووبەرەکی کەوتە بەێنیانەوە.......

لەناویاندا دوو بیروبۆچوونی جیاواز سەری‌هەڵدا دەربارەی زۆربەی کێشە سیاسیەکانی ئەوسەردەمە، بەتایبەتی هەڵوێست لەحزبی شیوعی عێراقی، لە عەبدولکەریم قاسم، لەپارتە عەرەبیە ناسیۆنالیستکان، لەمەلا مستەفا بارزانی..

سکرتێری مەکتەبی سیاسی (هەمزە عبدالله) لەگەڵ هەندێك لەئەندامانی مەکتەب و سەرکردایەتی (حەمید عوسمان، سالح حیدری، خەسرەو تۆفیق، نەژاد ئەحمەد ئاغا، ساڵح ڕوشدی)، کەزۆربەیان کۆنە شیوعی بوون و هاتبوونە ناو پارتی، لەگەڵ حزبی شیوعی ژێربەژێر ڕێکەوتبوون پارتی بکەنە دەسکەلای حزبی شیوعی، ماك و مۆرکی بۆرژوازی نەتەوە پەرست بەپارتیەوە بسوون و بەنوێنەری ئاغا و دەرەبەگ و سەرمایەداری کوردی ناوزەد بکەن و حزبی شیوعی بەنوێنەرو ڕابەری چینی چەوساوەی عێراقی بەکوردو عەرەبەوە بەبالاّیدا بکەن.

وەئامادەبوون بۆ ئاسانکاری جێبەجێکردنی بەرنامەکانی حزبی ناوبراو..... (عبدالکریم قاسم)یان بەرابەری بێهاوتا دادەنا دروشمی

ڕۆژانەیان (ماكو زعيم الا كريم. عاش الزعيم الأوحد عبدالكريم قاسم) برایم ئەحمەد بەتووندی لەدژی ئەو هەڵوێستە ڕاوەستا.

نوری شاوەیس و عەلی عەبدوڵلاو عومەر موستەفاو جەلال تاڵەبانی و نوری ئەحمەدی تاهاو مەلا عبدوڵلا ئیسماعیل و جەلال عبودلڕەحمان پشتگیریان لەبرایم ئەحمەد دەکرد.

برایم ئەحمەدو هاوڕێکانی پارتیان بەپارتێکی شۆڕشگێرو نیشتمان پەروەرو نوێنەری چینی چەوساوەی کوردستان دادەناو بوونی حزبی شیوعی لەکوردستان بەنامۆو زیاد دەزانی.

بەلای ئەمانەوە مەلا مستەفا ڕابەری بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستانەو عبدالکریم قاسم ئەفسەرێکی عێراقی نیشتمان پەروەرو شۆڕشگێڕە، شۆڕشێکی نیشتمانی بەرپاکردووە جێگای ڕێزلێنانە،

بەڵام دەبێ گەلی عێراق ئاگاداری خۆی بێت قاسم بەرەو تاکڕەوی و دیکتاتۆریەت نەڕوات، وەحزبی شیوعی لەڕێبازی خۆی لایداوە. لەخۆبایی بووە، خۆی بزر کردووە...

ئەو سەردەمە ئێمە کادری ناوەندی (وسط)ی پارتی بووین هەر ڕۆژە لێپرسراوێك دەهات کۆبوونەوەی لەگەڵ دەکردین لەچایخانەکەی خاڵە سەید مەجید لەهەولێر کەئەوسا بەناو بارەگای خەباتیش بوو چونکە، پارتی بارەگای نەبوو مۆڵەتی یاسایی کاکرکردنی پێنەدرابوو.

ئەندامانی پارتی لەئەنجامی ئەوململانێیەدا تووشی گێژاوی فیکری هاتبوون. بۆیە لەهەموو شارەکان نوێنەریان ناردە لای سەرۆکی پارتی بۆ چارەسەرکردنی ئەو بارە نالەبارەی پارتی تێکەوتبوو. حزبی شیوعی پاوانی گۆڕەپانی سیاسی کردبوو، بەتووندی بەربەرەکانی پارتی دەکردو

خۆی بەخاوەنی شۆڕشی گەلاوێژ دادەنا. پاڵەپەستۆی خستبووە سەر پارتی و پڕوپاگەندی ناڕەواو ناڕاستی لەدژی بڵاودەکردەوە.

دروشمی سەیروسەمەرەی بەرزدەکردەوە. حسابی بۆهیچ کەس و لایەنێکی سیاسی نەدەکردو حزبەکان لێیان دڵگیر بوون.

گروپەکەی (همزة عبدالله) (برایم ئەحمەد) یان لەمەکتەبی سیاسی دوور خستەوەو دەستیان بەسەر ڕۆژنامەی خەباتدا گرت و مام جەلالیان تەجمید کرد.

ئەندامانی پارتی لەهەموو ناوچەکان داوای بەستنی کۆنگرەیاندەکرد.

بارزانی داوای لێکردن ڕۆژی ۹٥۹/٦/۳۰ ئامادەی کۆبوونەوەیەکی فراوان بن لەماڵی مەلا مستەفای بارزانی بۆ خۆسازدان بۆ کۆنگرەی چوارەمی پارتی...

ئەندامانی سەرکردایەتی هەموو ئامادەبوون جگە لەگروپەکەی (هەمز عبدالله).. لەکۆبوونەوەکەدا بارزانی بڕیاریدا ئەو گروپە تجمید بکرێ و وەفدێکی ناردە سەریان و داوایلێکردن مەکتەبی سیاسی و ڕۆژنامەی خەبات چۆڵ بکەن و دەست لەکاربکێشنەوە. ئیش و کارەکانی (م.س) و ڕۆژنامەی خەباتی بەبرایم ئەحمەدو هاوڕێکانی سپاردو داوای لێکردن بەزوویی کۆنگرەی چوارەم ببەستن.

لەمانگی ۱۰-۱۹٥۹ کۆنگرەی چوارەم بەستراو لەو کۆنگرەیەدا گروپەکەی (همزە عبدالله) بۆیەکجاری لەپارتی دەرکرا، سەرکردایەتییەکی تازە هاتەکایەوەو بەزۆری دەنگ بارزای بەسەرۆکی پارتی هەڵبژێرایەوە...

برایم ئەحمەد کرا بەسکرتێری پارتی و ئەندامانی لیژنەی مەرکەزی و پشکنین و چاودێری (تفتیش و مراقبە) لەم ناوانەی خوارەوە هەڵبژێرران.

نوری شاوەیس، علی عبدالله، عومەر موستەفا، جەلال تاڵەبانی، مەلا عبدالله اسماعیل، جلال عبدالرحمان، زکیە اسماعیل حقی و ئەحمەد عبدالله ئامێدی، عەونی یوسف، سید عزیز شەمزینی، نوری ئەحمەدی تاها، یەدوڵا کەریم، شەمسەدین موفتی، علی عەسکەری، حبیب محمد کریم..

بارزانی چەند ڕۆژێك پێش کۆنگرە گەڕایەوە بارزان و نەیدەویست لەکۆنگرە ئامادەبێت چونکە (عبدالکریم قاسم) پێی ناخۆش بوو بارزانی بکرێتەوە بەسەرۆکی پارتی...!

دەیویست حزبایەتی نەکاو هاوکاری خۆی بێت و بەس. وەفدێك لەئەندامانی کۆنگرە چوونە لای بارزانی و قەناعەتیان پێکرد لەکۆنگرە ئامادەبێت و سەرۆکایەتی پارتی قبووڵ بکات دوای کۆنگرە ئیبراهیم ئەحمەد بەتەواوی دەستی کرایەوە بۆ ئەوەی بیرو باوەڕی خۆی لەناو جەماوەری پارتی بچەسپێنێت لەڕێگای ڕێخستن و ڕۆژنامەی خەباتەوە.

بیروبۆچوونەکانی کران بەبەرنامەی کاری پارتی دیموکراتی کوردستان.

دوای کۆنگرەو دەرکردنی هەمزە عەبدوڵاو هاوڕێکانی چەند ئەندامێکی پارتی لەشارەکان لە خەبات سارد بوونەوە. لەهەولێر حسن موستەفا، لەتیف نادر، حیدر همزە، ممتاز حیدری، جەمشید حیدری، خاتوو نافعە عوسمان)، دوای ماوەیەك زۆربەیان گەرانەوە ناو ڕێکخستنەکان جگەلە (ممتاز حیدری و جەمشیدی) برای و (نافعە) خانی خوشکی حەمید عوسمان. دوای ئەو کۆنگرەیە پارتی زۆر گەشەی کرد. مۆڵەتی یاسایی پێدراو بەئاشکرا کاری سیاسی بکاو بارەگاو ڕۆژنامەی هەبێت.

حزبی شیوعی بەپێچەوانەی پارتی بەرەو کزی و لاوازی چوو هەڵەی سیاسی گەورەیان کرد. لەمانگی ئازار لەموسڵ و لەمانگی تەموز لەکەرکوك کارەساتی خوێناوییان ئەنجامدا، دروشمی نەگونجاویان بەرزکردەوە (حزب

الشيوعي في الحكم مطلبُ عظيــم) پاڵەپەستۆیان خستە سەر حکومەت و پارتە ناسیۆنالیستە عەرەبەکان..

عەبدولکەریم قاسم لەکردەوەکانی حزبی شیوعی ناڕازی بوو دەستیکرد بەگرتن و سزادانیان..

قاسم ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بەرەو خۆپەرستی و تاک ڕەوی و دیکتاتۆریەت ملی ڕێگای گرت، بارودۆخی عێراق بەرەو ئاڵۆزی چوو.

کوردستان بوو بوو بە بەرمیلی نەوت و بەرەو تەقینــەوە دەچــوو. نێــوان قاسم و بارزانی تێکچوو لەسەر کوشتنی شێخ ئەحمەدی زێباری لەموصل لەلایەن چەند بارزانیەکەوە... بارزانی هانی سەرەك عەشیرەتە کوردەکانی دا لەدژی حکومــەت، وەبۆخــۆی چــووە بــارزان و دانیشــت و پــەیوەندی لەگــەڵ حکومەت بڕی. حکومەت کەوتە ویـژەی ئەندامانی پارتی و گرتـن و ڕاونـان دەستی پێ کرد.

ڕۆژنامەی (خەبات) داخـراو عومـەر دەبابـە گیراو فرمـانی گرتنـی برایـم ئەحمــەد و شەمســەدین موفتــی دەرچــوو لەســەر کوشــتنی (ســدیق مــیران) لەلایەن کاوانیەکانەوە). شۆڕشی ئەیلول هەڵگیرسا و بارزانی چووە ناوچەی بادینـان و لـەچیای (مـەتینا) بارەگـای دانـا و هـیزی کۆکردنـەوە و لەشـکری ئامادەکرد.

مەکتەبی سیاسـی لـەگوندی (عـەودالان) کۆبوونەوەیـەکیان کـرد و دواتـر بارەگایان بردە ناوچەی ماوەت لەگوندی (مالوومە) ڕێکخستنەکانیان لەناو سوپا و لەپۆلیس ئاگادارکردەوە. پەیوەندی بەشۆڕشەوە بکەن.

بەســەدان پۆلیــس و ســەرباز هاتنــە نــاو شــۆڕش و شۆڕشــی ئــەیلول بــە (شۆڕشی پۆلیس) ناوبانگی دەرکرد.

حزب و سەرۆك لێك ترازان، دووركەوتنەوە، پەیوەندیان زۆر كەم بوو، هەریەكە بەشێوەیەك كاری دەكرد. كودەتایی بەعسیەكان لەمانگی شوباتی ١٩٦٣ دا ڕوویداو بڕیاری لەناوبردنی حزبی شیوعیان دا.

شیوعیەكان ناچار هاتنە ناو شۆڕش و چوونە ژێر باڵی مەلا مستەفا ئەوەندە خراپەیان لەگەڵ ئەندامانی پارتی كردبوو پڕۆپاگەندەیان لەدژی شۆڕشی كورد و سەركردەكانی كورد كردبوو ڕوویان نەبوو بچنە لای مەكتەبی سیاسی، (پ، م) و كادرەكانی پارتی كەیفیان بەچارەی شیوعیەكان نەدەهات. ئاغا و دەرەبەگەكانی ناو شۆڕش و ناوچەكانی ژێر دەسەڵاتی پارتی جگەلە (عەباسی مامەند ئاغا) و (سمایل سوارە) و (شێخ حسین بۆسكێن) و (كوێخا سمایلی تەلان) كەوتنە پیلان گێڕان و شكات كردن لەپارتی لای بارزانی چونكە لەبەرژەوەندیان درابوو. حزبی شیوعی كەوتە پیلان گێڕان و ڕاپۆرت نووسین بۆ بارزانی لەدژی كادرەكانی پارتی.

بارزانی بڕیاری دەستگیركردنی چەند كادرێكی پارتی دا لەوانە (مەلا عەبدوڵا ئیسماعیل و) (مەجید گورگ) و (عەلی حەمدی). مەكتەبی سیاسی زۆریان پێ ناخۆش بوو بەڵام دسەڵاتی بارزانیان نەبوو چونكە دەیانزانی ئەو ڕاپۆرت و شكاتانە پیلانەو هیچی ڕاست نیە.

بارزانی (عەلی حەمدی) لەسێدارەدا بەبێ لێپرسینەوەو ئاگاداری (م.س) تائێستا كەس نازانێ لەسەرچی لەسێدارە دراوەو بەبێ لێپرسینەوەو ئاگاداری مەكتەبی سیاسی – عەلی حەمدی ئەندامی لیژنەی مەركەزی بوو- بڕواو متمانە لەنێوان مەكتەبی سیاسی و سەرۆك زۆر لاواز بوو لەسەر ئەو مەسەلەیە. بارزانی پەیوەندی لەگەڵ ئێران باش بوو كەوتە گرتن و ڕاونانی ئەندامانی حزبی دیموكراتی كوردستانی ئێران.

دووبەرەکی خستە نێوان حزبی ناوبراو، (عەبدوڵا ئیسحاقی) جیابووەو خۆی‌کردە سکرتێری حزبی ناوبراو، چەند بەیاننامەی دەرکرد لەژێر ناوی (دیسان بارزانی) بۆ ستایشی بارزانی و هێرش کردنە سەر سەرکردایەتی (حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی لە عێراق).

بارزانی دەستی‌خستە ناو ڕێکخستنەکانی کوردستانی باکورو هەڤاڵان (شڤان)و (سعید ئاڵچی) دوو ئەندامی سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانی کوردستانی تورکیا بوون بەشێوەیەکی نادیار شەهیدکران لەناوچەکانی ژێردەسەڵاتی بارزانی. مەکتەبی سیاسی پارتی بەتەواوی ترسی لێنیشتبوو.

بارزانی برووسکەی دەکرد کە (فلان..) بگرن و بۆی ڕەوانە بکەن، بەڵام مەکتەبی سیاسی فرمانەکەیان جێبەجێ نەدەکرد.

بارزانی بروسکەی بۆ کردن ((ئەگەر من بەسەرۆکی پارتی و سەرۆکی شۆڕش دەزانن دەبێ فەرمانەکانم جێبەجێ بکەن)).

ئەو وایدەزانی خەتای سکرتێری حیزبە فەرمانەکانی جێبەجێ ناکرێت، بۆیە فەرمانی دا برایم ئەحمەد لە سکرتێری لاببرێت و (مام جەلال) بچێتە جێگاکەی، مەکتەبی سیاسی ئەو داوایەشیان قبوڵ نەکرد.

بارزانی لە مەکتەبی سیاسی زۆر نیگەران بوو، چونکە هیچ شتێکیان بەدڵی ئەو نەدەکرد.

لە شوباتی ١٩٦٤ز بارزانی لەگەڵ حکومەتی عێراقدا ڕێکەوت و بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە بەبێ ئەوەی هیچ مافێك یان داخوازییەکی تیا دیاری کرابێت بۆ کورد، بەڵکو تەنها لێبووردنی گشتی بوو، وادەی جێبەجێکردنی داخوازییەکانی تێدابوو.

وەفدێـك لـە مەكتـەبی سیاسـییەوە چـووە لای بـارزانی لـەبارەی ئـەو ڕێكەوتنە، بەڵام ئەو مەبەستی خۆی بۆ ڕوون نەكردنەوە. هەر ئەوەندە وتـی ((میللەتەكـەمان مـاندووە پێویسـتی بـە پشـوو هەیـە. حكومـەت باشـەو داخوازییـەكان جێبـەجێ دەكـات، چیتـان دەوێ بنووسـن و بیـدەن بـە حكومەت و پێی لەسەر دابگرن)).

مەكتـەبی سیاسـی ئۆقرەیـان نـەگرت و هـەوڵیان نـەدا كێشـەكان بچـووك بكەنەوەو لەگەڵ بارزانی خاوی بكەنەوە. بارودۆخەكەیان بەرەو ئاڵۆزی برد، كە بڕیاریان دا كۆنفرانسێك لـە (مالومـە) مـاوەت بگـرن. لـەو كۆنفرانسـەدا وەفدێكیان ناردە لای بارزانی بێت بەشداری بكات.

لە وەڵامدا وتبووی، با بێن لێرە لای من كۆنفرانس دەگرین.. !!

ئەندامانی وەفدەكەی هەاگـەڕاندبووەو بـۆلای خـۆی ڕایكێشـابوون، وەك لەیادم بێت (حەبیب كەریم و عەبدولڕەحمان گۆمەشین)ی لەگـەڵدا بـوون. لـەو كۆنفرانسـەدا بڕیـاری بەیاننامەكـەیان دابـوو لـە دژی بـارزانی لـەژێر نـاوی (اتفاقیة المشیر والبارزاني أصلح أم استسلام)؟ بەیانەكـەیان دەركـردو بـڵاو كردەوە كە گوایە بارزانی كوردی بەمۆزو پرتەقاڵ فرۆشتووە.

لەبەرامبەردا بارزانی بڕیاری دا (ئیمپراتۆریەتی) ماوەت بڕوخێنـێ، هەر وەك خـۆی نـاوی لێنـابوون- هێرشـی كـردە سـەر مەكتـەبی سیاسـی و شـەڕی براكوژی بۆ یەكەمجار لە باشووری كوردستان دەستی پێكرد.

بڕیارەكانی ئەو كۆنفرانسەو بەیاننامەكە دەربارەی ڕێكـەوتنی بـارزانی و مشـیر عەبدولسـەلام عـارف ئـەنجامی خراپـی دا بەدەسـتەوە. دەكـرا ئـەو كۆنفرانسە نەبەستریٚ و ئەو بەیانـە بڵاو نەكرێتـەوە. مەكتـەبی سیاسـی لـە حسـاباتیاندا بەهەڵـەدا چووبـوون. وایـان دەزانـی بەبەیاننامەیـەك بـارزانی بچووك دەكەنەوە.. حسابی ئەوەیان نەكردبوو هەموو دام و دەزگاكانی پارتی

لە ماوەی هەژدە ساڵی پێشووتر ئیش و کاریان ستایشی کەسی (شـخصي) مەلا مستەفای بارزانی بوو، چۆن دەکرا بە یەك بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی بچووك بکرێتەوە؟!!.

لە وڵاتێکی وەکو کوردستانی نیمچە عەشایەری و تاك پەرستیدا!!!.. کە بارزانی خۆشەویستی (پ.م) و کۆمەلانی خـەڵکی کوردسـتان بـوو. مـاوەی بیست ساڵ بوو سـەرۆکێکی بـێ مونـافیس بـوو، کـەس بـاوەڕی نـەدەکرد خیانەت لە کورد بکات. دەبووایە ڕابردوی بێگەردی بارزانی و خۆشەویستی لەناو خەڵکدا لەبەرچاو بگرن و ئەو بڕیارانە نەدەن.

بۆیـە بینیمـان لـە (٧٥٪) پێشـمەرگە چوونـە لای بـارزانی و پشـتیان لـە سەرکردایەتی پارتی کرد..

لەبەرامبەر ئەو کۆنفرانسە بارزانی بڕیاریدا کۆنگرەی پـارتی بگرێـت، لـە تـەمموزی ١٩٦٤ لەقـەڵادزە کۆنگـرەی شەشـەم گیرا بـەبێ ئامـادەبوونی یـەك ئەندامی سەرکردایەتی.

لـەو کۆنگرەیـەدا کە زۆربـەیان غـەیرە حزبـی بـوون، بڕیاریـان دا هـەموو ئەندامانی مەکتەبی سیاسی و لیژنـەی مەرکـەزی پێشـوو لـەپارتی دەربکـەن. دیـارە ئـەندامانی کۆنگـرەش بـەبێ هـەڵبژاردن بـوو بـوون بـە نوێنــەر لــەو کۆنگرەیەدا..

لەو سەردەمەدا لەناو ڕۆشنبیران و سیاسـەتمەداران دوو بۆچـوون سـەری هەڵدا:

یەکەم: بارزانی سەرۆکی حیزبـەو سـەرکردەی شۆڕشـە، ئەرکی بەئـەنجام گـەیاندنی لەئەستۆدایە، وەك هـەموو سـەرکردەکانی ڕۆژهـەڵات، نـابێ کـەس دەست بخاتە ڕێگای، پێویستە سەرکردایەتی پارتی گوێڕایـەڵی بڕیارەکـانی بێت و کورد لە شەڕی براکوژی بپارێزێت. پارتی بەو هەڵوێستەی دەتوانـێ

بارزانی ناچار بکات لێپرسراوەتی مێژوویی هەڵبگرێ‌و کادرو ئەندامەکانی خۆی بپارێزێ‌و لەناو خەڵك خۆشەویستتر بێت.

دووەم: بۆچوونی دووەم دەیگوت، بارزانی دەستی لەگەڵ ئێران تێکەڵ کردووە، لەگەڵ عێراق ڕێکەوتووە، پەیوەندیشی لەگەڵ تورك پەیدا کردووە، لە هەرسێ پارچەی کوردستان ڕاوە حیزبەو شۆڕش پاکسازی دەکرێت، بارزانی داوای لە (پ.م) کردووە بچنەوە ناو ماڵ‌و منداڵی خۆیان بەبێ هیچ دەستکەوتێك.. بۆیە نابێ ملی بۆ کەچ بکرێت‌و مێژوو ڕەحم بەکەس ناکات، ئێمە بەرپرسیارین بەرامبەر ئەم میللەتە.

بەلای منەوە ئەو تەنازولەی لەساڵی ١٩٧٠ز بۆ بارزانی کرا، لە ساڵی ١٩٦٤ بکرایە زۆر باشتر بوو، چونکە کورد تووشی شەڕی براکوژی نەدەبوو، کە تا ئێستا نەبڕاوەتەوە.

هەرچەندە جیاوازی زۆر هەیە لەنێوان بەیاننامەی ساڵی ١٩٦٤و ڕێکەوتننامەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠.

لە کۆنفرانسی (تیمار) لە قەرەداغ لە ئابی ١٩٦٦ز، نووسەری ئەم کتێبە داوای لە ئەندامانی کۆنفرانس کرد لەگەڵ بارزانی ڕێك بکەوین‌و تەنازولی بۆ بکەین باشترە لەوەی لەگەڵ حکومەت ڕێك بکەوین، وە ناڕازی بوونی نیشاندا لە دەرکردنی (عەلی عەبدولا)و (نوری شاوەیس) لە حیزب.

لە بڕیارەکانی ئەو کۆنفرانسەدا هاتووە، هەڤاڵ ئەحمەد شەریف‌و کەمال موفتی ناڕازین لەو بڕیارانە، دیارە لە کۆنفرانسەکەی ماوەت ئێمە بەشدار نەبووین، ڕەنگە ئەگەر بەشدار بووینایە بۆچوونی یەکەممان دەبوو.

بەلام ئەبێ بۆ مێژوو تۆمار بکرێت ڕێکەوتنی مەکتەبی سیاسی ساڵی ١٩٦٦ز لەگەڵ حکومەتی عێراق، هەرچەندە ئاگری شەڕی براکوژی خۆشتر

کردو زیانی زۆری بۆ سەرکردەکانی پارتی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، بەڵام دەستکەوتی زۆر گەورەی بۆ کورد دابین کرد.

لەوانە:

١- داننان بەمافی گەلی کورد لە عێراق.

٢- دامەزراندنی زانکۆی سلێمانی.

٣- دهۆك کرایە پارێزگا.

٤- دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆشنبیری کوردی.

٥- جەژنی نەورۆز بەرەسمی دانی پیانرا وەك جەژنی میللەتی کوردو کرایە پشووی ڕەسمی لەسەرتاسەری عێراق.

٦- دەیان لاوی کورد لە کۆلیجی سەربازیو کۆلیجی ئەفسەری پۆلیس وەرگیران.

٧- لێبووردنی گشتی دەرکرا بۆ بەندە سیاسییەکان.

٨- ڕۆژنامەی (النور) ڕێگای پێدرا دەربچێت بە زمانی عەرەبی.

کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ڕای گشتی عەرەبی دەربارەی کێشەی ڕەوای کورد، بەکورتی دەربارەی ناکۆکی نێوان بارزانیو مەکتەبی سیاسی ساڵی ١٩٦٤ز. من هەرئەوەندەی لێدەزانم بە ویژدانەوە بیروڕاو ڕووداوەکانم تۆمار کردووە، ڕەنگە شتی تر نهێنی لەنێواندا هەبێت من ئاگاداری نەبم.

# برایم ئەحمەد لە ئینگلستان

لەدوای هەرەس پێهێنانی شۆڕشی ئەیلوول لە ساڵی ١٩٧٥ز کورد تووشی سەرگەردانی و سەرلێشێوان بوو. مەلا مستەفا وازی هێناو جاڕی دا: ((کاری من تمام شد)). لەو سەرو بەندەدا پارتی پارچە پارچە بوو. یەکێتی نیشتمانی کوردستان بەیانی دامەزراندنی ڕاگەیاند، برایم ئەحمەد لە گۆڕەپانەکە کشایەوەو خۆی بە نووسینی چیرۆکی (دڕك و گوڵ)ـەوە خەریك کرد. وەك کەسایەتییەکی ناسراوو بەناوبانگی کورد کەوتە پەیوەندی بەستن بە سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیرە کوردەکانی هەندەران و پیاوە ناسراوەکانی دنیاو ئاڕاستەکردنی گروپ و حزبە سیاسییەکانی کورد. زیاتریش ڕووی لە سیاسەتی نێونەتەوەیی سەرانسەر کردو لە پارتی کرێکارانی کوردستان نزیك بووەو بووە دۆستی نزیکیان، لە هەموو کۆڕو کۆبوونەوەکانی دەرەوەی وڵاتیانا ئامادە دەبوو، پشتگیری دەکردن.. لە هەمان کاتدا کەوتە چالاکی لەدژی دکتاتۆریەتی عێراق، وە لەلەندەن بەناوی (چریکەی کوردستان)ەوە گۆڤارێکی دەرکرد. ئەم گۆڤارە لە تەمموزی ساڵی ١٩٧٩ز تا ئەیلوولی ساڵی ١٩٨٥ (٩) ژمارەی بە کوردی و پێنج ژمارەی بە عەرەبی (صرخە کردستان)ی لێدەرچوو. زۆربەی زۆری وتارەکان و شیعرەکانی ناو ئەو گۆڤارە لەدژی بەعسی عێراق و سەدام حسێن بوون، بۆ دەرچوواندنی ئەم گۆڤارە خوالێخۆش بوو (تۆفیق وەهبی بەگ) و (محەمەد

ڕەسوڵ هاوار) هاوکاریان دەکردو، ڕۆشنبیرو ئەدیب و سیاسەتمەدارانی کورد لە دەرەوەی وڵات بە وتاری سیاسی و شیعرو کورتە چیرۆک و دەنگوباسی کوردستانی عێراق و تورکیاو ئێران گۆڤارەکەیان دەوڵەمەندتر کردبوو. گۆڤاری (چریکەی کوردستان) ڕۆڵی باشی بینی لە دژی داگیرکەرانی کوردستان و ڕیسواکردنی ڕژێمی داگیرکەری بەغداو کوشت و بڕی بێ ژمارەی خەڵکی کوردستان و سیاسەتی تەعریب و تەهجیرو تەبعیس لە کوردستانی عێراق.

ئەگەر چاوێك بەلاپەڕەکانی ئەم گۆڤارەدا بگێڕین، دەیان وتارو باسی لەمەڕ شەڕی کاولکارانەی سەدام لەدژی کۆماری ئیسلامی ئێران و پێشێلکردنی مافی مرۆڤ و جینۆسایدی خەڵکی کوردستان بەدەستی ئەو ڕژێمە کۆنەپەرستەو زیندانی کردن و ئیعدامکردنی هەزاران لاوی کوردی بێ تاوان لە بەندیخانەکانی موسڵ و ئەبو غرێب و هەیئەی تەحقیقی خاسەی کەرکوك دەبینین. لەو گۆڤارەدا برایم ئەحمەد نەك هەرسەرپەرشتیکەرو دەرهێنەری بوو، بەڵکو خۆشی چەندین وتاری بەکوردی و بەعەرەبی تیانووسیوە، وێڕای ئەمەش لەزۆربەی کۆڕو کۆبوونەوەو سیمینارى کوردەکانی دەرەوەی وڵاتدا ئامادە دەبوو بەو تەمەنە زۆرەوە هزرو بیروباوەڕی خۆی بەبێ ئەملاوئەولاو پێچ‌وپەنا دەردەبڕی.

برایم ئەحمەد لەسەر ئەم شێوە تێکۆشان و خەباتە بەردەوام بوو تا لەئێوارەی ڕۆژی شەممە ٢٠٠٠/٤/٨ لەلەندەن کۆچی دوایی کردو لە ٢٠٠٠/٤/٢٠ تەرمی پیرۆزی گەیشتەوە کوردستانی هەوارگەی باووباپیرانی لەڕۆژی هەینی ٢٠٠٠/٤/٢١لە گردی (سلیم بەگ- ئێستا ناونراوە گردی گەورەپیاوانی کورد) بەئامادەبوونی سەدان هەزار کەس لەشاری سلێمانی نێژراو بەخاك سپێردرا.

کۆچی‌دوایی برایم ئەحمەد و هێنانەوەی تەرمە شکۆدارەکەی بۆ سلێمانی و ئەو پێشوازییە بێوێنەیەی لەتەرمە فریشتە ئاساییەکەی کرا لەسەرسنوورو بەئامادەبوون و بەشداری بەرپرسانی کۆماری ئیسلامی ئێران و ئاڵای کوردستان لەنەعشەکەی ئاڵابوو درایە دەست ئەفسەرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و لەسەر شانی شەش ئەفسەری دەرەجەدار هەڵگیراو بەڕێکرا لەخاڵی سنووری هاوبەش لەپەروێزخان لەڕۆژی ٢٠/٤/٢٠٠٠ گرنگیەکی زۆری هەبوو جۆرە ددان پێدانانێك بوو بەحکومەتی هەرێمی کوردستان.

وەزیری ڕۆشنبیری ئێران یەکەم کەس بوو بەو بۆنەیەوە بروسکەی ماتەمینی بۆ مام جەلال و بنەماڵەکەی برایم ئەحمەد نارد. ئەمە جگە لەئامادەبوونی دەیان هەزار کەس لەخەڵکی کوردستان بەهەموو چین و توێژەکانیەوە و کەسایەتی ناسراوی کوردو عێراقی و ڕێکخراوە بیانیەکانی لە کوردستان کاردەکەن.

هەروەها بەشداری پارتە سیاسیەکانی کوردستان لەهەرچوار پارچەی کوردستان و ئەحزابی عێراقی بەرهەڵستکارو ئەحزابی عەرەبی و ئێرانی و، حکومەتی ئێران و عێراق و تورکیاش بەڕەسمی لەپرسەکەیداو، بروسکەو فاکس و نامەی دەیان و بگرە سەدان کەسایەتی ناسراوی سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیرو ئەدیب و شاعیرو ڕۆژنامەنووس و چیرۆك نووس و دادوەرو ماف پەروەرو یاسا ناس و سەرەك هۆزو عەشیرەتە کوردەکان لەهەموو کوردستان و بەتایبەتی بەیاننامەی ئاپۆ (عەبدوڵائۆچ ئالان) لەژووری زیندانەوە لەدوورگەی ئیمرالی تورکیا و ئەو بانگەوازەی بۆ گەلی کوردی بڵاوکردەوە بەبۆنەی کۆچ کردنی برایم ئەحمەدەوە.

هەروەها بەیاننامەی کۆنسەی سەرۆکایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان PKK بەو بۆنەیەوەو ناوبردنی برایم ئەحمەد بەسومبولی یەکێتی نەتەوەیی و ئالآی ئازادی گەلەکەمان و دانانی بەتێکۆشەری شۆڕشگێڕو ڕۆشنبیرێکی هەڵبژاردەو سەرۆکێکی پایەبەرزی گەلی کورد بوو[٢٤]. هەروەها بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان بەو بۆنەیەوە[٢٥].

بروسکەو فاکس و پرسەنامەی حزبە کوردستانی و عێراقیەکان و کونسوڵ و سەفیری حکومەتەکانی ئەوروپا لەتاران و مامۆستایانی زانکۆکانی کوردستان و پرۆفیسۆرە پایەبەرزەکانی زانکۆی سلێمانی و سەلاحەدین و بەغداو بنەماڵەی شەهید قازی محمدو سەرکردەکانی حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و شەخصی مەلا عبدوالڵای حەسەن زادەو کۆمەڵەی ئێران و هونەرمەندانی گەورەی کوردستان و یەکێتی سەندیکاکانی ئەدیبان و مامۆستایان و لاوان و خوێندکاران و ژنان و کرێکاران و جوتیاران و پزیشکان و ئەندازیاران و جیولۆجیەکان و وەرزشکاران و کاسبکاران و پیشەوەران. هەموو ئەوانە نیشانەی ئەمەك و وەفاداری خەڵکی کوردستانە بۆ ئەو پیاوە، کەژیانی دوورو درێژی لەپێناو نەتەوەکەیدا تەرخان کردبوو.

بەلای ئێمەوە خەڵکی کوردستان حەقی خەبات و ماندووبوون و داهێنانی برایم ئەحمەدیان دایەوە، چونکە ئەوەی خەڵکی شاری سلێمانی و

---

[٢٤] بەیاننامەو بانگەوازی پارتی کرێکارانی کوردستان، کۆنسەی سەرۆکایەتی بە ئیمزای بەڕێز عوسمان ئۆچ ئالان.

[٢٥] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١١٥، لە ٢٠٠٠/٤/٩و ژمارە ٢١١٦ لە ٢٠٠٠/٤/١٠.

شارەکانی کەلارو دەربەندیخان بۆ برایم ئەحمەدیان کرد، کەبەدڵ و دەروون و ئارەزووی خۆیان ئەو هەموو ماندووبوون و ئەرکەیان بۆ پێشوازی و بەخاك سپاردنی کێشا، بۆ کەسێکی‌تر بەو شێوەو شێوازە نەکراوە. هەموو ئەحزاب و کەسایەتی بەجیاوازی بیروباوەڕو بۆچوونیانەوە بەچڕوپڕی ئامادەو بەشداری مەراسیمەکە بوون و ئەرکی وەفاداری و دڵسۆزی خۆیان بۆ ئەو سیاسەتمەدارو ئەدیب و ڕۆشنبیرو ڕۆژنامەنووسە جوامێریی نەتەوەکەمان دەربڕی[٢٦].

نامەو فاکسەکان نیشانەی ڕێزو تقدیری میلەتەکەمانە بۆ برایم ئەحمەدو هەڵسەنگاندنی ئەوان بۆ خەبات و تێکۆشانی برایم ئەحمەدو داهێنانەکانیەتی لەمەیدانی ئەدەب و ڕۆشنبیری‌دا. هەروەها پێویستە ئاماژە بەبۆچوونی غەفوری میرزا کەریم بکەم دەربارەی برایم ئەحمەد کەلە بیرەوەریەکانیدا لەبارەی ئەوەوە تۆماری کردووەو دەنوسێت: (ئەوە بوو کاك کەریم سۆق لەچالاکیەکی حزبی شیوعیدا ساڵی ١٩٤٦ز هاتە گرتن و بەڕێز برایم ئەحمەد بووبەپارێزەری و زۆر مەردانە لەسەر گیراوە پێشکەوتنخوازەکان بەخۆڕایی پارێزگاری ئەکردو هەموو جارێ لەکۆڕی دادگا پارێزگاری لەو کەسانە ئەکرد کەبەو ناوەوە ئەگیران و ئێمەش هەمیشە ڕێزمان لێ ئەگرت... بۆ مێژوو ئەڵێن جارێك دەعوایەکی گرت دژی حەمەی ئەوڕەحمان ئاغا بوو، ئەم هەڵوێستە حەمەی ئەوڕەحمان ئاغای نیگەران کرد، بۆیە (حەمەی ڕەشە قۆڵچی) کەخەڵکی هەڵەبجەو ڕاکردووی سەربازی و نانخۆری حەمە ئاغا بوو، بۆ تۆڵە سەندن تەقەی لە برایم ئەحمەد کردو بریندار کرد. خۆپیشاندان لەلایەن شیوعیەکانەوە بۆ پشتگیری لە

[٢٦] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٣١، لە ٢٧/٤/٢٠٠٠، ل٧.

برایم ئەحمەد دەستی پێکرد و نیگەرانی خۆیان دەبڕی و داوایان کرد تاوانباران بگرن. میریش لەوکاتەدا نەیتوانی حەمەی ڕەشەی قوڵچی بگرێ، حەمەی ئەوڕەحمان ئاغای گرت و (١٠) دە ڕۆژ بەندی کرد[٢٧]. لەکۆتایی ئەم بەشەدا کەلەسەر ژیانی برایم ئەحمەد نوسراوە[٢٨] بەپێویستی دەزانم ئاماژ بەبیروبۆچوونی فەیلەسوفی کورد (پیرەمێرد) بکەم دەربارەی برایم ئەحمەد کەلەساڵی ١٩٤٦ز دا دەریبڕیوە لەژێر ناوی: (خوادایەوە).

## ((خوا دایەوە))

(ئێمە یەکێکی زیرەکی تێگەییوی وەك ئاتەش پارەمان بوو. کاتێك لەمەکتەبی حقوق ئەیخوێند جارجار مەقالەی بۆ ژیان ئەنارد، ناوی خۆی نەئەنوسی، من پێم ئەوت(نیقابداری سیاپۆش) کەلەمەکتەب دەرچوو دەستیدایە ئەوقاتیی. لێرەدا تاقەو وێنەی قات بوو. دوایی لێم وون بوو، تاپێرێ پاکەتێ نقوڵم بۆهات وتیان ئەمە شەکراوی (برایم ئەحمەد )ی موحامییە ژنی هێناوە، بۆمان زیندوو بۆوەو خوادایەوە، بەخوا وەکو خوا کوڕێکی دابمێ وای ئەزانم، خوا موبارەکی کا).

وە هەر لەبارەی پیرەمێردو برایم ئەحمەدەوە.. جارێکیان برایم ئەحمەد بە پیرەمێرد دەڵێت: ((تۆ عەیب ناکەیت لە ڕۆژنامەکەتدا ئەوەندە جنێو بە سۆڤییەت دەدەیت؟ تۆ نازانیت سۆڤییەت داڵدەی بارزانییەکانی دا وەو پشتگیری لە کورد دەکەن، ئاخر ئەم کارەی تۆ شوورەییە بۆ کورد نەنگییە

---

[٢٧] کێوماڵێ بەناو بیرەوەرییەکانمدا، غەفووری میرزا کەریم، سلێمانی، نەورۆزی ٢٠٠٠، ل١٢٤.

[٢٨] ڕۆژنامەی ژین، ژمارە ٨٤٠، ئەیلولی ١٩٤٦ز.

ئـەوەنده بـیٚ وەفـا بیـت..)) پـیرەمێردیش ئەچێتـه لای قـازی شـکایەتی لیٚ دەکات و ئـەڵیٚ (بلـه) هەرەشـەی لیٚ کـردووم، قا زیـش (شـێخ محمـدی خـالٚ) دەبێت و لەدوای برایم ئەحمەد دەنێرێت و دەڵێت: ((بله بۆچی هەرەشـەت لـه تۆفیـق ئاغـا کـردووە، ئـەوە شـیکایەتی لي کردوویـت..)) ئـەویش دەڵێــت: ((قوربان هاتووم من شیکایەت لـەو بکـەم چونکـه جنێوی پێداوم)). قازیش دەپرسیٚ: ((له کویٚ جنێوی پێداوی؟)) ئەویش دەڵێت: ((لـه ڕۆژنامەکەیا))، قازیش دەڵێت: ((مـن ڕۆژنامەکـەم خوێندووەتـەوە نـه جنێـوی پێـداوی و نـه نـاوی تـۆی هێنــاوە)). برایــم ئەحمــەدیش دەڵێــت: (٠قوربــان تــۆ باشــی بخوێنەوە، نووسیوێتی خوا ڕووی ئەو کەسە ڕەش کات وەکو ناوەکەی، کە ئەو بیرۆکەی شیوعیەتی لەم وڵاتە بڵاو کردەوە، ئەوە مەبەستی منە، چونکە مـن نــاوم بلــەی ئەحــه ڕەشــه))، ئینجـا قـازی بـەدوای پـیرەمێددا دەنـێریٚ و ئاشتیان دەکاتەوە.

# هێلکاتی نووسین و داهێنان

سەرەتاکانی نووسین لای برایم ئەحمەد لەسالآنی سی‌یەوەیە، وەك برایم ئەحمەد دەڵێ[٢٩]:

لەساڵی ١٩٢٨- یان ١٩٢٩ز ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ موتەسەریفی سلێمانی بوو. ووتارێکم نوسی‌بوو بۆ ڕۆژنامەی (ژیانەوە). بەعنوانی (سەعادەت) بلآویان نەکردەوە بۆیان نوسی‌بووم. ((تکایە بەشێوەیەك بنووسە خەڵك تێ‌بگات)) ئەوە وای لێ‌کردم بەدەرەجەی (١٨٠) وەرگەڕام بۆ کوردی پەتی نووسین. هەروەها دەڵێت (ڕاپەڕینی ئەیلولی ساڵی ١٩٣٠ز بەردەرکی سەرا لەشاری سلێمانی لەناخەوە هەژاندمی وەك چەخماخە لەمێشك و دڵ و دەروونما گڕی گرتبوو، لەگەڵ هاوڕێکانی هاوتەمەنی خۆم کەوتمە جموجوڵی سیاسی و کوردایەتی و شیعر خوێندنەوەو شیعر نووسین و باس‌وخواسی کوردایەتی و خۆدەوڵەمەندکردن بەبیروبۆچوونی

---

[٢٩] لە چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنیدا لەگەڵ دەستەی بەڕێوەبەری کەلەپوور لە سلێمانی لە ڕۆژی ١٣/٢/١٩٩٢ز.

سیاسی و لایەنگیری بەرەی گەلٚ و تێکەڵاوی کۆمەلاٚیەتی)[٣٠]، ئینجا کەچۆتە بەغداد بۆ تەاوکردنی خوێندنی ناوەندی و دواناوەندی و دواتر کۆلێژی یاسا لەبەغداد لەگەڵ لاوانی خوێندەواری کوردی خەڵکی شاری سلێمانی و هەولێرو دهۆك و کەرکوك پەیوەندی بەستووەو کۆڕو کۆبوونەوەیان گرێداوەو جۆرێك ڕێکخستن و ڕێك وپێکیان دامەزراندووەو چالاکی سیاسی و ئەدەبییان نواندووە. دیارە یانەی سەرکەوتنی کوردان لەبەغدا هەلی لەباری بۆ ڕەخساندوون و سازداون چاویان بەکەسایەتی سیاسی و ڕووناکبیری گەورەی وەك مەعروف چیاووك و ڕەفیق حلمی و محمد أمین زەکی و عەلی کەمال و تۆفیق وەهبی.. تاد.. بکەوێت و ئەوانیش هانی لاوانیان داوەو پشتگیریان کردوون بۆچالاکی ئەدەبی و کۆمەلاٚیەتی.

گەشەکردنی بزوتنەوەی نەتەوایەتی عەرەب لەبەغدای پایتەختداو خوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمە، کەهێشتا عێراق لەژێر ئینتیدابی ئینگلیزدابوو بەتەواوی سەربەخۆیی وەرنەگرتبوو نەبوو بووە ئەندام لە (عصبة ا لأمم) - کۆمەڵەی نەتەوەکان- و کێشەی کورد بەبێ چارەسەرکراوی مابۆوە، باس و خواسی مافی گەلان باس ئەکرا لەهەمو کۆڕو دانیشتن و دیوانەکاندا. هەموو ئەوهۆیانە کاریان کردبووە سەر برایم ئەحمەدو شاکیر فەتاح و گۆران و فایەق بێکەس و ڕەشید نەجیب و فازل تاڵەبانی و د. عبدوالرحمان عبدالله و دەیان لاوی تری کورد، کەچاکی

---

(٣٠) وەلاٚمی فاکسی نووسەر لە ١٩٩٩/١١/٢٥ بۆ برایم ئەحمەد لەسەر سەرەتاکانی ژیانی، وادیارە ڕۆژنامەی ژیانەوە شارەوانی سلێمانی ئەوسا دەری کردووەو موتەصەریفیش سەرنووسەر بووە.

مەچەکیان لێ هەڵماڵیبوو کەوتبوونە خۆئامادەکردن بۆ خەباتی سیاسی و ئەدەبی.

پێشەکی بەشیعر نووسین و شەڕە شیعرو بژارکردنی زمانی کوردی لەووشەی تورکی و فارسی و عەرەبی و ئینجا ڕێنووس (ئیملاء)ی کوردی و لێکۆڵینەوە لەمێژووی کورد و کوردستان لەمەیدانەکەی بەغداو گۆڕەپانی کوردستان چووزەرەی کردبوو.

برایم ئەحمەد بۆ خۆشی لاوێکی زیرەك و هۆشیارو بزێو بوو، کوردایەتی لەدڵ و دەرونیا پەنگی خواردبووەوەو برادەری گیانی بەگیانی بێکەسی شاعیر بوو، هەروەها هاوڕێی خۆشەویستی گۆرانی بلیمەت بوو(یانەی سەرکەوتنی کوردان) لەبەغدا لەڕۆژی ۱۹۳۰/٥/۳۰ز کرایەوە.[۳۱]

شاعیری گەورەی عێراقی و بەرەچەڵەك کورد (جمیل زەهاوی) لەگەڵ چەند وەزیرێك ئامادەی کردنەوەی یانەکەبوون. ئەو یانەیە لەوکاتەدا گرنگییەکی زۆری هەبوو بۆ کۆڕو کۆبوونەوەو یەکترناسین و یەکتر بینین. وەك بنکەیەکی سیاسی لێهاتوو بۆ کوردان و گروپە سیاسیەکان، لاوانی کورد ڕۆڵیان دەگێڕا.

برایم ئەحمەد زۆر چالاك بوو لەو مەیدانەدا.. ئەو بارودۆخە لەبارەی بۆی ڕەخسابوو شانبەشانی توانای تایبەتی و ئارەزووی کەسی خۆی هاندەری سەرەکی بوون بۆ تێگەیاندنی برایم ئەحمەدو گەشەکردنی تواناکانی لەبواری ئەدەب و سیاسەتدا.. ئینجا خستنەکاری ئەو توانایە لەو ڕێگاو

[۳۱] [۳٦] گۆڤاری ڕەنگین ، ژمارە(۹) تەمووزی ساڵی ۱۹۸۸ ل٦ قادر قەزاز.

پێناوەدا پسپۆڕانەو وەستایانە ئەنجامی چاكوباشی بەدەستەوەداو هێنایە ئاراوە بۆ ناسین و ناوبانگ دەركردنی (بلە) لەمەیدانی نیشتمان پەروەری و ئەدەب دۆستی و ئەدەب ناسیدا. كەوتە جۆش و خرۆش و پەلەقاژەی پەرۆشی خوێندنی زمانی ئینگلیزی و خۆفێركردن و شارەزابوون لەئەدەبی ئینگلیزیدا، كەئەدەبێكی زۆر دەوڵەمەندە، بوو بە پشت و پەنای پیشكەوتنی. ئەوەتا دەبینین، هەرلەسەرەتاوە هەوڵی ئەوەی داوە لەڕۆژنامەكانی ڕۆژئاواوە ووتارو نووسین وەربگێڕێتە سەر زمانی كوردی و بۆ ڕۆژنامەی (ژیان)ی بنێرێ و لەژێر ناوی (خوازیار)داو پیرەمێردیش زیاتر هانیداوەو پشتگیری كردووەو بۆی بەچاپ گەیاندووە.

بەلای ئێمەوە:

هێڵەكانی نووسین لای برایم ئەحمەد لەم چەند خاڵەی خوارەوەدا خۆی نیشان دەدا:

١. نووسین بەزمانی كوردی پەتی و پاراوو ڕەوان، دوور لەوشەو ڕستەی ناقۆڵا و داتاشراو، واتە بەزمانێك هەموو خەڵك بەئاسانی تێی بگات.[٣٢]

٢. بژاركردی زمانی كوردی لە وشەی بێگانە وەك وشەكانی فارسی و توركی و عەرەبی، كە بە زۆری لەو سەردەمەدا لە نووسینی شیعری شاعیرەكانماندا بەرچاو دەكەوتن، چونكە شاعیرەكانی ئێمە لاسایی ئەو

---

[٣٢] ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٢٦، لە ١٩٣٢/٦/١١ز.

شاعیرە فارسانەیان دەکردەوە کەلە سەدەکانی ناوەڕاستدا شیعریان دانا بوو.

٣. وەرگێڕانی وتا رو ئەو بابەتانەی لە ڕۆژنامەکانی ڕۆ ژئاواوە بۆسەر زمانی کوردی بەتایبەت ئەو وتارو چیرۆکانەی بەکەڵکی نەتەوەی ئێمە دێن، بۆیە دەبینین دەیان وتار، کەلەمەڕ سەرکردەکانی دنیا لەڕۆژنامەکانی ڕۆژئاواوە دەنووسران، وەریدەگرتن و وەریدەگێڕانە سەر زمانی کوردی، بۆ ئەوەی خوێندەواری کورد شارەزایی لەسەر کەسایەتییە ناسراوەکانی جیهانی وەکو (غاندی، نەهرۆ، هتلەر، لینین، تروتسکی، مارکس، ناپۆلیۆن) پەیدا بکات[٣٣]

٤. پشتگیریی و داکۆکی چینی هەژارو چەوساوەکانی میللەتەکەمان لە نووسینەکانیدا دیارو بەرچاو دەدرەوشێنەوە، هەمیشە چیرۆکەکانی خۆی یان وەرگێڕدراوەکانی و وتارە سیاسییەکانی لە خزمەت چینی چەوساوەو زوڵملێکراوی کوردستان بووە.[٣٤]

٥. لەبیرو بۆچونیدا لە دەربڕینی کۆڕو کۆبوونەوەکانیدا، لە لێکدانەوەو لێکۆڵینەوەکانیدا، هەردەم دژی ئیمپریالیزو داگیرکەرانی کوردستان و نۆکەرەکانیان و دەرەبەگە خۆماڵییەکان بووە.[٣٥]

---

[٣٣] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[٣٤] کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١١٧ لە ١١/٤/٢٠٠٠، ل١.

[٣٥] هەمان سەرچاوە.

٦. هەمیشەو هەردەم هەوڵی داوە ڕەوایی مەسەلەی کوردو ڕاستی و دروستی داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان بە ئاشکراو بێ پێچ و پەناو بێ پەردەپۆش بخاتە ڕووی کاربەدەستان و سیاسەتمەداران و بیانهێنێتە ئەو باوەڕەی کە دەبێ کێشەی کورد لەسەر بنچ و بناغەی برایەتی و یەکسانی چارەسەر بکرێت و چیتر پەردەپۆش نەکرێت.[٣٦]

٧. برایم ئەحمەد بە داڕێژەری نەخشەی ستراتیجی برایەتی کوردی عەرەبی دادەنرێ و بەردەوام بەرگری لەو برایەتییەو دۆستایەتییە کردووەو لەو مە یدانەدا هەوڵ و خەباتی بەرچاوی هەیە.[٣٧]

٨. لە هەموو نووسینەکانیدا پشتگیری نەپساوەی لە خەباتی گەلا ن و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی میللەتان ڕەنگی داوەتەوە.[٣٨]

٩. لە نووسینەکانیدا هەمیشە لایەنگیری چینی چەوساوە بووە، دژی جەنگ و جەورو ستەم و زوڵم و زۆرداری بووەو، دەیان وتاری لە دژی فاشیزم نووسیوە.[٣٩]

١٠. نووسەرێکی چەپڕەو پێشکەوتنخواز بووە، بڕوای بە ڕزگاری و سەروەری و سەرفرازی گەلان بەهێز بووە، ورەو عەزمی بەهێز بووە تا مردن لە خەبات بەردەوام بووە.[٤٠]

---

(٣٦) کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٢١ لە ٢٠٠٠/٤/١٦، ل١.

(٣٧) نامیلکەی (الاکراد والعرب) نووسینی برایم ئەحمەد ساڵی ١٩٣٧.

(٣٨) هەمان سەرچاوە.

(٣٩) کوردستانی نوێ ژمارە ٢١٣١ لە ٢٠٠٠/٤/١٥ ل١

١١. برایم ئەحمەد مرۆڤێکی کوردستانی بووە، تا سەر ئێسك و پروسکی بە بەڵگەی ئەوەی لە سەرەتادا لە کۆمەڵەی (ژ.ك)ی کوردستانی ئێران کاری کردووەو لێپرسراوی لقی سلێمانی بووە. دواتر لە حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران بەڕێوەبەری لقی سلێمانی بووە.

ئەمە جگە لەوەش لەو ماوەیەی سکرتێری پارتی دیموکراتی کورد ستانی عێراق بووە، هەمیشە بەرگری و لایەنگیری لە مافەکانی گەلی کورد کردووە، لە هەر چوار پارچەی کوردستان و پەیوەندی باشی لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان بووە.. لە بیست ساڵی دوایی تەمەنیشیدا کەلە ئینگلستان گیرسایەوە، گەرچی لە هیچ حزبێکدا بەرەسمی کاری نەکردووە، بەڵام هاوکارو هاودەردی هەموو حیزب و گروپە کوردییەکانی هەرچوار پارچەی کوردستان بووەو زیاتر خەریکی خەباتی نێونەتەوەیی سەرتاسەری بووەو، ئەندامی کۆنگرەی نەتەوەیی و لایەنگیری پەرلەمانی کوردستان بوو لە دەرەوەی وڵات.[٤١]

[٤٠] هەمان سەرچاوە، هەموو ژمارەکانی خەبات لە ساڵی ١٩٥٩- ١٩٦١ز.

[٤١] چریکەی کوردستان ژمارە ١-٩ لەندەن، (صرخة کردستان)ژمارە (١-٥) لەندەن.

# (ڕەخنەو شیعر)

دیارە کەباس لە ڕەخنە دەکرێت، پێش هەموو شتێك ڕەخنەی ئەدەبی بەخەیاڵماندا دێت و هزرمان بۆ ئەوە دەچێت، نووسەر چەندین ڕەخنەی ئەدەبی نووسیبێ..

بەڵام ڕاستییەکەی وانییە، چونکە دەکرێ ڕەخنەگر، ڕەخنە لە پارچە شیعرێك یان لە چیرۆکێك بگرێت و لە ڕووی ناوەڕۆك و ڕوخسارەوە هەڵی بسەنگێنێت، هەروەها لە بارەی فۆرم و داڕشتنەوە یان لەشێوەی زمانەکەوە، تا چی بەخەیاڵدا دێت دەتوانێ شی بکاتەوەو ڕەخنەی لێ بگرێ.

دیسان دەشێ ڕەخنەی سیاسی لەسەر سیاسەتی دەوڵەت و دەستگاو ڕێکخراوێك، یان هەر کەسایەتییەك کارو کردەوەی هەر لێپرسراوێك بخاتە بەر تیشکی ڕەخنەوە. جا کە ڕەخنە لە ئەدەب و سیاسەت ڕەوا بێت، بۆ باری کۆمەڵایەتی وەك:

هەژاری و نەخۆشی و نەداری و دواکەوتوویی و نەخوێندەواری و کەمدەرامەتی باری ئابووری ڕەواتر ئەبێ پێویستی بەوە ئەبێ ڕەخنەگری ناو هەر کۆمەڵ و میللەتێك ڕەخنەی خۆی لێیان بگرێ و کەم و کورتییەکانی دیاری بکاو، ڕێگا چارەی نەهێشتنی ئەو دیاردانە دەستنیشان بکات.

ڕەخنەگر زۆرجار بۆچوونی بە ئاشکراو بێ پەردەپۆش دەردەخات و هەندێ جاریش ناڕاستەوخۆ ڕەخنەی خۆی دەگرێ خوێندەوار بەچاکی هەستی پێ دەکات کە ڕەخنەگر مەبەستی چییە.

جاری واش هەیە ڕەخنەگر بەهێماو ڕەمزو نیشانە ڕەخنە دەگرێت و ڕاستەو ڕاست ناچێتە ناو باسەکەوە، واتە بە هێما مەبەستەکەی خۆی ڕادەگەیەنێ.

ئەم هەموو شێوە دەربڕینە لە ڕەخنەگرتندا بەچەندین قۆناغدا ڕۆیشتووەو تا گەیشتووەتە ئەم ڕۆژگارەی ئێستا.

ڕەخنە بەشێوەی نووسینی چیرۆك لەناو کوردان لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە دەست پێدەکات.کە بۆ جاری یەکەم لە چیرۆکی (لەخەوما)ی جەمیل سائیبەوە هاتۆتە کایەوە.[٤٢]

ئەم چیرۆکە تا ئێستا بەیەکەم نووسینی ڕەخنەگرانە دادەنرێ لە سەدەی بیستەمدا لەباشووری کوردستاندا.

چیرۆکەکە باس لە سەردەمی دەسەڵاتی حوکمڕانی شێخ مەحموودی حەفید دەکات لە سلێمانی، بەبێ ئەوەی ناوی پاڵەوانانی چیرۆکەکە بهێنێت..

---

[٤٢] تێبینی/ بەڵام ڕەخنەگرتن بەشێوەی (شیعر) لە پێشتر بووە، بەر لە چەندین سەدە (ئەحمەدی خانی)و دواتریش (حاجی قادری کۆیی) بە شیعر ڕەخنەیان لە میرەکانی کورد گرتووە.

لە ساڵی ١٩٢٦ز بەچەند ئەڵقەیەك لە ڕۆژنامەی (ژیانەوە)دا بڵاوکراوەتەوە.

لە سەرەتای سییەکانەوە ئیتر ڕەخنەی ئەدەبی لە کوردستانداو گەشەی کرد..

برایم ئەحمەد یەکێکە لەو نووسەرە کوردانەی زوو دەستی داوەتە ڕەخنە نووسین، ئەمەی خوارەوە یەکێکە لەو ڕەخنە ئەدەبییەی لە ساڵی ١٩٣٣ز لە(یادگاری لاوان) لاپەڕە ٣٣دا، لەژێر ناوی (ئەدەبیاتی کوردی) ی بڵاوی کردووتەوە دەربارەی شاعیرەکانی کورد، تیایدا دەڵێت: ((شاعیرەکانمان هەتا ئێستا بڕوا ناکەم لە و[illegible]ای سوپاس و ستایش زیاتریان بیستبێ، یەکێك بە (تووتی شکر گوفتار) ی ئەوی تر بە (بولبوولی شیرین کلام) ناوی لێناون. هەرچەندە ئەم ناونیشانەشیان لە لاپەڕەی چ پارچە کاغەزو چ گۆشەی ڕۆژنامەیەکدا بۆ نەنووسراوە، بەڵام لە مێشکی خۆیان و هەندێ دەوروپشت و ناسیاویاندا زۆر چاك جیگیر بووە، بەڵێ هەتا ئێستا بێ لێکدانەوە هەڵمان کێشاون، لەمەشدا بیانوومان هەیە، چونکە پیاو لە تاریکیدا جوان و ناشرینی لا وەك یەکە.

لێرەدا دەبینین نووسەر، کە باسی شاعیرەکانی کورد دەکات دەڵێت:

شاعیر لای ئێمە لەپیاهەڵدان و ستایش بەولاوە شتێکی تریان نەبیستووە.

ئەوەش گوناح و تاوانی خۆمانە. هەر پێماندا هەڵگوتن و ڕێزمان لێناون و بەچاك و خراپمان هەر وتووە چاك و ڕەخنە لە شیعرەکان نەگیراوە، هەرچەندە موستەهەقی لۆمەو گلەیی و گازندەش بووبن.

ئینجدا دەگێڕێتەوەو دەڵێت:

((ئێمەش ناهەق نین، چونکە میللەتێکی نەخوێندەوارو هەژارو بێ وەی بووین و لە تاریکی چاومان کردووەتەوە، دیارە لە تاریکیشدا مرۆڤ ناتوانێ جوان و ناشرین و چاک و خراپ لەیەکتر جیا بکاتەوە، هەردوو حاڵی لا وەك یەکە)).

کاتێ نووسەر یان لێکۆڵەرەوە سەیری ئەم وتارە ڕەخنە ئامێزەو ئەو وەسفە جوانەو شیرینەی شیعر لای برایم ئەحمەد دەکات، لەو کات و سەردەمەدا کە هێشتا زمانی ئەدەبیی کوردی لە گڕوگاڵ و گاگۆڵکێدا بوو، نووسینۆ ڕێنووسی کوردی بەتەواوی جێگیر نەبوو بووو گەشەی نەکردبوو، لە کۆت و زنجیری فەرمانڕەوایی عوسمانی و عەباسی و ئەمەوی ڕزگاریان نەبوو بوو، عەقڵی مەلاو فەقێی مزگەوتەکان هێشتا ئەسیری سەردەمی کۆن بوون، پرشنگی شۆڕشی فەرەنسی بەهۆی شەڕی یەکەمی جیهانییەوە بەئاستەم گەیبووە کوردستانەکەی خۆمان. ئا لەو سات و وەختەدا دێتە سەر ئەو باوەڕەی، برایم ئەحمەد بەڕاستی مرۆڤێکی بەهرەمەندو بەتوانا بووە، بیریکی ڕووناك و ڕۆشن و هەستێکی ناسکی کەم وێنەو خەیاڵێکی فراوان و بەرین، بۆچوونێکی بەئاوەزو ژیرانەی هەبووە، لە وەسفی شیعرو شاعیرانی کورددا هەڵوێستێکی جوا مێرانەو زانستیانەی بۆ پێناسینیان گرتۆتە بەر..

نووسەر لەو وتارە بەنرخەیدا هەڵپە دەکات بەرەو قۆناغێکی نوێ و جێهێشتنی قۆناغی پێشوو، ئەو پێی وایە لەمەودوا بۆ دیاری کردنی شیعری جوان و شاعیری باش پێویستە پێوەر بگۆڕدرێ، چونکە ئیتر

ناکریٚ و کاتی ئەوە بەسەر چووە شاعیرانمان تەنها گوێیان لە ستایش و سەنا بێت و دەبیٚ لەمەودوا گوێبیستی ڕەخنەش بن. ئەو پێی وایە شاعیرەکانی خۆمان لاسایی شاعیرەکانی سەردەمەکانی ناوەڕاست دەکەنەوەو بەدوای (ڕودەکی و فردەوسی و خەیام و سەعدی شیرازی) کەوتوون و هەست بەوە ناکەن کە ئەو شاعیرانە شاعیرانی میللەتانی ترن و لە نەتەوەی ترو هی سەردەم و زەمانێکی کەن و بە زمانێکی تر شیعریان هۆنیوەتەوەو تەعبیریان لەسات و سەردەمی خۆیان کردووە، کە بەکەڵکی ئەمڕۆی ئێمە نایەن. لەبەر ئەوەی نە سەردەم و نە زەمانە ئەو سەردەم و زەمانەیەو نە زمان ئەو زمانەیە..

ئەو وا بیر دەکاتەوە، لەلاسایی کردنەوەکەشدا گۆج و ئیفلیجن، بۆیە پێویستە ئەو ڕێگاو ڕێبازە بەربدەن و بێنە سەر ڕاستە شەقامی نەتەوایەتی خۆمان و تەعبیر لە هەست و نەست و ویژدانی کورد بکەن. دەمیٚ باسی جوانی و نازداری ئافرەت دەکەن، دەبیٚ باسی کچی گوندو لادێی کوردستان بکەن، دەبیٚ ئەسپی خۆیان لەو مەیدانەدا تاو بدەن، نەك لاساییەکی کوێرانەو بیٚ مەرام دەربڕن.

شیعر بەلای برایم ئەحمەدەوە وێنەیەکی ژیانە لە ڕاستیی ئەزەلییەوە وەرگیراوەو، ئاوێنەیە ناشرینی تیا جوان ئەبینریٚ و سەرچاوەیە تا ئەبەد جوانی و ژیری لیٚ هەڵدەقوڵیٚ. پەچە لە ڕووی جوانییەکی شاراوە لا دەدات، لە وتارەکەدا بەتووندی ڕەخنە لە شاعیرانی کورد دەگرێت و دەڵێت:

((وەرە شیعرێکی دڵداری شاعیرەکانمان بخوێنەرەوە.. کە ئەمە بەشی هەرەزۆری خەرمانی شاعیرانە، ئەگەر شێوەی ژنێکت هاتە یادەوە، پێم بڵێ چ ژنێکە؟ چینی؟ هیندی؟ ئەفغانی؟!.. نازانم هەرچی بێ ژنێکی کورد نییە. بەڵێ ناهەقیان نییە ژنی کوردیان نەدیوە؟!.. مەرِدۆشین و مەشکە ژەنینیان بەشەدەی لاریەوە، گۆزە لەسەر شانیان نەبینیوە لەکانی بێنەوە))

ئەم وتارە ڕەخنە ئامێزە ٦٩ ساڵ لەمەوبەر نووسراوە، دەربارەی شیعرو شاعیران ڕەخنەی لێگرتوون، چونکە لاسایی شاعیرەکانی بێگانەیان کردووەتەوەو باسی جوانی سروشتی کوردستان و لارو لەنجەی ئافرەتی کوردستان و کێشە کۆمەلایەتییەکانی خەڵکی کوردستانیان نەکردووە. هەر لەبەر ئەوەشە وا پێ دەچێ بەم خاك و خەڵکە نامۆ بن.. جا بۆیە داوایان لێ دەکات شێوەی شیعر بگۆڕن بۆ ئەوەی لەگەڵ ڕاستی کۆمەڵی کورەواریدا بگونجێ.

ئەم نووسەرە ڕوناکبیرە دوای ئەوەی ڕەخنەی چاکی لە شاعیرانمان گرتووە، ئاڕاستەی باشیشی کردوون و داوای لێکردوون ناوەڕۆکی شیعرەکانیان لە ڕاژەو خزمەتی نەتەوەکەیاندا بێت، بیری فەلسەفی تیا بێت، تابلۆی شیعرەکانیان لەوێنەو خەیاڵێکی ڕەنگاوڕەنگدا بنەخشێنن.

دیارە (یادگاری لاوان) و دواتر (دیاری لاوان) ڕۆڵی بەرچاویان بینیوە لە هاندان و جۆشدانی ئەدیب و شاعیران و ڕۆشنبیران و سیاسەتمەداران بۆ خزمەتی ئەدەب و زمانی کوردی.

ئەگەر بێتوو سەیری لاپەڕەکانی ئەم دوو کۆمەڵە بەرھەمە بکەین، دەبینین بەزۆری شیعرو وتاری بایەخداریان تیا بڵاوکراوەتەوە، بەکوردییەکی پاراوو ڕەوان و جوان.

ھەستێکی ناسك و بیرێکی نیشتمانی و نەتەوایەتی تیاد ا بەدی دەکرێ، لەوانە شاعیرانی گەورەی کورد (گۆران، عارف تاڵەبانی، شاکیر فەتاح، برایم ئەحمەد، جەمال مەجید سەلیم، موحەمەد عەبدولڕەحمان پاشا، د. عەبدولڕەحمان عەبدولا، زێوەر، فایەق بێکەس، تۆفیق وەھبی بەگ، موحەمەد ئەمین زەکی بەگ).

لە (یادگاری لاوان)دا ئەم بابەتانە دەبینین:

(شین بۆ گوڵێ)، (ژن)، (شەو)، (یادگارو ھیوا)، (سەربەستی منداڵ)، (ھەوری پایین)، (دەردو دەرمان)، (ئەدەبیاتی کوردی و شاعیرەکانمان)، (سکاڵا لەتەك مانگ)، (کانی ژنان). لەگەڵ دوو چیرۆکی پڕ لە پێزو چێژو مانا. نامیلکەکە ٨٠ لاپەڕەی داگیر کردووە.

شیعرێك و وتارێکی دوورو درێژی برایم ئەحمەدی تێدایە کە بە ھەردووکیان زیاتر لە (١٨) لاپەڕەیان گرتووەتەوە، واتە چواریەکی گۆڤارەکە، لەلایەن برایم ئەحمەدەوە نووسراوە. ئەمەش دەشێ بکرێتە بەڵگەی ئەوەی بڵێین ڕۆڵی سەرەکی تیا بینیوە.

(دیاری لاوان)) کۆمەڵێك وتارو شیعرو چیرۆکی گرتووەتە خۆ. لە لاپەڕەی یەکەمدا ئەم شیعرەی شوکری فەزلی تیا بڵاوکراوەتەوە:

***سەرەتـای ئیش هەموو یەکبوونە ئەویش نـابێ هەتـا***
***هەر برینێ کەلە دڵدا هەیە سارێژی نەکەی***

ئاشـکرایە ئـەم شـیعرە کـاتی خـۆی شـوکری فـەزلی بـۆ جـەنابی شـێخ مەحموودی مەلیکی کوردستان ناردووە. لاوانی کوردی بۆیە ئەو شیعرەیان بڵاوکردووەتەوە، وەکو داوایەك بۆ گەلی کورد بۆ یەکبوون.

لە پێشـەکیدا هـاتووە (• ئەوا پشت بەگـەورەیی خـواو یارمـەتی هـەندێ مـەزنان و خـاوەن بـیرەوە، ئەمسـاڵیش توانیمـان بـەناوی (دیـاری لاوان)ەوە دیارییـەك پێشـکەش بکـەین، هیوامان وایـە ئـەم تەرحـە نوسـینانە کـەڵکیان هەبێ بۆ گەلەکەمان))، لە ژێرەوە نووسراوە (لاوان).

چیرۆکەکانی برایم ئەحمەد زۆربەی زۆری ڕەخنەگرانەیەو لەبارەی باری نالەباری کۆمەڵی کوردەواری‌یەوە دەدوێت.. ئێمە بۆیە زۆر لەسەر ئەو وتارە ڕۆیشـتین چونکە یەکـەم وتـاری بڵاوکـراوەی بـەر لـە٦٩ سـاڵی بـووە، کەلـەو سـەردەمانەدا بەدەگمـەن شـتی لـەو چەشـن و جـۆرە نووسـراوە. دواتـر لەڕۆژنامەو گۆڤاری (گەلاوێژ)دا چەندین وتـارو چیرۆکی نووسیوە بەناوی خوازیارەوە.

زۆربەی چیرۆکەکانیشـی هـەر ڕەخنـەن لـەدامودەزگاکانی ئەو سـەردەمە، کەچۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خـەڵکی هـەژارو بەلـەنگازدا دەکـردو دەیـان ڕووتاندنەوەو دەیان چەوساندنەوەو پارەوپوولیان لێ وەردەگرتن و زوڵمیان لێدەکردن...

برایم ئەحمەد گەڵێك پارچە پەخشانی هەیە بەتەواوی ناچێتە ناو خانەی چیرۆکەوە. دەبێت خانەی تایبەتی بۆتەرخان بکرێت، بەڵام لەڕووی بیرو دارشتنەوە نموونەی جوانی کوردی نووسینن بۆ نموونە:

(شیرین لەسەرەمەرگا) وتارێکی تری برایم ئەحمەدەو وەصفی کچێکی (شیرین) ناو دەکات لەکاتی مردن و گیانەڵادا. پارچە پەخشانێکی جوان و ڕەخنە ئامێزە لەمەڕ مردن و باس لەئاوات و خواستی ژیان دەکات لای شیرین ئەوەتا لەکۆتاییدا دەڵێت:

(شیرین پێیەکی لەم دیو دەروازەی مەرگەوە، دەستێکی بەچڵی وشکی هیواوە و ئەو دەستی بەلق و پۆپی درەختی بەهەشتەوە، بەڵام چڵە وشکەکەی هیوای لەدرەختە سەوزەکەی بەهەشت توندتر گرتبوو) (لەبەری بەیاندا)[٤٣] وتارێکی پەخشان ئامێزە باس لەوەسفی بەیانیان دەکات و ڕەخنە لەنەخوێندەواری دەگرێ و ستایشی خوێندەواری و زانست دەکات و خەڵك هان دەدات دوای نەزانین نەکەون و بەرەو ڕوناکی خوێندەواری بڕۆن و دەڵێت:

(بەیانیان لەجریوە جریوەی چۆلەکە پاساری لەئاوازی دڵ نەوازی و بولبول لەخەو ڕاست ئەبێتەوە. دڵمان ئەکرێتەوە....تاد، ئینجا دەڵێت: لەبەیاندا بەهار بێ و نزیك بەسەرچاوەی (زەڵم) یالەڕاستی (دواوان) لەژێر ڕەشماڵا بەهارە هاڕی ئاوی ئەو چەمانە خەبەربێتەوە گوێ لەکناچەی پۆڕو

(٤٣) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٣٠، لە ١٤ تەمموزی ١٩٣٢، نووسینی: سیاپۆش.

زەمزەمـەی بولبـول و قاسـپەی کـەو بگـری و بنواڕیـە ئـەو دەشـتە کـەتارای ئەرخەوانی پۆشیوەو وەکو گەورەیەکی کورد فەرمویە:

- *لەورشەی شەونم لەتۆی پەردەوە.*

- *نەرگس بەسستی چاوی کردەوە.*

شەونم لەسەر گیا، کەو لەچیا، بولبول لەسەر گوڵ بێتە جونبوش.. تاد.

دیسان دەڵێ (هەنگ پورەبدا، گوڵ و شیرینی و میوە بمژێ بیکەنە شانەو نیشانە، پـێ نیشـانی ئێمـەی بدەن، بـەویزە ویـزە تێمـان بگەیـەنن کەبـەری تێکۆشین و تەقـەلای دەرئامـەد چەند شیرینە.. ئۆف هـەموو شـتێ شـیرینە، نـاهومێدی نـەبێ تاڵـە، خوێنـدەواری بـۆ پێشـکەوتنی میللـەت ئەساسـە. نەخوێندەواری کەساسە[٤٤])

لـەم وتـارەدا پێمـان دەڵـێ، هـەموو شـتێ لـەدوونیادا شـیرینە، خۆشـە، ڕەنگینە...

تەنها نائومێدی نەبێ، نەخوێندەواری نەبێ، کەساسی و دواکەوتنە.

دیارە ئـەو دوو پەتایە کۆمەڵی کـوردەواری تـەنیوە، وەکو هـەوری ڕەش ئاسمـانی کوردسـتانی داپۆشـیوەو غەموپـەژارەی بەسـەردا بـاراندوەو پێویستە پڕەوێتەوەو بەرچاومان ڕووناك بکرێتەوە...

(شین بـۆ گوڵـێ) وتارێکە لەڕۆژنامـەی (ژیـان)دا بڵاوکراوەتـەوە لەلایـەن برایم ئەحمەدەوە نووسـراوە، (گـوڵ) هێمایـە بـۆ گـەلی هـەژارو لێقـەوماوی

[٤٤] ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٣٠، لە ١٤ تەمموزی ١٩٣٢، نووسینی: سیاپۆش.

کوردو دەنوسێت:[٤٥] (هەژار: گوڵە سیسەکە تۆش وەکو من لێقەوماوی تۆ دوێنێ ڕەنگین و خەندان، تەڕوتازە بەجلی خۆتەوە ئەشەکایتەوە. منیش شادو ڕووخۆش بەدەم شنەی ژینەوە ئەشنامەوە، تۆ دەستی زۆرداری چڕیتی، من گێژەڵوکەی غەم لەبێخ وبنی هەڵکەندم، تۆ دوێنێ جوانی گوڵشەن بووی، شەونمی خاوێنی سەرلێوت پێشکەش ئەکرد بۆ مرواری ملی پەرستاری خۆشەویستن، منیش فرمێسکی چاوم پێشکەش ئەکرد بۆ گەردانەی گەردنی شیرین، تۆ ئەمڕۆ سیس بووی پەڕەکانت بەسەریەکدا چووە گەڵێ گەڵات وەریوە، شیوەن پەشێواوەو ژاکاوییی، منیش غەم تێکی شکاندووم، هێزی ئەژنۆم نەماوە... تۆ دوێنێ بولبولی خۆش ئاواز بەڕووتەوە پێ ئەکەنین، سۆزەی بەیان پرچی ئاڵۆزاوی شانە ئەکردی... منیش لەئاسمانی خۆشەویستیدا تاقی ئەستێرەیەکی پرشنگدار بووم.. تاد).

بەم شێوەیە لەسەری دەڕواو لەکۆتایدا دەنوسێت: (گلۆڵەمان کەوتە لێژی، هیچ دڵت لەخۆت نەمێنێ تۆ دەست لەچڵێ بەرنەدەی من لەهەزار، تۆ بەهێوای شەونمی خاوێن و پرشنگی ڕۆژو شنەی نەسیمی' من بەهیوای هەزاری وام، مەمێنە، بمرە بابەس ڕووی گرژو مۆنی گەردوون ببینی، بەس).

---

[٤٥] ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٣٤، لە ٢٨/٨/ ١٩٣٢، برایم ئەحمەد.

ئەم پارچە پەخشانە پڕ مانایە باس لەهەژاریو لێقەوماویو ماڵ ویرانی کورد دەکاو بەراورد لەنێوان دەردی دڵی خۆیو دەردی گوڵێك دەکات، کەسیسو ژاکاوبووەو کۆستی زەمانە چیبەسەر هەردووکیان هێناوە.

گوڵەکە سیس هەڵگەڕاوەو تەڕی تێدا نەماوەو وردە وردە پەڕەکانی هەڵ دەوەرێو دەکەوێتە سەرزەوی، ئەمیش دڵی غەمباری پڕ لەئارەزووی تێکشکاوەو تووشی هەزاران دەردیسەری هاتووەو نازانێ دادو هاوارو فیغان بۆ کوێی بەرێو ئێشو ئازاری کەم بکاتەوەو لەنەهامەتیو دەردی سەری ڕزگاری بکاتو ژیان بەبەریدا بکات. کێ دەتوانێ گوڵە هەژارەکە لەهەڵوەرینو پووکانەوە ڕزگار بکات، بەکێ دەکری ئاوی ئەو گوڵە بداتو ڕەگو ریشەکەی ببوژێنێتەوەو نەهێڵێ چیتر هەڵوەرێ، ئەو ڕازو نیازە کێ دەتوانێ بۆی جێبەجێبکات؟ دیارە ئەوە تەنها بەهەوڵو هیمەتو خۆماندووکردن دەبێتو پێویستی بەئازایەتیو توانا هەیە.

**ئاواتی دڵ: (گەشتێک بەسەر باڵی پەڕندەی خەیاڵەوە)[٤٦]:**

ئەم وتارە بریتی‌یە لەسی‌بەش و بەسێ ئەڵقەو لەسی ژمارەی ڕۆژنامەی (ژیان)دا بلاوکراوەتەوە، بریتی‌یە لەبیروخەیاڵی فراوان و بلاوی نووسەر لەباسی کاروکردەوەی پەروەردگار، کەچی دروستکردووە.

چۆن ئادەمیزاد لەسەر گۆی زەوی پەیدابووەو کردەوەی مرۆ چۆنەو ئادەمیزاد خۆی چی بەسەر ئادەمیزاد هێناوەو دەنوسێت.

(لەپاش ئەوەی زەمین بەباری خۆیا سوڕا، لەپاش ئەمەی تیشکی ڕۆژی ڕاستیی تاریکی پێچ‌وپەنای زەوی بۆ ڕووناك کردنەوە... تاد)[٤٧].

تەماشای ئەملاوئەولای خۆمم ئەکرد، لەڕێگادا شتی‌وام ئەدی سەرم سوڕ ئەما واقم وڕئەما، ئینجا لەکون‌وقوژبنی ڕاستەقینەی زەویدا کنەم کردو باش ئەملاوئەولایم پشکنی... تاد). لەبەشی دووەمدا دەڵێت: (ئەمانەت هەموو بۆ خۆشی و دڵشادی ئەوان دروست کردووە– مەبەستی پەروەردگارە بۆ ئادەمیزاد دروستی کردووە).

ئەمانەت هەموو بۆ تێربوونی سکی ئەوان هێناوەتە بەرهەم، گوایە هێشتا ئەبێ بەرچاوتەنگبن؟! لەسەر پاروویەك بەگژ یەکدا بچن؟ لەسەر بستێ زەوی چاوی یەك دەرهێنن؟! قەلاچۆی یەکتر بکەن؟ منیش هێشتا ڕووم لەئاسمان

---

(٤٦) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٥٥، لە ٢ی مارت ١٩٣٣.

(٤٧) ڕۆژنامەی ژیان، ژمارە ٣٥٦، لە ٩ی مارت ١٩٣٣.

بوو هەرچەند بیرم ئەکردەوەو سەرم ئەهێناو سەرم ئەبرد لەسەروکاری ئەمە نەئەگەیشتم).

لەبەشی یەکەم و دووەمدا باس لەکاروکردەوەی خودا دەکاو بەهزرو خەیاڵی خۆی دەیەوێت تێبگا، خوای گەورە ئەم ئەرزو ئاسمانەی دروست کردووەو ئەم هەموو خۆشی ژیانەی داناوەو سەدان جۆر میوەجاتی بۆخۆشی ئادەمیزاد هێناوەتە کایەوە، کەچی دەبینین هەرئادەمیزاد لەسەر یەك پارووە نان، یان لەسەر یەك بستە زەوی، یان لەسەر یەك شتیبچووك یەکتری دەکوژن و ئاسەواری یەکتری دەبڕنەوەو یەکتر قڕدەکەن، بەبێئەوەی ئەم تێبگات و بزانێت مەسەلەکە چییەو بۆچی ئەم هەموو خۆشی ژیانەی بەخشییوە، بەڵام ئادەمیزاد چاوی تێر نابێت و ڕاناوەستێ و پەلاماری یەکتری دەدەن. بۆئەوەی لەم پەندۆ حیکمەتە بگات و لەم سەرسامیە ڕزگاری ببێ و تێبگات ئەم گێرمەوکێشمەیە چییەو لەچییەوە هاتووە، لەبەشی سێیەمی باسەکەیدا ڕوونی دەکاتەوە خەیاڵ دەیگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار...

لەخزمەتی پەروەردگارەوە سەیری ئەرزو ئاسمان دەکات و تێدەگات مەسەلە چییە؟.. بەم شێوەیە دەدوێ[٥٧]

(لەپاش کشانی ئەو ئەستێرانە، بەهەزاران گیانی گیانلەبەران لەزەویەوە ئەهاتنە ئاسمان، ئەیان زریکاند، ئەیان قیژاند، ئەیان ناڵاند... . یەکێ ناڵەناڵی نەخۆشی لەبرسامردنی بوو، یەکێ شین وزاری کوڕە کوژراوی

بێ‌تاوان و کچە مردووی بەسەزمان و هەتیوباری بوو. یەکێ ئاهە ئاهی ناخۆشی ناو زیندان، زیندانی دەستی دەم بەدان و بەد ناوانی بوو، یەکێ دڵ شکاو و ڕوو هەڵماڵدراوی ژنان و گەورە کچانی بوو، یەکێ هەناسە ساردی ڕەنجەڕۆیی و کاروفەرمانی بوو، ... ئیتر من حەپەسام، بڕستم بڕا، نەمزانی بەکوێ‌دا بڕۆم و بەکوێ‌دا دەرچم؟! لەهەرشوێنێکەوە سەرنجم ئەدا ڕەشە ئاهی دەردی دەروونێك بوو ئەچوو بەئاسماندا، بۆ هەرشوێنێك ئاوڕم ئەدایەوە زریکەو هاواری دڵ خورپاوێك، سەربڕاوێك بوو. لەهەرلایەك گوێم ئەگرت، قیژە بوو زریکە بوو ناڵەناڵی بوو، ئۆف و ئاخ بوو شیوەن و قوڕپێوان بوو.... پاشان هەرئەوەندەت ئەزانی ئاگرێکی بێ‌سامان لەسەر زەمینەوە کڵپەی ئەکرد، گڕی ئەگەیی‌یە کەش کەشان، بەجارێ هەزاران ماڵی گوناهبارییان وێران ئەکرد. بەهەزاران خانوی تێك ئەدا، بەملیار شارانی نوقمی ئاو ئەکرد ولاتانی ژێر بەرەژوور ئەکرد..).

ئەم وتارە پڕ بایەخە، بریتی‌یە لەخەیاڵی نووسەر بەرانبەر کاری پەروەردگار لەدروست کردنی ئادەمیزادو ئەرزو ئاسمان و ستەمی مرۆ بەرانبەر بەمرۆ ئەو کارەسات و شەڕو دادو هاوارەی ئادەمیزاد هیچی سوودی نی‌یە.

دیارە نووسەر لێرەدا مەبەستی کوردستانەو ئەو مەرگەساتەی خەڵکی ئەم دەڤەرە تێیدا دەژی، بۆیە دەڵێت کەس بەهانای لێقەوماوان و سك سوتاوان و ئاهوناڵەی ئاوارەو دەربەدەران نایەت، تالەهەر چوارلاوە –

مەبەست چوار چارچەی کوردستان- کڵپەی ئاگرێکی بێئامان واتە- شۆڕشێکی سەرتاسەری - هەڵگیرسێنێ بەجارێ تەخت و تاراجی گوناهکاران و ستەم کاران وێران بکاو دامودەزگاکانیان تێکوپێک بداو میللەتی ژێردەست و ئاوارەو زۆر لێکراو سەرنج و گوڕی زۆرداران گوم بکاو کۆمەڵی هەژارو زۆرلێکراو بحەسێتەوە.

بەئاشکرا دەردەکەوێ، نووسەر هەرلە وتارەکانیدا ڕەخنەگر نەبووە، بەڵکو زۆر لەچیرۆکەکانیشی ڕەخنە ئامێزن و بەتوندی باری سەرنجی خوێندەوار بۆ ئەو مەبەستە ڕادەکێشن. بۆ وێنە بێتو سەیری چیرۆکی (کەرەلۆتی مەنوچەر)[٤٨] بکەین، دەبینین ئەم چیرۆکە وێنەیەکی تراژیدیای لاوێکی کوردەواریەو باسی ژیانی جوتیارێکی هەژاری دەست کورت دەکات، کەبەدەست دەرەبەگی گوندەکەیان و میریی ئەو سەردەمەوە تووشی چ نەهامەتی و مەرگەساتێکەوە هاتووەو، چ دەردێکیان داوەتێ. بەختوخۆڕایی ئەوەی بم جوتیارە هەژارە کراوە، بابەدەواری شەڕی نەکردووە.

ئەم چیرۆکە یەکێکە لەچیرۆکە هەرەباشەکانی برایم ئەحمەدو تابلۆیەکی ڕاستەقینەی ژیانی لادێی کوردستانە، بەتایبەت لەوسەردەمەدا کەهێشتا لەگوندەکان قوتابخانە کەمبوو خەڵك نەیدەوێرا لەپێستی خۆیدا

---

[٤٨] لە ساڵی ١٩٤٥ نووسراوە -کوێرەوەری- چیرۆکی کەرە لۆتی مەنوچەر- چاپخانەی نەجاح، بەغدا ١٩٥٩.

بجووڵێتەوە فەرمانبەرەکانی دەولەت مشەخۆرو بەرتیل خۆربوون، ئاوەکە لەسەرچاوەوە لێڵ بوو. هەربۆیە مەنۆچەری جوتیار تەلاقی خواردبوو لەهیچ فەرمانێکی میریدا قسەنەکاو بۆهیچ شتێك ڕوونەکاتە سەرای حکومەت.

بەڵی لەبەر زوڵم وزۆری میری، کەتەواو جاڕزو بێزاریان کردبوو، لەوەلامی (جەوهەری) فەرمانبەری میردا گوتی: _بەگم مەزانە من قوتابی دەردو ئازارو مەینەتیم، پەروەردەی زۆرداری و چەوساندنەوەو بەندینخانەم، ڕۆژگار دەرسی داداوم و زۆردار بەکردەوەی ناشرینی بێئەندازەی هانیداوم...)[٤٩].

بەڵی بەسەرهاتی ئەم ڕووداوە کەلەم چیرۆکەدا هاتووە، پتر لەڕووداوێکی ڕاستەقینەی کوردەواری دەچێ، کەچ مەینەتی و دەردەسەری و ئازارێکیان بەدەست میری و دەست وپێوەندەکانیەوە لەئاغاو بەگزادەو میرو گزیر کێشاوە. بۆیە دەبینین، ئەم چیرۆکە لەساڵی ١٩٤٨ز لەسلێمانی لەلایەن کۆمەڵێك هونەرمەندەوە نمایش کراو خەڵکی شار بەتاسەو ئارەزووەوە دەچوونە سەیرکردنی و دەنگیدایەوە. کار گەیشتە ئەوەی کاربەدەستانی ئەو سەردەمە زۆر سەغڵەت و ناڕەحەت بن[٥٠].

---

[٤٩] پرۆفیسۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ پێی وایە برایم ئەحمەد سونبولی یەکخستنەوەی هێزە سیاسییەکانی کوردستان و عێراقی بووە، کاتێ ناکۆکی ڕوویداوە لەنێوان پارتی و شیوعی، لە یەکخستنەوەیاندا ڕۆڵی گرنگی هەبووە.

[٥٠] پرۆفیسۆر د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ دەڵێت:

((کە دەڵێن برایم ئەحمەد سونبولی یەکخستنە، کەوا بینیمان کاتێ کە جاروبار ناکۆکی لەنێوان پارتییەکان و شیوعییەکاندا دەبوو، کەچی برایم ئەحمەد بەجۆرێکی تر دەردەکەوت، بۆ

### چیرۆکی خازێ:

ئەم چیرۆکە باس لەجەوروستەمی کۆمەلایەتی دەکات. واتە دەربارەی دەردی ژنان لەکۆمەڵی کوردەواریدا...

بەوبۆنەیەوە ڕەخنەی توندوتیژ لەو بارودۆخەی ناو کۆمەڵی کوردەواری دەگرێت، کەهیچ یەکسانی کۆمەلایەتی تێدانییە. ماڵە ئاغاو بەگزادەکان چۆن مامەڵە بەچارەنووسی خەڵکی هەژارەوە دەکەن نەوو نەمامێکی وەکو خازێ دەبێتە قۆچی قوربانی داب‌ونەریتی کۆنەپەرستانی کۆمەڵ‌و نەبوونی یاسای بەرهەڵست‌و ڕێگر لەبەرامبەر ئەم جۆرە کردەوانەی نێو کۆمەڵی کوردەواری...

### چیرۆکی کوێرەوەری:

باس لەکوێرەوەری خەڵکی لادێی کوردستان دەکات، کەدوو سێ لادێی ڕەش‌و ڕووت لەسەر بەردەنوێژی مزگەوتی دێیەکەیان لەژێر سێبەری دارە ڕەشەکەیا دانیشتبوون سکالایان ئەکرد، گلەییان بوو لەدەست چڵێسی‌و چاوچنۆکی‌و تەماعکاری سووخۆرو دڵسەختی خوانەناسی خاوەن موڵك، برسێتی‌و ڕووتی‌و دەست کورتی‌و بێدەرامەتی خۆیان... ئەم چیرۆکەش

نموونە: کە زۆر موناقەشە لەنێوان ئەو دوو لایەدا لەساڵی ١٩٤٨ز لەسەر گەلێك مەسەلە تیژ بوو، ئەحمەد غەفوور لێپرسراوی حزبی شیوعی بوو لە سلێمانی‌و (جەمسەرێکی تیژ) بوو، کەچی لە دوو چیرۆکی (کەرە لۆتی مەنوچەر)و (کوێرەوەری) شانۆگەرییەکی درووست کرد، شیوعییەکان بەپێشرەوی هونەرمەند (ڕەئوف یەحیا) لەسەر شانۆ مانگێك زیاتر پیشانیان دا، تا میری قەدەغەی کرد. بەم جۆرە هەردوولای یەکخستبوو.

وەك چیرۆکەکانی تری برایم ئەحمەد باسی ژیانی کولەمەرگی و سەختی جوتیاران دەکات، باسی سوغرەو غەدرو زۆرداری خاوەن موڵك و نۆکەرەکانیان دەکات، ڕەخنە لەیاسای دەرەبەگایەتی و بێدەنگی میری دەگرێ، کەبەبەرچاوی حکومەتەوە ئەو هەموو زۆرداری‌یە لەجوتیاران دەکرێ و ئارەقی نێوچەوانیان و هێزو توانای بازوویان بۆ خاوەنموڵکەو ئەمانیش هەژارو برسی و ڕووت و ڕەجاڵ و بێدەرەتانن.[٥١]

ئەم چیرۆکە لەڕووی هونەرو داڕشتنەوە پایەیەکی بەرزی بۆ خۆی پاراستووە. هەروەها لەڕووی سەلیقەو جوانی ووشەو ڕازاندنەوەی ڕووداوەکە لەڕیزی چیرۆکە بەرزەکانی جیهانی دادەنرێ.

لەڕووی زەمانەوە برایم ئەحمەد بەڕاستی نەقارێکی پسپۆڕو شارەزا بووە لەڕێکخستنی خشتەکانی لەسەر یەك و دیوارێکی ڕێك و پێك و ڕازاوەی دامەزراندووە، سەکۆیەکی بەرزو بڵندی هونەری بنیات ناوە، بەقووڵی چۆتە ناو دڵ و دەروونی خەڵکەوە...

ئەم چیرۆکە دوای ئەوەی لەشاری سلێمانی لەلایەن هونەرمەندانەوە نمایش کرا، ناوبانگی دەرکردو کۆمەڵانی خەڵکی بەزۆردارو زۆرلێکراو هوشیارو وریا کردەوە حکومەتی ئەو سەردەمەش ئاگر لەکەوڵی بەربووو ناچار ڕێی لێگرت و قەدەغەی کرد. بەڵی ڕاستە کەدەڵێن (هونەری شانۆ قوتابخانەی کۆمەڵانی خەڵکە)

[٥١] چیرۆکی کوێرەوەری- برایم ئەحمەد.

# شیعر لای برایم ئەحمەد

شیعر وەك بەشێك لەئەدەب ئاوێنەی کۆمەڵ و سەردەمەکەیەتی. هەست و نەستی ئەوان دەردەبڕێ لەشێوەو دیمەن و تابلۆیەکی قەشەنگی جوان بەهەست و سۆزو خەیاڵێکی پڕلەتاسەو وشەی شیرین و وەزن و قافیەدار.

دیارە شیعر زۆر کۆنە لەناو میللەتانا، لەناو کوردیشا لەدێر زەمانەوە هەبووەو بەشێوەی گۆرانی و لاوك و حەیران و بەستە وتراوە. لەکاتی دروێنەو ساوەر کوتان و گێرەو زبارەو گیشەو سوارەو دەستاڕو مازو چنین و ڕێواس و کنگرو تۆڵکەو کوارگ و دومەڵان و ووشی و پەرێزدا...

هەروەها لەکاتی شایی و مەرگەساتداو مردن و شیوەن و لاواندنەوەو واوەیلادا، بەدەنگ و ئاوازی خۆش شیعر خوێندراوەتەوەو هەست و سۆزی کۆڕو کۆمەڵی بزواندووە.

بەڵام لەبەرئەوەی کورد کیانی نەبووە، ژێر دەست و ژێر چەپۆکی عوسمانی و ئێرانی و پێشتر ئیسلامی‌یە عەرەبەکان بووە، هەستی نەتەوایەتی کزو لاواز بووە، خوێندەواری کەم بووە، بۆیە دەبینین زۆربەی زۆری شیعری شاعیرەکانمان گوم بووەو لەناوچووەو شوێنەواری نەماوە... یان بەزمانی بێگانە شاعیرەکانمان شیعریان داناوەو ئەو شیعرانە بووە بەموڵکی ئەو نەتەاونە.

تــانزیکی چوارســەد ســاڵ لەمەوبەرکــە (ئەحمــەدی خــانی)و (مــەلای جزیـری)و (فـەقێ تـەیران) توانیـان ئـەو ڕێچکەیـە بشـکێنن و شـیعر بـەزمانی زکماکی خۆیـان دابنێن و تۆماری بکەن و لەفەوتان و لـەناوچوون بپـارێزن. دواتریش لەچەرخی نۆزدەهەم کەڵە پیاوی وەك نالی و حاجی قادری کۆیی و سالم و حەمدی و مەولەوی و بێسارانی و خانای قوبادی....... هاتنە مەیدانی شـیعرەوەو ناوبانگیـان لەهــەموو کوردســتان دەنگی دایــەوە. لەچــەرخی بیســتەمدا شـیعری کـوردی زیـاتر گەشـەی کـردو کەوتـە ململانــێ لەگــەڵ شاعیرانی تورك و عەرەب و فارس. بەهەوڵ و هیمەت و پاراو بەهرەی بلیمەتی شاعیران، بەتایبـەت (گـۆران)ی تونـدو لوتکـەو، شـێخ نـوری شـێخ صـاڵح و پـیرەمێردو زێـوەرو بێکـەس و قـانع و دیـلان و کامـەران و هـەردی و هـەژارو عەبدوڵا پەشێوو هێمن و شێرکۆ بێکەس و لەتیف هەڵمەت ... تاد.

بەرهـەمی زۆرو بـەهرەی هونـەری ئـەم شـاعیرانە خـەرمان و سـامانی لـەبن نەهاتووی میللەتەکەمانەو تادونیا دونیایە، نەوە لەدوای نەوە شانازی پێوە دەکەن.

ئێمــەی کــورد بەڕاســتی قــەرزداری ئــەو شــاعیرانەمانین، چونکــە شــیعرەکانیان هــاندەرو ڕێپیشــاندەری نەتەوەکــەمان بــوون لەســەردەمی ژێردەستی و نەهامەتی و لەکاتی شۆڕش و ڕاپەڕین و بەرخودان دا.

برایم ئەحمـەد لەدەیـەی دووەمـی چـەرخی بیســتەم لـەدایك بـووە واتـە- لەســەردەمی شــەڕی یەکــەمی جیـهانی و ســەرهەڵدانی دەوڵــەتی نەتــەوەیی لەناوچەکەداو دامەزراندنی حکومەتی کوردی لەشاری سلێمانی....

بەشۆڕشەکانی سمکۆی شکاك و شێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودی نەمر... چاوو گوێی کراوەتەوەو هەستی نەتەوایەتی بزواوەو جولاوە. وەك لاوێکی ژیرو هوشیار شانبەشانی شاعیرانی سەردەمەکەی خۆی.... دەستی کردووە بەنووسینی وتارو شیعرو چیرۆك و ڕەخنەو وەرگێڕان لەئەدەبی بێگانەوەو دواتر مەیدانی ڕۆژنامەگەری و سیاسەتەوە.

هەرچەندە تائێستا دیوانێکی شیعری چاپکراوی نییە، بەڵام کۆمەڵە شیعرێکی سیاسی بڵاوکراوەی هەیە گەرچی شیعرەکانی کەمن و ژمارەیان لە(٢٠) پارچە تێپەڕ ناکات، بەڵام ئاستی هونەری زۆر بەرزەو زمانێکی ڕەوان و پاراوو ناوەڕۆکێکی بەهێزو ڕوخسارێکی نایابیان هەیەو لەڕیزی شیعری شاعیرە بەرزەکان دادەنرێن..

هەندێك لەشیعرەکانی کراونەتە گۆرانی و گۆرانیبێژە ناودارەکانی وەکو (تایەر تۆفیق)و .... بەگۆرانی دەیڵێن.

هەندێکی تریان بوونەتە سروودی نیشتمانی و مارشی نەتەوەیی و لەئێستگەو تەلەفزیۆنە کوردییەکان دەگوترێن[٥٢].

شیعرە بەناوبانگەکەی برایم ئەحمەد (یادگارو هیوا) لەیادگاری لاوان لە ١٩٣٣/٣/١٠ز لەلاپەڕە ١٣-١٩ بڵاوکراوەتەوە. کاتی خۆی، ئەم شیعرە لەناو خوێندەوارو ڕۆشنبیرانی کوردیدا دەنگیدایەوە، شیعرەکە (٣٦) کۆپلە شیعری چوارینەیە... سەرەتایی شیعرەکە بەم چوارینەیە دەست پێدەکات:

***لەبەرچاوی بەد لەترسی بەدکار***

***دڵی خۆم ئەکەمە کۆڕی یادگار***

---

(٥٢) یادگاری لاوان، ساڵی ١٩٣٣، ل١٣-١٩ و گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٠ ساڵی یەکەم ١٩٤٠.

*بەگریانی ووشك بەناڵەی بێدەنگ*

*دێنمە لەرزین تەختی کردگار*

شیعرەکە بەم کۆپلەیە کۆتایی پێ‌دێنێت:[٥٣]

*چاوە وەك لێزمەی بارانی بەهار*

*فرمێسکی خوێنیت بۆ پیا دێتەخوار*

*گریان کردەوەی بێدەسەڵاتە*

*بێدەسەڵاتان ئەرزێن لەژێر بار*

بەلای ئێمەوە، ئەم شیعرە دەوری هەبوو لەبەناوباگ کردنی برایم ئەحمەد لەمەیدانی شیعرو ئەدەبدا، چونکە شیعرەکە تابلۆیەکی بەرزوبڵندە لەهەست‌ونەستی مرۆڤی کورد بەرانبەر ئارەزوو ئاواتەکانی بۆ ئازادی لەژینی ئەسارەت‌و ژێر دەستی.

شیعرەکە هاندانە، جۆشە، خرۆشە بۆ ڕاپەڕین‌و تۆڵە سەندنەوە لەدوژمنان‌و داگیرکەرانی نیشتمانەکەمان.

لەکۆپلەی بیستەمدا دەڵێت:

باخواردنەوەی ئێمە فرمێسکی چاو بێ‌و خۆراکمان بادەردوغەم بێت، چونکە ئێمە لەدوایدا لەخوێنی دوژمن تێردەخۆین.

برایم ئەحمەد شاعیرێکی نیشتمان پەروەرو شۆڕشگێر بووەو لەشیعرەکانیدا کەم باسی جوانی ئافرەت‌و سروشتی کردووە، زیاتر شیعری

---

[٥٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٩ ساڵی چوارەم ١٩٤٣.

**سیاسی بەبۆنەو موناسەباتەوە ووتووە. شیعرێکی زۆر جوان و نایابی بەبۆنەی شەهیدبوونی تێکۆشەری ماندوو نەناس و سەربازی ونی گەلەکەمان -حمید باتاسی[٥٤]-وە داناوە.**

---

[٥٤] (حمید باتاسی) کوردێکی پاك و دڵسۆز بوو، خەڵکی باکووری کوردستان بوو، پیاوێکی بێ کەس و بێ وەی بوو، لەسەردەمی شۆڕشەکانی باکووری کوردستان ئاوارەی باشوور بوو بوو، لەناحیەی حەریرو باتاس لەلای کەسوکاری بنەماڵەی شێخەکانی نەهری گیرسابووەوە. لەسەرەتای چلەکانەوە وێڵ و عەودالی کوردایەتی بووە،، دواتر چووەتە ڕیزی پارتی دیموکراتی کوردستانەوە، دوای ماوەیەك لەشاری کەرکوك لە کۆمپانیای نەوت دا مەزراوەو پیاوێکی تێکۆشەرو نەبەز بووە، لە کەرکوك لە ڕاپەڕینە مەزنەکەی (گاورباغی) بەشداری کردووە، لەو ڕاپەڕینەدا بریندار کراوەو دواتر بەند کراوە، دوای دەرچوونی لەبەندیخانە لە کارەکەی دەرکراوە، لە ساڵی ١٩٤٧-١٩٥١ز لە کەرکوك کتێبخانەی هەبووە، لە شەقامی ئەوقاف وەك مەڵبەندو بارەگایەکی پارتی بوو، ئینجا دوکانی سەوزەو میوەفرۆشی داناوەو بۆخۆی زوگورتی بووە، واتە ژن و منالی نەبووە، ژنی هەر نەهێنا بوو.

لە سەرەتای پەنجاکانەوە بوو بە ئەندامی ناوچەی پارتی لە کەرکوك تا ساڵی ١٩٦١ز، حزب وەك کادرێك گواستییەوە بۆ هەولێر، دوای ئەوەی شەهید عەلی عەسکەری بوو بە لێپرسراوی لقی بادینان، لە ساڵی ١٩٦١-١٩٦٢ شەهید حەمید باتاسی لەگەڵ خۆی بردە بادینان و کردی بە لێپرسراوی ناوچەی موسڵ.

شەهید حەمید بۆ کاری نهێنی حیزبی زۆر ژیرو وریا بوو، توانای خۆگۆڕینی هەبوو بە هەموو شێوەیەك و دوژمن هەستی پێ نەدەکرد.لە ساڵی ١٩٦٣ لە موسڵ زۆر بێزار بوو، تووشی ململانێ بوو لەگەڵ ئەندامانی ناوچە، کە سەر بەبەڕێز بارزانی بوون و کاك حەمیدیش لایەنگری هێڵی مەکتەبی سیاسی بوو. ڕاپۆرتێکی بۆ مەکتەبی سیاسی نووسی تێیدا دەڵێت.. ((مانەوەم لە موسڵ دەبێتە هۆی ئەوەی بەگرتنم بدەن، چونکە ناکۆکییەکەمان توندو تیژ بووە، بەتایبەتی لەگەڵ (حسێن زاوێتەو عەلی گۆیی) )).

برایم ئەحمەد بروسکەیەکی کرد بۆ ئێمە، کە ئەوسا نووسەری ئەم کتێبە لێپرسراوی هەولێر بوو تیایدا دەڵێت:

((پێمان باشە بەزوویی هەڤاڵ (میرۆلە) بگوازنــەوە هـەولێر، لای خۆتـان وەك ئـەندام كـارگێڕی ناوچەی هەولێرو هەركێ بە باش دەزانن بینێرنە موسڵ بۆ كارگێڕی ناوچەی موسـڵ لەگـەڵ (عـەلی گۆیـی) بەیەكـەوە كاربكـەن)). كاك حـەمید باتاسـی گواسـترایەوە بـۆ هـەولێرو بـوو بەئەندامی ناوچەو لە هەولێر مایەوە تا ساڵی ١٩٧٦ز.

لە ساڵی ١٩٦٢ عەلی عەسكەری لـەبادینان بـوو لەگـەڵ مـەلا مسـتەفا. شـەهید عـەلی عەسـكەریو برایم ئەحمەد، حەمید باتاسییان زۆر خۆش دەویست، حەمید باتاسـی دەچێتـە خزمـەت مـەلا مستەفاو شـەهید عـەلی عەسكەری ئامـادە دەبێت، مـەلا مستـەفا لێـی دەپرسێت نـاوت چییـە؟ دەڵێت: ناوم هەڤاڵ (میرۆلەیـە)، ئینجا دەپرسێت خـەڵكی كوێـی؟ دەڵێت خـەڵكی كوردستانم، مەلا مستەفا لێی تووڕە ئەبێتو دەڵێت (میرۆلـە)و خـەڵكی كوردستان تێنەگەیشتم.. ئـەویش ئەڵێ تۆ سەرۆكی حزبی چۆن نازانی هەڤاڵ میرۆلە كێیە؟ تێگەیشتیت.

مـەلا مستـەفاش دەڵێت: هـەی______بـاب هـەمووماـن خـەڵكی كوردسـتانینو دەیـان هـەزار میرۆلەمان هەیە، ئینجا شەهید عەلی عەسكەری دێتە وەڵامو دەڵێت: قوربان لێی تـووڕە مەبـە، ئەوە فلان كەسـەو تێكۆشـەرێكی زۆر دێرینـەو دڵسۆزو نەبـە زە، مـەلا مستـەفا قسـەی خۆشـی لەگەڵ دەكاو دڵی چاك دەكاتەوە.

حەمید باتاسی هـەموو جارێك ئـەو قسانەی دەگێڕایـەوەو جنێوی بـە عـەلی عەسـكەری دەداو دەیگووت ئەو كەتنە ئەو بە منی كـرد.. گوتـی بەمـەلا مستـەفا بڵێ خـەڵكی كوردسـتانمو نـاوە نهێنییەكی حزبی پێ بڵێ لەجیاتی ناوەكەی خۆت، چونكە مەلا مستەفا ئەوەی پێ خۆشترە.

حـەمید باتاسـیو عـەلی عەسـكەری زۆر یـەكتریان خـۆش دەویسـتو گاڵتـەو سـوعبەتیان زۆر بەیەكەوە دەكردو جنێویان بەیەك دەدا، حەمید بەبـەردەوام ی لـەماڵی عـەلی عەسـكەری بـوو، مەحرەم بوو لەوێ خۆی خاوەن ماڵ بوو.

پیاوێكی یەكجار داوێن پاكو دەست پاكۆ زمان پاكو دڵسۆز بوو.

زۆر حەزی لـە حزبایـەتی بـوو، هـەر شۆڕشـی نوێـی گەلەكـەمان لەسـاڵی ١٩٧٦ دەسـتیپێكردەوە، عەلی عەسكەری نامـەی بـۆ نووسیو ڕاسـتەوخۆ چـووە ڕیـزی شۆڕشـەوە، لـە شـەوی ١٩٧٧/٥/٣١ لەناوچـەی چۆمـان لـەكاتی پەڕینـەوە لـە ڕووبارەكـەی چۆمـان لەسـەر پردەكـە دەكەوێتـە نـاو كەمینی جاشو عەسكەرەوە، لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر هەرسێكیان شەهید دەكرێـنو دەچنـە ڕیزی نەمرانەوە. بەو بۆنەیەوە برایم ئەحمەد ئەم شیعرەی لەسەر نووسیوە.

**بۆ گیانی حمید باتاسی**

**شیعری برایم ئەحمەد لەندەن ئابی ١٩٧٧ز**

*لە پاك پاكژ تر كاكە حمید گیان*

*عاشقە ڕووتەكەی خاكی كوردستان*

*هێندە سووتاوی ئازادی گەل بووی*

*نەوێستای هەتا خۆت كردە قوربان*

*چەند دوژمن گەوجە لای وایە مردووی*

*نازانێ ئەمرۆ بەكام گەیشتووی*

*دوو ئاواتت بوو تۆ لەگێتی‌دا*

*خاكت بخەملێ لەسەربەستی‌دا*

*تۆش گیانت بدەی لەبرێتی‌دا*

*سەر ڕاست بووی بەشی خۆت پێشەكی‌دا*

*واتۆ ئەگەوزێیت لەخاك و خوێنتا*

*ئێمەش گەر پیاو بین هاتووین بەشوێنتا*

*گەلێ ئازادی بەخوێنی بكڕێ*

*نی‌یە بتوانێ ڕێگەی لێ بگرێ*

*زۆردار لای وایە بەزەبری كوشتن*

*گەل بێزار ئەكا لەخەبات كردن*

*نازانێ كەوا داری ئازادی*

*هەر بەخوێنی گەش دێتە بەرگرتن*

*هەردڵۆپێکی خوێنی شەهیدێ*

*قارەمانێکی تری دێتە جێ*

*لاشەی زۆردارو خوێن مژانیش زوو*

*فڕێ ئەدرێتە زەلکاوی مێژوو*

*حمید بەگیانی خۆت و یارانت*

*بەکوردستانی دیل و وێرانت*

*یائێمەش هەموو هاتوینە کوشتن*

*یادێنینە دی ئاما نجی گیانت*

*گەلێ ئازادی بەخوێنی بکرێ*

*نیە بتوانێ ڕێگەی لێ بگرێ.*[55]

لەڕاستیدا (حمید باتاسی) لایەقی ئەوەبوو سیاسەتمەدارو گەورەپیاوی وەك برایم ئەحمەد شیعری لەسەر دابنێ، چونکە ئەو کەڵە تێکۆشەرە هەموو ژیانی خۆی بۆ کوردو کوردستان تەرخان کردبوو، خۆشی ژیانی لەخۆی قەدەغە کردبوو، دەروێشانە دەژیاو ڕەنجی بۆ کورد دەدا. مرۆیێکی بێکەس و کار بوو، نەژن، نەمنداڵ، نەدایك و باوك، نەخوشك و نەبرا، نەئامۆزای هەبوو...

شەیدای خاکی کوردستان بوو، کابانی کوردستان و کۆگای (مخزن)ی نهێنی بوو، بێ نازو فیز بوو، بۆیە نووسەرێکی گەورەی وەکو برایم ئەحمەد، کەشیعری لەسەر داناوە پڕ بەپێستی خۆیەتی و شەهید باتاسی زیاتر لەوە هەڵدەگرێ و هەرچی لەسەر بنووسرێ هێشتا هەرکەمە. ئێمە

---

[55] سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد- بەرەو ڕوناکی- ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا ١٩٩٦ز.

پێمان وایە کوردایەتی قەرزداری ئەو خەباتگێڕەیەو دەبوایە وەکو شەهید زەبیحی لەهەموو شارەکان پەیکەری بۆ دروست بکرێ.

ئەوەی من ئاگادار بم، برایم ئەحمەد تائێستا شیعری ماتەمی بۆ سێ کەس نووسیوە، هەرسێکیان لایەقی ئەو ڕێز لێنانە بوون. لەساڵی ١٩٤٨ز شیعرێکی بۆ بێکەسی شاعیر نووسیوەو لەژێر ناوی (ئێستەی تەماوی) لەگۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە، دیارە فایەق بێکەس هاوڕێی خۆشەویستی بووەو بەمردنی بێکەس، برایم ئەحمەد زۆر غەمبار بووە، بۆیە ئەو شیعرەی لەسەر داناوەو لە (گەلاوێژ)دا بڵاوکراوەتەوە، بێکەس جگە لەوەی دۆستو هاوڕێی شەخسی برایم ئەحمەد بووە، لەهەمان کاتدا پیاوێکی نیشتمان پەروەرو دڵسۆزی کوردو کوردستان بووەو شاعیرێکی چاونەترس و بوێرو ئازا بووە. برایم ئەحمەد پیاوی وەك فایەق بێکەسی خۆش ویستووە، چونکە لەگەڵ بیروبۆچوونی ئەو هاودەنگ بووە. هاوڕێی شەوانی دانیشتن و خواردنەوەو بەزم و ڕەزمی تافی لاوێتی بووە.

# کوردستانیەتی برایم ئەحمەد

هەروەك لەپێشەوە ئیشارەمان پێداوە، برایم ئەحمەد بابایێکی کوردستانی بووە. بیروبۆچوونی نەتەوەیی سەرتاسەری بووە. هەرلەسەردەمی لاوی‌یەوە چۆتە ڕیزی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان، کەبنکە سەرەکیەکەی لەڕۆژهەلاتی کوردستان بووە. ئەم لێپرسراوی لقی کوردستانی عێراق بووە، دواتر کەحزبی دیموکرات دامەزراوە بەردەوام بووە لەپەیوەندی لەگەڵ حزبی ناوبراوو پەیوەندی بەهێزی لەگەڵ پێشەوا قازی محمد هەبووە. کەقازی محمد شەهید دەکرێ لەساڵی ١٩٤٧ز لەمهاباد لەمەیدانی چوارچرا برایم ئەحمەد ئەم شیعرەی خوارەوە دەهۆنێتەوە بەو بۆنەیەوە لەگۆڤاری گەلاوێژدا بلاوی‌دەکاتەوە لەژێر ناوی:

***یادی پێشەوا***

***یاران بابادەی پڕ مەی برێژین***
***باکۆرپەی خۆشی و شادی بنێژین***
***بابەئاخ بەئۆف بەحەسرەت بەداخ***
***تەماوی بکەین ئاوێنەی دەماغ***

لەم شیعرەو دوو شیعرەکەی تری، کەلەسەر فایەق بێکەسی شاعیرو شەهید باتاس دایناوە، زیاتر ئەو باوەڕە جێگیر دەبێ و دەچەسپێ، کەبرایم ئەحمەد تاسەر مۆخی و ئێسقانەکانی کوردستانی بووە. ئاشکرایە فایەق بێکەس خەڵکی باشورەو باتاس خەڵکی باکورەو پێشەوا قازی خەڵکی ڕۆژهەلاتی کوردستانە(٥٦).

---

(٥٦) گۆڤاری ڕۆژی نوێ، ژمارە ١١، ساڵی یەکەم، شوباتی ١٩٦١ز.

ئەم شاعیرە هاتووە هەرسێ پارچەکەی کوردستانی بەسەرکردۆتەوەو لەهەر باغەو گوڵێکی بۆن خۆشی هەڵبژاردوەو تاسەی دەروونی خۆی پێ ڕشتووە[٥٧].

جگە لەشیعرەکانی لەوتارە سیاسییەکانی ڕۆژنامەی (خەبات)و (کوردستان)و (النور)ی عەرەبی و (چریکەی کوردستان)و (صرخة کوردستان) ، کەلەلەندەن دەری‌دەکردو لەگۆڤاری (گەلاوێژ)و ئامۆژگاری‌یەکانی و کۆڕو کۆبوونەوە حزبییەکانی جەختی لەسەر خەباتی سەرتاسەری دەرکردەوە[٥٨].

ئەم قسانەی برایم ئەحمەد لەوکۆبوونەوەیەی لەگەڵ ئێمە کردی لەبەغدا بەڵگەی بەهێزن بۆ کوردستانییەتی ئەم شاعیرو نوسەرو سیاسەتمەدارە. جگە لەوەش ئەگەر سەیری گۆڤاری (چریکەی کوردستان) بکەین، کەناوبراو

---

[٥٧] سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد- بەرەو ڕوناکی- ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا ١٩٩٦ز، ل٢٩-٣٠.

[٥٨] لەیادمە لەساڵی ١٩٦٦ لە بەغدا لە موحازەرەیەکدا کە بۆ سکرتاریەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان دای لە بارەگای حزب بە ئامادەبوونی (نووسەری ئەم کتێبەو شازاد سائیب و سەربەست بامەڕنی و بەکر حسێن و محەمەد عەبدولوەهاب و ئەمیری حەفیدو بلە ڕەش) ئامادەبووین بەم شێوەیە بۆمان دوا:

((ئێمە میللەتێکی هەژارو داگیرکراوین، لەلایەن چوار دەوڵەتەوە کە ئەندامن لە نەتەوە یەکگرتووەکان، واتە چوار دەوڵەتی بەهێز کە هەریەکەیان پەیوەندی هەیە لەگەڵ دەیان دەوڵەت و دۆستایەتی بەهێزی هەیە لەگەڵیان پشتگیری لێ دەکەن لە دژی ئێمەی بێ کەس..

ئەم چوار حکومەتە هەرچواریان خاوەن سوپاو پۆلیس و دەزگای داپڵۆسین و جاسووسی و توانای دارایی زۆر بەهێزیان هەیە. ئەگەر بێت و ئێمەی کورد لەهەر چوار لایان هوشیار ترو زیرەك ترو لەخۆبردوو ترو خۆبەختکەرو یەکگرتووترو دبلۆماسی تر نەبین ناتوانین بەسەریاندا زاڵ بین و مافەکانی خۆمانیان پێ بسەلمێنین)).

لەلەندەن دەری‌کردووە، هەروەها (صرخـــة کوردســـتان) بەزمانی عەرەبی هەموویان ئەو ڕایەی سەرەوە دەسەلمێنن.

کارو کردەوەکانی لەبیست و پێنج ساڵی ڕابردوو لەدەرەوەی کوردستان، چالاکی‌یە سیاسیەکانی، پەیوەندی‌یەکانی لەگەڵ ڕۆشنبیرو تێکۆشەرانی نەتەوەکەمان و بەشداری‌کردنی لەگەڵ حزبە کوردی‌یەکانی وەکو حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران و پارتی کرێکارانی کوردستانی تورکیا و ئامادەبوونی لەکۆنگرەی نەتەوەیی کوردستان و پشتگیری‌کردنی لەپەرلەمانی کوردستان لەدەرەوەی وڵات و هەوڵ و خەباتی لەپێناو چەسپاندنی ئاشتی لەکوردستانی عێراق و چالاکی بەشداری لەکاری ئۆپۆزسیۆنی عێراقی هەموو ئەمانە دەیسەلمێنن و گومانی تیاناهێڵێ، کە برایم ئەحمەد ڕۆشنبیرێکی نەتەوە پەرستی سەرتاسەری پێشکەوتنخوازو شۆڕشگێربووە و ئەو بروسکەو نامەو فاکسانەی بەبۆنەی کۆچی دوایی ئەوەوە هاتوون بۆ بنەماڵەکەی بەتەواوی پشتگیری لەوبۆچوونەی ئێمە دەکەن، هەموو حزبە کوردی‌یەکان لەهەرچوار پارچەی کوردستان، هەموو کەسایەتی و سیاسەتمەدارو تێکۆشەرانی نەتەوەکەمان، ئەدیب و شاعیرو هونەرمەندانی کوردستان، برایم ئەحمەد بەموڵکی خۆیان دەزانن.

شیعرێکی تری برایم ئەحمەد هەیە لەساڵی ١٩٥٩ز لەژێر ناوی (ڕووبەڕووی مردن) دایناوە، نزیکەی هەشتا دێرە شیعرە و بۆ عبدالکریم قاسم دانراوە بەبۆنەی ڕزگاری بوونی لەهەوڵی تیرۆرکردنی لەلایەن عەرەبە نەتەوە پەرستەکانەوە دیارە لەساڵی ١٩٥٩ز عبدالکریم قاسم لەناو میللەتی عێراق بەگشتی و لەلای خەڵکی کوردستان بەتایبەتی خۆشەویست بوو، چونکە قاسم ڕابەری ڕاستەقینەی شۆڕشی چواردەی تەمووز بوو، ئەو شۆڕشەی ڕژێمی پاشایەتی سەربە ئیمپریالیزمی سەرەونگون کرد و گەلی

عێراقی ئازادکردو بەمادە (٣)ی دەستوری کاتی دان بەمافەکانی گەلی کورد نراو کوردو عەرەبی کردە هاوبەش و برا لەنیشتمانی عێراق، عێراق لەناوچەی ئیستەرلینی هاتە دەرەوەو یاسای چاککردنی کشتوکاڵی هێنایە کایەوەو، زەوویو زاری بەسەر جوتیارەکان دابەش کردو ئازادیی یە سیاسیەکانی ڕاگەیاندو کۆمەڵێك بڕیاری گرنگی دەرکرد لەخزمەتی کۆمەڵانی خەڵك.

لەبەرئەو هۆیانەی سەرەوە قاسم لای کورد ڕێزی هەبوو، برایم ئەحمەدیش ئەم شیعرەی بەو بۆنەیەوە بۆ داناوە.

ڕووبەڕووی مردن: [٥٩]

- ***کەریم لای گەل ئازادی یە***
- ***ئاشتی، ئاسایش، شادی یە***
- ***مانای سەربەرزی ژیانە***
- ***بۆگەل و بۆ ئەم نیشتمانە***
- ***بۆیە هەرچی کەهەمانە***
- ***گەر ماڵ و حاڵ گەرگیانە***
- ***ئەیکەینە قوربانی کەریم***
- ***ئەگینا کەریمی تەنیا***
- ***وەك ئەو کەریمانەی دنیا***
- ***کەس نازانێ مرد یا ژیا***

لەشیعرێکی تریدا کەبۆ - صدام حسێنی نوسیوە لەگۆڤاری (چریکەی کوردستان) بڵاوکراوەتەوەو لەژێر سەرناوی (بۆ سەدام حوسێن)[٦٠] دەڵێت:

---

[٥٩] لەگۆڤاری (هیوا) ساڵی ١٩٥٩ز بڵاوکراوەتەوە، ل٤٨-٤٩.

- ***سەدام کوردستان موڵکی تۆ نیە***
- ***نەهی ئەتاتورك نە خومەینییە***
- ***مەلای لابەلا کوردی خستە داو***
- ***ئینگلیزیش ئێوەی لێکردین بە پیاو***
- ***تاقە بستێکی ئەم کوردستانە***
- ***داگیر نەکراوە بەجەنگی مەیدان***
- ***هەمووی بە پاکی و دڵ سافی خۆمان***
- ***بەفرتو فێڵی زۆڵە موسوڵمان***
- ***کورد بێبەش کرا لەماف و لەنان***
- ***لەماڵی خۆیا بوویەبێگانە***
- ***کوردی خاوەنی ئەم نیشتمانە***
- ***پڕ خێرو بێرو پڕ نەوت و کانە***
- ***خاوەنی مێژوو هی ئەم زەمانە***
- ***بەرگری هەموو گورزی زەمانە***
- ***بەگوڕ سپێری سەد هاری وەك تۆ***
- ***بۆنەگرێتە دەس چارەنوسی خۆ؟***
- ***بۆ هەقی نەبێ ئەویش وەك ئێوە؟***
- ***ئالای خۆی هەڵکا لەم کەژو کێوە.***

ئەم شیعرەش وەکو شیعرەکانی تری زیاتر کوردستانییەو بەرگرییە لەمافی سەرجەم نەتەوەی کورد لەهەر چوار پارچەی کوردستان. شیعرەکە ئاراستەی سەدام حوسێنی - دکتاتۆر کراوەو پێی دەڵێت کوردستان

(٦٠) گۆڤاری چریکەی کوردستان، ژمارە ٤، کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٨١، لەندەن، ل٧٥.

خاكی تۆو تورك‌و فارس نی‌یەو ئێوە خاكی كوردتان بەفێڵ‌و تەڵەكەبازی داگیركردووە.

ئینگلیز ئێوەی لێكردووین بەپیاو، ئەگینا ئێوە ئەو پیاوە نەبوون بتوانن بەشەڕ كوردستان داگیر بكەن، بەڵام مەلای نەزان‌و غافڵگیرەكانی خۆمان بەناوی ئیسلامەوە ئێمەیان دەسخەڕۆ كردو ڕێگایان خۆشكرد بۆ داگیركردنی نیشتمانەكەمان‌و بێ بەشبوونمان لەمافەكانمان‌و سوود وەرگرتن لەكان‌و نەوت‌و خێرو بێری وڵاتەكەمان....

دەبێ سەدی وەكو ئێوە بەگۆڕ بسپێرین‌و ئاڵای خۆمان لەم كەژو كێوانە هەڵكەین.

شیعرێكی تری بەناوبانگی برایم ئەحمەد، ئەو شیعرەیە كەساڵی ١٩٤٩ز لەمەوقوف خانەی ئەبوغرێب دایناوە، دوای ئەوەی لەدادگای عورفی بەساڵ‌و نیوێك حوكم دراوە لەسەركوردایەتی.

شیعرەكە (٢٤) دێڕە شیعرەو هەموو تەحەدای حكومەتی كۆنەپەرستی پاشایەتی بۆگەنی عێراقی سەر بەئیمپریالیزمە.

ناوەڕۆكی شیعرەكە هیواو ئاوات‌و بڕوای بەتینی شاعیر بەسەركەوتنی گەل‌و لەناوچوونی ڕژێم‌و سەرنگوون بوونی لەزبڵدانی مێژوو، هەروەكو پێشتر هێتلەری دیكتاتۆرو سوپا بەسام‌و هەیبەتەكەی تێك‌وپێك چوو گۆڕی گوم بوو، ئەمەیش دەبێ چاوەڕوانی هەمان چارەنووس بێت شیعرەكە شیعرێكی سیاسی‌و شۆڕشگێڕی‌یەو ورەو تین‌و توانای تێدایەو هیواو ئاواتی بەسەركەوتنی گەل زۆر بەهێزە....

لەژێر سەرناوی (دواتیری كەوان[٦١])

---

(٦١) سەرجەم شیعرەكانی برایم ئەحمەد، ئامادەكردنی ئومێد ئاشنا، ١٩٩٦، ل٤٠-٤١.

***دواتیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن***
***دوا سەرکەوتنی تۆیەو دوا نووچی گەلە دوژمن***
***شەوی ترساندنت سامی نەماوە تاریك و ڕوونە***
***بەئاسۆی ئەرخەوانیدا هەتاو لەودیو کەلە دوژمن***

ئەم شیعرە لەپەنجاکان و شەستەکانی چەرخی ڕابردوو وێردی سەرزاری ڕۆشنبیرو خەباتگێرە شۆڕشگێڕەکانی کورد بوو، لەکۆڕو کۆبوونەوە نهێنی‌یەکانی پارتی و هەندێجار لەناو شیوعی‌یە کوردەکانیش لەبەرچاو دەگیراو بەهەند وەردەگیرا، لەبەر ئەوەی شیعرەکە لەدژی ڕژێمی پادشایەتی بوو، دژی ئیمپریالیزم و داگیرکەران بوو، وورەی کۆمەلانی خەلکی بەرز دەکردەوەو هانی خۆراگری دەدان و هیواو ئومێدی بەکۆمەلانی خەلك دەبەخشی، کەدەسەلاتی ڕژێم بەرەو نەمان دەڕواو سەرکەوتنی گەل نزیکەو ئاسۆ ڕووناکە.

بۆیە ئەو گرنگی‌یەی پێدراوە، لەسەردەمی پادشایەتی، واتە پێش شۆڕشی گەلاوێژی ١٩٥٨ز، سەردەمی بلاوبوونەوەی ئەو شیعرە هێزە سیاسی‌یەکانی سەرگۆڕەپانی عێراق یەکگرتووو هاوکاری یەك بوون، پەیوەندی باشیان لەگەلْ یەکتری هەبوو، سەرکردەی حزبەکان بەیەکەوە لەبەندیخانەکانی ڕژێم دۆستایەتی و هاورێیەتیان پەیداکردبوو، بەبیروباوەڕی یەکتر ئاشنابوون، یەك ئامانجیان هەبوو، ئەویش لەناوچوونی ڕژێم بوو.....

بۆیە هەموو بۆچوون و وتارو شیعرو لێکۆلینەوەیکی باش و لەقازانجی پرۆژەکانیان لەیەکتری وەردەگرت و پەسەندیان دەکردو ڕێزیان بۆ بیروبۆچوونی یەکتر هەبوو، توندوتیژی لەنێوانیان کەم بوو، بەلام لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش، ناکۆکی کەوتە نێوان ئەندامانی ئەنجومەنی بالای

شۆڕش، هەندێکیان بەرەو نەتەوە پەرستی و شۆفێنی یەتی عەرەبی هەڵپەیان دەکرد بەسەرۆکایەتی عبدالسلام عارف و ئەوانی تر بەرەو چەپڕەوی و شیوعیەت ڕۆیشتن.... قاسم لەسەرەتاوە لایەنگری ئەم دەستەیە بوو پشتگیری دەکردن.

دواتر عەرەبە ڕەگەزپەرستە شۆفێنی یەکان بەسەرۆکایەتی حزبی بەعس ویستیان عبدالکریم قاسم تیرۆر بکەن. ئەوجا قاسم بایدایەوە و کەوتە هێرش کردنە سەر شیوعیەکان و پیلان دانان بۆ ناکۆکی نانەوە لەناو هەموو حزبەکان و هاندانی سەرکردەکانیان لەدژی یەکتری و لەت وپەت کردنی حزبی شیوعی و نیشتمانی و دیموکراتی و حزبی بەعس و پارتی و ئەوانی تر....

# پەخشانە شیعر

برایم ئەحمەد پەخشانە شیعرێکی ناسراوو بەناوبانگی لەناو ڕۆشنبیران و ئەدەب دۆستان و سیاسەتوانەکانی کوردستاندا هەیە. گرنگی پەخشانە شیعرەکە لەوەدایە ئەو ڕێچکە شیعری یە لەوسەردەمەدا تازە سەری هەڵدابوو، برایم ئەحمەدیش وەك شاعیرێکی دوو سەردەم واتە (کلاسیکی و ڕۆمانسی) لەگەڵ ئەوەی پێشتر، واتە قۆناغی کلاسیکی لەکوردستان پێش شەڕی یەکەمی جیهان و سەردەمی بڵاوبوونەوەی ڕۆمانسی لەکوردستان لەشەڕی دووەمی جیهان بەدواوە توانی پێشڕەوی ئەم ڕێبازەش بکاو هەنگاو بەرەو پێشەوە بنێ... ئەمەیان لەڕووی ئەدەبیەوە، بەڵام لەڕووی سیاسیەوە عەقڵی کوردی زیاتر بەرەو گەشانەوەو پێشکەوتن خەملیبوو، ڕووەو ئاسۆی سۆشیالیستی هەنگاوی گەورەی دەناو برایم ئەحمەدیش یەکێك بوو لەڕابەران و پێشەنگی بیرو باوەڕی ئەو سەردەمەو خۆی لەوانە بەمارکسی ڕاسترو باشتر دەزانی.

دیارە شەڕی دووەمی جیهان قۆناغێکی تازەی هێنایە پێشەوەو بیروباوەڕی ئازادی و دیموکراتی تەکانی باشی نا لەدڵ و دەروونی خەڵکی ڕۆژهەڵات بەگشتی و خەڵکی کوردستان بەتایبەتی چونکە کورد بۆ خۆی تینووی سەربەستی و ئازادی بوو...

(برایم ئەحمەدیش وەك بزوێنەری ڕاپەڕین و مەشخەڵی شۆڕش و هاندەری ڕۆشتن (بەرەو ڕووناکی) سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان

بوو، لەشەوە زەنگەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم دا. کەدواتر بووە سەنتەری کاری سیاسی و ڕووناکبیری گشت تێکۆشەران و کورد پەروەران لەدەوری کۆبوونەوەو ئەویش وەك مامۆستایەکی (مونەوەر) لەسەر تازەترین و پێشکەوتووترین ڕێباز وانەی کوردایەتی و برایەتی و مرۆڤ پەروەری پێوتنەوەو هەر ئەو وانانەش بوونە هێڵە گشتییەکانی خەباتی کوردایەتی لەنیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دا)[٦٢].

پەیام و میتۆدی سیاسی برایم ئەحمەد لەڕۆژانی تاریك و ئەنگوستەچاوی تێکۆشاندا توانا و بەهرەی بیرکردنەوەی ئازاد و داهێنانی بەژیانی گیانی و سیاسی گەل بەخشی.... بەتایبەتی لەم پەخشانە شیعرییەدا کەتائێستا چەند جارێك لەگۆڤار و ڕۆژنامە کوردییەکاندا بڵاوکراوەتەوە ئەوە خۆی لەخۆیدا نیشانەی بەرزی و بەهێزی و پڕ بایەخی ئەو پارچە ئەدەبیە لەدڵی ڕۆشنبیران و ئەدەب دۆستان و سیاسەتمەدارانی کوردستان، جاهەریەکە بەشێوەیەك و هەریەکە بەجۆرێك ڕێزو نرخیان بۆ داناوەو باسی لێوەدەکەن.

(٦٢) کوردستانی نوێ، ژمارە٢١٣٣، یەك شەممە لە ٣٠/٤/٢٠٠٠، ل٣، یاسین فەقێ سەعید.

## بەرەو ڕووناکی

*لەناو جەرگی تاریکی‌یەوە...*
*دەست بەکەلەبچەو تەوق و لەمل و زنجیر لە پێ.*
*لەکانگای نەزانی و هەژاری و دیلی‌یەو...*
*کەوتومەتە ڕێ هاتووم ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی...*

*پشتم داڕزاوی جەزرەبەی قامچی‌یە.*
*ناوچەوانم تفی پیا دێتە خوارەوە...*
*پێم شەلی دارکاری‌یە.*
*فرمێسک لەچاوما قەتیس ماوە.*
*پێستم بەسەر ئێسکمدا ووشك بۆتەوە*
*بەڵام بەدڵێکی وەك پۆڵاوە ڕێم گرتۆتەبەر ئەڕۆم بەرەو ڕووناکی..*

هەڵبەستەکە (٣٢ سی و دوو)دێڕەو، هەمووی بەشێوەیەکی سفت و ڕەوان ناسك و نایاب دەڕوا. هونەری شیعری جوانی تێدایەو هەستی ناسك و بەسۆزی شاعیر تێکەڵاو بووە لەگەڵ خەیاڵی باڵەفڕێدا. بەوشەی تەڕو بڕو پاراو ڕازاوەی هۆنیوەتەوەو خوێنەرو گوێگر دێنێتە جۆش و خرۆش.

هەروەها هەڵبەستێکی تری برایم ئەحمەد لەژێر ناوی (نەورۆزی من) لە ساڵی ١٩٤٥ز دا دایناوەو بڵاوی‌کردۆتەوە. شیعرەکە دەربارەی جەژنی نەورۆزی کوردەواری‌یە.

ئەم جەژنە نەتەوەیی‌یە لەسەردەمی پاشایەتی دا لەخەڵکی کوردستان قەدەغە کرابوو، خەڵك بەنهێنی یادی ئەم جەژنەیان دەکردەوەو ئاگری نەورۆزیان هەڵدەکرد...

جەژنی نەورۆزو کاوەی ئاسنگەر چ ئەفسانە بێت، یان ڕاستەقینە لەدڵی کوردا جێگیر بووە. جاهۆیەکەی هەرچی‌یەك بێت، ئەم جەژنە لەئێران و ئەفغانستان و هندستان و پاکستانیش بەزم و شادی بۆدەگێڕن.

بەڵام لەناو کوردان دەیبەنەوە سەردەمی زەردەشت و هەندێ مێژوونوس دەیگێڕنەوە بۆ پێش پەیدابوونی زەردەشت و کتێبە پیرۆزەکەی (ئاوێستا)، بۆیە دەبینین لاوانی کوردی لەهەموو قۆناغەکانی ژیانیاندا لەگشت مەڵبەندو ناوچەو پارچەیەکی کوردستاندا هەمووساڵێك ئاگری نەورۆز دەکەنەوەو ئاهەنگ دەگێڕن و سەیران ساز دەکەن.

لەباشوری کوردستان (پیرەمێرد)ی نەمر ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لەزیندووکردنەوەی جەژنی نەورۆزو خەڵکی هانداوە یادی بکەنەوەو گرنگی پێ‌بدەن. ئەمە جگە لەوەش ڕۆشنبیرەکانی کوردستانیش توانیان یادی نەورۆز بەچاکی بخەنە گەڕ لەخزمەت بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستان و لەپێناو یادکردنەوەی نەورۆزدا سەدان لاوی کورد چونەتە بەندیخانەکانی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق و ئێران و تورکیا.

تاکار گەیشتە ئەوەی شۆڤێنیستە فاشستەکان بەزۆر فتوا بەمەلاو شێخەکان دەربکەن و نەورۆز بەکفرو ئیلحاد ئاوزەد بکەن، بەڵام خەڵکی تێکۆشەری کوردستان سارد نەبوونەوە لەهەوڵ و هیمەتیان، بەردەوام لەپێناوی نەورۆزدا قوربانیان ئەدا.

لەئەنجامدا ناچار ڕژێمی عێراق لە ساڵی ١٩٦٨ دانی بەجەژنی نەورۆزدا نا، کەببێتە جەژنی نەتەوایەتی و بەڕەسمی بناسرێ و پاشانیش لەبەر

ڕەگەزپەرستی خۆیان گۆڕییان و ناویان نا (جەژنی دارودرەخت).
لەتورکیاش تازە، واتە ساڵی (٢٠٠٠) لەژێر پاڵەپەستۆی خەڵکی کوردستان و ڕای گشتی جیهانی بەتایبەتی وڵاتانی ئەوروپا تورك ناچار کران ڕێگا بدەن خەڵك بەئاشکرا لەشارە گەورەکان ئاهەنگی جەژنی نەورۆز بگێڕن.

ئەم شیعرەی برایم ئەحمەد لەساڵی ١٩٤٥ز دانراوەو دەڵێت: د

## ((نەورۆزی من)) [٦٣]

*پێم ئەڵێن نەورۆزە ئیمڕۆ، ڕۆژی جەژن و خۆشییە*
*وەختی هەڵپەڕکێ و سەمایە، مەوسمی تەڕپۆشییە.*
*دەشت ودەر گوڵ پۆشە، ئەم ڕەش پۆشیەت بێهۆشییە.*
*من ئەڵێم نەورۆزو شادی و جەژنی دیل ئازادییە...*

ڕەنگە زیاتر ئەم شیعرەی بۆ سەرکارت نووسیبێ کەلەو سەردەمانەدا باوو بووە.

[٦٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥، ساڵی ١٩٤٥ز، سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، ل١٧.

## ((کاوەی ڕاستەقینە))

هەر لەسەر کاوەی ئاسنگەرو پەیوەندی کاوەو زوحاك بە مێژووی کوردو کەلەپووری کوردەواری‌یەوە برایم ئەحمەد هەڵبەستێکی (٦٨) شەستو هەشت دێڕی لەساڵی ١٩٦٢ز هۆنیوەتەوەو وەڵامی پرسیارەکانی داوەتەوەو کێشەو ململانێکانی یەکلا کردۆتەوە بۆیە ڕاڤەو لێکدانەوەی ناوێتو شیعرەکە خۆی هەموو پرسیارەکانی وەڵام داوەتەوە لەژێر سەرناوی (کاوەی ڕاستەقینە).

(کاوەی ڕاستەقینە)

برایم ئەحمەد ١٩٦٢ز بەغدا.

*هەندێ کەس ئەڵێن کاوەی قارەمان*
*هیچ پەیوەندی‌یەکی نی‌یە لەگەڵمان*
*نەبۆ کورد بووەو نەبۆ کوردستان*
*خوێنی زوحاکی ڕشتۆتە مەیدان*

گرنگی و بەهای شیعرەکە، لەوەدایە لەڕووی هونەری‌یەوە گۆی هونەری بردۆتەوە، چ لەڕووی وەزنو چ لەڕووی قافیەو لەڕووی داڕشتنو زمان پاراوی‌و هەستو سۆزو خەیاڵی نیشتمانی، ئینجا ڕووداوی مێژووی ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەو ڕاستکردنەوەی هەڵەی سەپاو بەسەر خەڵکی ئەم دەڤەرەدا.

لەکۆتایی‌دا ئاڕاستەو ئامۆژگاری‌و ڕێنیشاندان بۆ ڕزگاری‌و بەختیاری سەپاندنو ناساندنی مافی چارەنووسو ناچارکردنی دووژمن بەبوونی کوردو مێژووی کوردستان، ئەوسا هەموو کورد دەبێتە کاوەی ئاسنگەرو کوردستانیش دەبێتە بەهەشتی سەر ڕووی زەمین.

## ((چەند شیعرێکی تر))

برایم ئەحمەد چەند شیعرێکی تریشی هەیە، لێرە بەدوا ناویان دەبەین و بەکورتی لێیان دەدوێین و لەسەری ناڕۆین بۆ ئەوەی باسەکە زیاتر دوورودرێژ نەکەین ...

### ١- خۆشەویستەکەم:

شیعرێکی هەیە لەژێر ناوی (خۆشەویستەکەم) لە ١٩٣٥/١٠/١٢ز لە بەغدا دایناوە و لەگۆڤاری گەلاوێژدا بڵاوکراوەتەوە(٦٤):

شیعرەکەی ٢٨ دێڕە و بەم شێوەیە دەدوێ:

*- خۆشەویستەکەم، ئارامی گیانم*

*- بینایی چاوم، هیوای ژیانم*

*بەم شێوەیە کۆتایی دێت*

*- تۆ بژی بۆ خۆت بێ خەم و بێباك*

*- منیش ڕەنجەڕۆ بۆت ئەچمە ژێر خاك*

*- یەکەم دڵدار نیم بە مجۆرە بمرێ*

*- تۆش یەکەم یار نیت ئەم ڕێیە بگرێ*

---

(٦٤) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥، ساڵی ١٩٤٥ز.

## ٢- ئازارو بەهار:

شیعرێکی ترە، بەم شێوەیە دەدوێ[٦٥]...

***دیسان ئازارە، دیسان ئازارە***

***لای خۆی سەرەتای گوڵ و بەهارە.***

***کەچی بۆ گەلی کوردی بێچارە***

***هەموو پەژارەو دەردو ئازارە***

ئەم هەڵبەستە ٣٨ دێڕی چوارینەیەو پۆستەرە شیعریشی پێدەوترێ..

## ٣-کوردە هاوارە:

هەڵبەستێکی ترە لەگۆڤاری (چریکەی کوردستان)[٦٦] ژمارە ٢ تشرینی دووەم ١٩٨٠ز لەلەندەن بڵاوکراوەتەوەو تیایدا هاتووە:

***کوردە تو خاکی لەت لەت کراوت***

***تو بەری ڕەنجی بەزۆر براوت***

***تو کوردستانی بە خوێن گون گوونت***

***تو بێ قەندیل و پیرەمەگرونت***

(لەبەشی دووەمی شیعرەکەدا دەڵێت )

***کوردە قوربانە ڕۆژێکە ئەمڕۆ***

***بەقسەی دوژمن مەبە دەسخەڕۆ***

***تەبایی نەبێت چیت لەوان کەمە***

***هەر ناتەبایت سەرچاوەی خەمە***

---

[٦٥] سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، سلێمانی.

[٦٦] گۆڤاری (چریکەی کوردستان)، ژمارە ٢ تشرینی دووەم ١٩٨٠ز ، لەندەن.

٤- (من پیشمەرگەی کوردستانم):

شیعرێکی تری هەیە کراوەتە سرودو گۆرانی و لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول وەك مارشی بەیانیان ئێستگەی (دەنگی کوردستان)ی پێدەکرایەوەو لەدڵ و دەروونی پێشمەرگەدا جێگای خۆی کردبووەوەو خۆشەویست بوو.

بۆجاری یەکەم (خالد دلێر) ئاوازەکەی بۆداناو سەرپەرشتی تۆمارکردن و بڵاوکردنەوەی کرد...

(من پیشمەرگەی کوردستانم)

برایم ئەحمەد / ماوەت ١٩٦٢/٧/١٠

*من پیشمەرگەی کوردستانم*

*ئامادەی جەرگەی مەیدانم*

*بەسەروماڵ و ژیانم*

*ئەیپارێزم نیشتمانم*

سروودەکە (٢٤) دێڕەو بەم دوو دێڕە کۆتایی دێت:

*دەست لەخەبات هەڵناگرم.*

*یا سەرئەکەوم یا ئەمرم*

٥- هەر کورد ئەبین - لەندەن ١٩٨١ شیعرێکی ترە، ئەگەر ئاوازی بۆدابنرێ دەست ئەدا بکرێ بەسروود لەبۆنەو یادەکان دا بەکۆرس بگوترێ.

*هەر کورد ئەبین*

*داگیرکەری دڵ پڕ لەقین*

*درندەی بێویژدان و دین*

*گەر قەندیل و ئاگری شیرین*

*یەکسان کەی لەگەڵ ڕووی زەمین*

*ناتوانی واکەی کورد نەبین*

*هەرکورد بووین و هەرکورد ئەبین*

*لە پێش ئاگر پەرستیدا*

*لە پێش موسوڵمانیەتیدا*

*لەدیلی و لەسەربەستیدا*

*هەرکورد بووین و هەرکورد ئەبین*

شیعرەکە (٣٢) نیوە دێڕە شیعرە، هەموو بەرپەرچ دانەوەی بیرۆکەی کورد تواندنەوەیە لەمێشك و خەیاڵی بۆگەنی شۆڤێنی و کۆنەپەرستەکاندا.

## ٥- چۆن ڕزگار نەبین[٦٧]:

ئەم شیعرە لەساڵی ١٩٦١ز لەکوردستان دانراوە. شاعیر ویستویەتی بەرامبەرەکەی واتێ نەگا ڕزگار بوون ئەوەندە کارێکی ئاسانەو شۆڕش سەیران و بەزمەستانە. شۆڕش کارەسات و مەرگەساتەو تێکۆشەرانی نەتەوەکەمان دەبێ پێشەکی ئەو ڕاستی یە بزانن و خۆیانی بۆ ئامادەبکەن...، ئەوسا دەتوانن بەسەر داگیرکەری کوردستاندا سەربکەون. سەرکەوتن و ڕزگار بوون خۆبەختکردن و فیداکاری زۆری دەوێ) وەك کورد دەڵێن : (ئەو هەویرە ئاوی زۆری دەوێ) یاخود (ڕێ باریك و شەو تاریك) زیندان و کەلەپچەو ئاوارەیی و برسێتی و ڕووتی و خنکاندن و جەزرەبەو لەسێدارەدان و هەڵواسین و هەموو ئەمانە بۆ ئازادی ناونیشانن. هەر کۆمەڵ و نەتەوەیك، دەبێ باجەکەی بدەن، ئەگەر نا ناتوانن سەرکەوتن و سەروەری و

(٦٧) سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا،ل٣١، سلێمانی- ١٩٩٦ز.

سەرفرازی و کامەرانی و خۆش گوزەرانی و ئازادی دابین بکەن و نیشتمانەکەیان ڕزگار بکەن و ئاوەدان بکەنەوە. هەر بەو بۆنەیەوە (خالد دلێریش) شیعرێکی جوانی هەیە زۆر لەناوەڕۆکی ئەم شیعرەی برایم ئەحمەدەوە نزیکە بۆیە دەکرێ ئیشارەی پێبدەم. خالد دلێر دەڵێت: [٦٨]

*چۆن لەڕێگەی سەندنی مافی گەلی کورد لائەدەم؟!*
*چۆن بەرە بەخوێنی سووری لاوەکانیدا ئەدەم؟!*
*قەت ئەمانە ئیشی من نین، من هەمیشە تائەژیم*
*دەرسی هەڵمەت، تۆڵە سەندن بۆ نەوەی کورد دائەدەم.*

ئەم هەڵبەستەی برایم ئەحمەد (٤٠) بەیتی تەواوە تابلۆیەکی ڕەنگاوڕەنگی کارەسات و ڕووداوە دل تەزێنەکانی خەڵکی کوردستانە، کەهەموو چین و توێژەکانی گرتۆتەوەو کەس لێی دەرباز نەبووەو ئەمانە هەمووی نرخی ڕزگارین بۆ گەلی ئێمە. شاعیر پێی وایە ڕزگاری نرخی گرانەو دوژمن بێ بەزەیی یەو ئەوەی لەدەستی بێت لەتاوان و کاولکاری درێغی ناکات بۆئەوەی ئێمە ڕزگار نەبین و هەر لەژێر دەستی ئەو بمێنین و بەروبومی وولاتەکەمان و خێروبێری بۆ خۆی ببات و داگیرکەر بۆ پاراستنی دەسەلاتی خۆی لەکوردستان خانوو بەسەر کۆرپەی ساوا دەڕوخێنێ و کچی چواردە ساڵ بەرەو زیندان دەبات و زیندەبەچاڵی دەکات، کۆشک و باڵەخانەی ئێمە دەبێت ببێتە ئەشکەوتەکان گازینۆو سینەماکانی ئێمە دەبێ لەدۆڵ و بن بەردا بێت و ئوتێلەکانمان لەناو دەوەن بێت، دەبێ بەرو

[٦٨] تێبینی: لەڕاستیدا ئەم شیعرە (چۆن ڕزگار ئەبین) جێ شەك و گومانە کە شیعری برایم ئەحمەد بێت، ڕەنگە شیعری (وریا قانع) بێت، هەر بۆیە من نموونەم لێ وەرگرنەتووە.
داخەکەم دوای مردنی برایم ئەحمەد ئەو گومانەم لا پەیدا بوو.

گژو گیا لەجیاتی کەباب بخۆین و دەبی شەقامەکانمان شەلالی خوێن بێت ئەوسا بەتەواوی ڕزگار دەبین....

## ٦- ئەی مانگ لێڵ نەبیت بەو میوانانە[٦٩]:

شیعرێکی تری ئەو شاعیرە دڵ ناسک و وریایەیە. شیعرەکە ٨٦ بەیتەو باس لەچوونی ئادەمیزاد دەکات بۆ ناو مانگ لە ٩٦٩/٧/٢٩ دانراوە بەم شێوەیە لەگەڵ مانگ دەدوێ و سکالا لەتەك ئەودا دەکات:

*ئەی مانگ کەلەلا دۆستی دێرینم*
*ڕۆشن کەرەوەی شەوگاری ژینم*
*هاورێ و هاودەمی دەستەی یارانی*
*خوێن مژی گەورەی سەرمایەداری*
*جارانی دونیا وەك ماستی مەیو*
*جارانی (گەلان) کاڵ و نەگەییو*
*ئەو سایەی (زەمین) موڵکی زۆردار بوو*
*دونیا بەهەشتی سەرمایەدار بوو*
*(ئارمسترۆنگ)و (ئەلاین)ی هاورێ*
*سێ پەیکی ئاشتین ئازاریان نەدەی*
*ئازان چلاکن بەسەرزمانن.*
*لەفاك و فیکی (نیکسۆن) نازانن*
*بەدڵی خۆش و پڕ لەهیواوە*
*نامەی دایکیان بۆ کوڕ هێناوە*

---

[٦٩] ڕۆژنامەی (هاوکاری) ژمارە ٢٩، ١٩٧١ز.

*ئەوساکە مانگ و زۆر ئەستێرەی جوان*
*ئەکرێنە مۆڵگە و هەوارگەی ئینسان*
*ئەڕازێنەوە بەدەستی زانین*
*بەڕاستی ئەبنە بەهەشتی بەرین.*

لەم هەڵبەستەدا وەصفێکی جوانی چوونەناو مانگ دەکات لەلایەن ئادەمیزادەوەو بەمانگ دەڵێت:

ئەم کەشتیوانانە ڕۆڵەی خۆتن، ئازاریان نەدەی، چونکە ئەمانە ئاگاداری فاك‌وفیك‌و پیلانی کۆشکی سەرمایەداری (بنتاگۆن)و (والستریت) (ستی)و بانکەکانی سەرمایەداری نین.

٧- **نەی ژەن:**

شیعرێکی ترە لەساڵی ١٩٤٨ز دایناوە [٧٠] لە (١٢) دێڕ پێکهاتووەو بەم شێوەیەی خوارەوە (لەگەڵ نەی ژەن) دەدوێ:

*نەی ژەن گرو دوو بەربێتە نەیت*
*ساقی ژەهری خەم بڕژێتە مەیت*
*تەنیام بێ هاوڕێم، ساپیاڵەیە مەی*
*ماندووم، دڵزارم، نامەردە سادەی*
*ئاگر بەردەرە سارای یادگار*
*یادگاری دوور لەئێش و ئازار*

گەر بەووردی لەشیعرەکانی برایم ئەحمەد بکۆڵینەوە دوو ڕاستی زۆر زەق‌و زۆر بەرچاو دەکەون.

---

(٧٠) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی نۆهەم، ١٩٤٨ز.

١-شیعرەکانی هەموو مۆرکی سیاسیان پێوەیەو شاعیر لەناو سیاسەت و نیشتمان پەروەری دا قالْ بووەو کولاوە.

یا راو بەهرەی هونەری خۆی بەکارهێناوە بۆ دەربڕینی هەست و نەستی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری.

ڕازو دۆزو مەرامی دالْداری و خۆشەویستی و جوانی سروشت و باری کۆمەلایەتی کەم تیا بەدی دەکرێ.

٢-شیعرە بەهێزو بەناوبانگەکانی هی ئەو سەردەمانەن، کەزیاتر بێئیش وکار بووە، واتە یان لەزیندان بووە، یان خەریکی گۆڤاری (گەلاوێژ) بووە. ئەوانەی لەسەردەمی سەرقالْی سیاسەتدا نووسیویەتی واتە، کەسکرتێری پارتی بووە، ئەو ئاستانەی ئەمانی نی یە، کەزیاتر دەست بەتالْ بووە. بۆیە زۆربەی ئەدیب و ڕۆشنبیران پێیان وایە ئەگەر برایم ئەحمەد لەسیاسەت کاری نەکردایە، شاعیرێکی زۆر گەورە دەبوو، بەهێزترین و جوانترین و هونەرمەندترین شیعری برایم ئەحمەد (یادگارو هیوایە) ئەگەر بێت و بەراوردی ئەم شیعرانەی لەگەڵدا بکەین لەڕووی هونەری دارشتنەوە هەست بەجیاوازی دەکەین....

بەرزی (یادگارو هیواو شەقەی بالْی پەخشانە شیعری (بەرەو ڕوناکی) زۆر پێشکەوتوترن و هونەری داهێنان و ئەندێشەی بالْە فڕی بلاوی شاعیر لەو سەردەمانەدا تەپ وتۆزو گەردەلولی هەستی گەرم و جۆش و خرۆشی بەشێوەیەك بەخشیوە لەگەلْ خوێندنەوەیدا بیستەر(گوێگر) دەخاتە جیهانێکی ترەوەو بڕواو متمانەی زیاتر پتەوو بەهێز دەکات بەگەیشتنە ئامانجی لەئازادی و سەرفرازی و بەختیاریدا.

کەچی لەشیعرەکانی دواییدا کەسەرقالْی سیاسەت بووە ئەو هونەرو بەهرانە بەرچاو ناکەون و لەو ئاستەدا نین.

٣- گیانی مۆسیقا:

٤-ڕووبەڕووی مردن:

یەکەمیان باس لەڕۆحی مۆسیقا دەکاو چ جۆرە خۆشیی و شادییەك بەگیانی ئادەمیزاد دەبەخشێ و تاڵی و ناسۆری ژیان لەبیردەباتەوەو نەشئەو شادی دەبەخشێ بەدەوروبەرەکە، بەتایبەتی ئەگەر عودو کەمانی لەگەڵابێت دەڵێت:

*گیانی مۆسیقاو وێنەیی هەستی*
*بادەیی مەستی لابەرێ پەستی*
*عودم بۆلێدە تادەم بەیانی*
*باگوێی بدەمێ بەکامەرانی*
*بلەرێتەوە تاری عودەکەی*
*بزرنگێتەوە سازی نەغمەکەی*

............تادوایی

لەڕووبەڕووی مردندا دەڵێت:

*زووکە زوو گیانە دەمەکەت بێنە*
*بەسە ناز، بەناز دڵم مەشکێنە*
*دەبێ مردن بێ، مەردانە سابێ*
*یامن یاخو تۆ، من و تۆ نابێ*
*بیدەرە دەستم پیاڵەی پڕ ژەهر*
*بابڕێتەوە ژینی پڕ قەهر*

بەم شێوەیە لەسەری دەڕواو کۆتایی بەو (٦٢) شەستودوو بەیتە شیعرە دێنێ، بەم چەند دێڕەی خوارەوە:

*گوڵی ئەمڕۆ کەسبەینێ گلە.*
*دڕکی سبەینێ دۆسییەی دڵە.*
*مردن ناخۆشە نەء. وامەزانە*
*ناخۆشی مردن خلتەی ژیانە*
*گوناهی ژینە مردن ئەزانێ*
*تاوانی بوونە بردن ئەزانێ..*

دروشمی (کوردستان یان نەمان)، کەدروشمی شۆڕشی ئەیلول بوو ... لەهەموو بەیاننامەو بڵاوکراوەیەکی پارتی دیموکراتی کوردستان و ئۆرگانەکانی حزبیداو لەنامەو کاغەزی سەرکردەو فەرماندەکانی ئەفرادی پێشمەرگەدا لەسەرەوە دەنوسراو لەکاتی وتار خوێندنەوەدا پێش هەموو شتێك وەکو دروشمی شۆڕش هێمای پێدەکرا... لەداهێنان و داڕشتنی برایم ئەحمەد بوو، ئامرازی تێکۆشەران و ڕەمزی بەرگری و خۆڕاگری بوو. کەتائێستا کەس هەست و دەرکی پێنەکردووەو باسی نەکردووە.. ئەو دروشمە دوای داهێنانی سروودی (من پێشمەرگەی کوردستانم) بەتەواوی لەناو کۆمەڵانی خەڵك و لەڕیزەکانی پێشمەرگەی کوردستاندا چەسپا[٧١].

(٧١) نووسەری ئەم کتێبە لە نزیکەوە ئاگاداری ئەو ڕاستییەیەو لەو سەردەمەدا لەناو پێشمەرگەدا لێپرسراوی هەولێر بوو.

# (چیرۆك و وەرگێڕان)

## چیرۆك

برایم ئەحمەد زیاتر بە چیرۆك نووس ناسراوە، وەك لەوەی بە شاعیر بناسرێت، هەروەها بە سیاسەتمەدارو رۆشنبیرێکی مەزنیش بەناوبانگە. لەبەرئەوەی تەمەنێکی دوورو درێژی لەگەڵ سیاسەت بەسەر بردووە، لە ئەیلولی ساڵی ۱۹۳۰ ز بەدواوە، واتە لە تەمەنی پانزە ساڵییەوە خولیای کوردایەتی بووە. گەرچی راستەخۆ تێکەڵی پارتە کوردییەکانی وەکو (هیوا)و (ئازادی)و (رزگاری)و (شۆڕش) نەبووە، بەڵام لەلاوە دەستی تێوەرداوەو هەماهەنگی لەگەڵا کردوون، تاله (۱٦)ی ئەیلولی ساڵی ۱۹٤۲ ز (کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان) دامەزراوەو، ئەم چۆتە ریزی کۆمەڵەوە کە بنکە سەرەکییەکەی لە کوردستانی رۆژهەلات — مهاباد — بووە.

دواتر لە ساڵی ۱۹٤۸ چووەتە ریزی (پارتی دیموکراتی کورد)ەوە، کە لە عێراق لە ۱٦ی ئابی ۱۹٤٦ بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزان دامەزرابوو، لە کۆنگرەی دووەمی پرتیشدا لە ساڵی ۱۹۵۱ ز بووە ئەندامی مەکتەبی سیاسی پارتی. بەهەر حاڵ وەك روناکبیرێك دەستی نووسینی هەبووەو لە شیعر دانانو رێنووسی کوردیو وەرگێڕانو زمانی پاراوی چیرۆك نووسینو دواتر لە رۆژنامەگەریدا کاراو کارامە بووە .

چیرۆکەکانی ئیبراهیم ئەحمەد بریتین لە :

(کوێرەوەری) لە پێنج چیرۆکی کورت پێکهاتووەو لە چاپخانەی (النجاح) لە بەغداد لە مانگی مارتی ساڵی ١٩٥٩ ز چاپ و بڵاوکراوەتەوە. دیارە چیرۆکەکانی زۆر پێشتر نووسراون و لە کاتی خۆیدا هەندێکیان لە گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بڵاوکرابوونەوە.

١) چیرۆکی (کەرەلۆتی مەنۆچەر) :

لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٥ز نووسراوەو لە گۆڤاری (گەلاوێژ)ی هەمان ساڵدا بڵاوکراوەتەوەو ناوبانگی دەرکردووە. چیرۆکێکی خۆشە، چونکە وێنەیەکی راستەقینەی دەقاودەق لە ژیانی لادێی کوردەواری و کولەمەرگی و مەینەتییەکانی جووتیاری کورد دەردەخات، ستەم و زۆرداری کاربەدەستانی میری ئەو سەردەمە روون دەکاتەوە بەرامبەر جووتیارەکان و خەڵکی گوندنشینی هەژارو نەخوێندەواری کوردستان و، بەتایبەت مامەڵەو کردەوەی ناشیرین و نابەجێی دەزگاکانی پۆلیس و بێویژدانی و لە خوانەترسی و چاوچنۆکی و فێڵبازی و درۆزنی و بەرتیل خۆری و دەست برین، کە چۆن لە پێناو گیرفانی خۆیاندا گاڵتەیان بە چارەنووسی خەڵك کردووە.

هەروەها کاریگەریی و کارتێکردنی ئاغا و دەرەبەگ و شێخ و نۆکەرەکانیان لەو سەردەم و زەمەنەدا، بێ ئەوەی پچێك ویژدانیان بووبێت، یان لە خوا ترسابن (ئەوراق و ئیفادەی) خەڵکیان بە ئارەزووی خۆیان گۆڕیوەو (سپی بە رەش و رەشیان بە سپی نیشانداوە).

چەند جار ئەم دەست و ئەو دەستیان بەخەڵك کردووە. ئەم چیرۆکە تابلۆیەکی دەقاودەقی ژیانی کوردەوارییە لە ژێر دەستی داگیرکەرانی کوردستان لە چلەکانی سەدەی رابردوودا. لەو چیرۆکەدا زۆر وەستایانە و

ژیرانه کارەسات و مەرگەساتی خەڵکی بەلەنگازو بێنەواو هەژاری کوردی، وەکو ڕۆژی ڕوناك دەرخستووەو لەکۆتایدا دەڵێت.

((ئاو لەسەرچاوە لێڵە، خانو لەبنەڕەتەوە وێرانە، بۆیە پێویستمان بەتەقەلای هەرەوەزی ڕێك وپێك و بێووچان و بازوی بەهێزو ژیرانەی ئەبێت بۆ ئەوەی لەسەرچاوەو لەبنەڕەتەوە بنیات بنرێتەوە)). لەم بارەیەوە (عمر معروف بەرزنجی) دەڵێت: ((برایم ئەحمەد چووە پێشەوەو بووبەڕابەرێکی ڕاستەقینەی چیرۆکی کورد، یەکەم نووسەرە کەلەسەرەتادا توانیبێتی ڕووداوی خۆماڵی و خەباتی چەوساوەکان و نەخۆشی بیرۆکراتی تێهەڵکێشی نووسینەکانی بکات قەڵەمەکەشی موعانات لە نرکەو ڕاپەڕینی جوتیارانی هەژارو زووخاو هەڵڕێژێ و دیمەنە ڕەزاگرانەکانی کۆمەڵ وێنە بکێشێت بەوپەڕی کارزانی‌یەوە هونەری تێکەڵ بەواقیع کردووەو پێشڕەوێکی ڕێبازی ڕیالیزمە لەئەدەبیاتی کوردی‌دا)).

لایەنە هونەرییەکانی ئەم چیرۆکە، وەك جوانی ووشەو ڕازاوەیی دەربڕین و ڕەوانی نوسین و پاراستنی زنجیرەی بیرەکانی و سەلیقەی داڕشتن بەچاکی بەبەرهەمەکەیەوە دیارن و نووسەر تیایدا سەرکەوتووانە مامەڵەی لەگەڵدا کردوون. ئەم چیرۆکە لەسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو لەشاری سلێمانی نمایش کراوەو بۆتە هۆی سەغڵەت بوونی میری ئەو سەردەمەو لەئەنجامدا قەدەغەکراوە.

## ٢) چیرۆکی خازێ:

ئەم چیرۆکە ساڵی ١٩٤٣ز لەشاری هەڵەبجە نوسراوە. باس لەباری نالەباری ژن دەکات لەوڵاتی کوردستان. (خازێ) کچە شۆخ و شەنگی لادێ، لەئەنجامی هەژاری و لانەوازی و دەست کورتی کەس وکارەکەی خۆی دەفرۆشرێتە پیرە پیاوێکی دەوڵەمەندو بەدفەڕو بێ بەزەیی و لەئەنجامی نەگونجان و ڕێك نەکەوتنی ناحەوێتەوەو زیزو زویر دەبێت و دەچێتە ماڵی ئاغای ناوچەکەیان. ئاغاو ئاغاژنیش پێشکەشی پیاوێکی گزیری خۆیانی دەکەن و هەرزوو ئەمیش، دوای ساڵ ونیوێك ڕابواردن و کەیف و سەفا لەگەڵی تێری لێدەخواو بەرەڵای دەکات. بێکەس و بێ پشت و پەنا دەمێنێتەوەو ئینجا کەس وکاری زەفەری پێدەبەن و هەوڵی تیرۆرکردنی دەدەن و بەبرینداری و کولەمەرگی بەجێی دێڵن. ئەمیش دوای ئەوە شێت و سەرگەردان دەبێت و دەکەوێتە کوچەو کۆڵان و منداڵە وردکە گاڵتەی پێدەکەن. ئەم چیرۆکە پێشچاوخستنی باری شێواوی کۆمەڵی کوردەواری و تێکچوونی شیرازەی ئابوری یەو فراوانبوونی دەسەڵاتی دەرەبەگە لەو کاتەدا.

بۆیە دەبینین (خازێی داماو لێقەوماو وەك چرۆیەك هەڵقرچاوو هەڵوەریوو نەگەیشتە ئامانج و ئاواتی خۆی و بەزامداری سەرگەردانی دەخولایەوە).

ئەگەر لەناوەڕۆکی چیرۆکی (خازێ) بکۆڵینەوە، دیارە نوسەر باس لەکوێرەوەری و بێدەسەڵاتی و بێبەشی و مەینەتیەکانی ژن دەکات لەکۆمەڵی کوردەواریدا، کەپیاو سالار تیایدا دەسەڵاتدارەو ژن لەهەموو مافێکی بێبەش و وەك بوکەشووشە بۆ هەوەسی پیاو بەکاردەهێنێرت. نوسەر وەك

ڕۆشنبیرێکی پێشکەوتوخواز بەرگری لەمافی ژنان دەکات و کێشەکانیان دەخاتەڕوو. ...

بۆ ئەوەی چارەسەریان بۆبکرێت، کێشەی جیاوازی لەنێوان ژن و پیاو بۆتە کێشەیەکی ئەزەلی و دەتوانین بڵێین لەولاتە پێشکەوتووەکانی پیشەسازی، وەك ئەمەریکاو یابان و ئەوروپاش بەتەواوی ئەم جیاوازیانە بنبڕ نەکراوەو ڕۆژانە لەو بارەیەوە دەیان ووتارو نووسین لەڕۆژنامەو گۆڤارەکان دا بەرچاو دەکەون .

لەبارەی چیرۆکی (خازێ)وە عومەر مەعروف بەرزنجی دەڵێت[٧٢]

((لایەنێکی گەشی نووسینەکانی، شۆڕبوونەوەیە بۆ ناخی دەردەکانی کۆمەڵ و ژیانی تاڵی ئافرەتانی کوردو باری دواکەوتنیان، دیاریش لەم لایەنە چیرۆکی (خازێ)یە کە ڕەنگی دیمەنێکی پڕ لە ژان و کسپەی بۆ ڕشتووەو سەرتاپا نوقمی پەرێشانییە، ئافرەتێکی نازداری وەك خازێ کە پەروەردەی بنەماڵەیەکی دەستکورت و پەژمردە بووە، باوکی فرۆشتوویەتی بە کابرایەکی بەساڵاچووی گوندێکی دراوسێیان بە (٢٠لیرە) شیربایی.

[٧٢] لێکۆڵینەوەو بیلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦١، عمر معروف برنجی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری.

### ٣) چیرۆکی (کوێرەوەری)(٧٣):

ئەم چیرۆکە لەساڵی ١٩٤٤ز لەسلێمانی نووسراوە. باس لەبەسەرهاتی (سۆفی حەسەن) ناوێك دەکات، کەجوتیاری گوندێکی کوردستانەو ئاغای دێ لای میری شکاتی لێکردووەو چەند جەندرمەیەکی میری چوونەتە سەری و هێناویانەتە شارو پەلکێش کراوە بەدوایانەوە (دوای پۆلیسەکان). ئینجا لەتەویلەی ولاغ (خان) بەستراوەتەوەو ڕۆژی دوایی لەپۆلیس خانە مارکوژیان کردووە بەبیانوی قەرزاری ئاغا، چونکە لەکاتی خۆی، واتە ساڵی پێشوتر (سەلەمی) کردووە بە (ریبا)، واتە بەقازانجی (تصاعدي).

ئاغاکە چەند جار ئەو قەرزەی وەرگرتۆتەوەو سەنەدەکەی نەداوەتەوە دەستی سۆفی حەسەن و هەموو ساڵێك لەنوێژنەوە پەلپ و بیانوی پێدەگرێ و تەماعی تێدەکات و گرناغەی لەمانگا زەردی مام سۆفی حسن گرتووە. ناچار سۆفی حەسەن مانگا زەرد دەداتە دەستی پۆلیسەکان لەجیاتی قەرزە درۆزنەکەو دەڵێت (هۆی هۆی هەموو ئەم ئازارو جەورە ناتەبایی و بێهۆشی و گەلوری خۆمانە).

حسین عارف دەڵێت:

(کپ بوونی برایم ئەحمەد ئەگەرچی نامیلکەی کوێرەوەری بلاکردەوە بەلام ئەوانە چیرۆکەکانی گۆڤاری (گەلاوێژ)ن(٧٤). بەلام خۆئەگەر چیرۆکی تری بێ و بلاوی نەکردبنەوە ئەوە شتێکی ترەو ئێمە ناتوانین لەوانە بدوێین، بەم جۆرە ناچارین بڵێین بەداخەوە بەبەردەوامی برایم ئەحمەد لەسەر چیرۆك نووسین خزمەتێکی گەورە ئەبوو بۆ ئەدەبی کوردی و ئەو کپ بوونەوەی زیانێکی گەورەی پێگەیاند)(٧٥).

---

(٧٣) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی ٥ی ئابی ١٩٤٤، ل٦٥-٧١.

(٧٤) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، ساڵی ٦نیسانی ١٩٤٥، ل٦٠-٧٣، هـ.ل.ب.

(٧٥) گۆڤاری بڵێسە، ژمارە ٩، ای نیسانی ١٩٦٠ز، ل٣ ، حسین عارف.

## ٤) تۆڵە سەندن:

ئەم کورتە چیرۆکە لەساڵی ١٩٤٥ز لەکەرکوك نوسراوە. بریتی یە لەقارەمانێتی و نەبەردی و بوێری و ئازایەتی و هۆشیاری و هۆشمەندی و شۆڕشگێڕی خەڵکی (کورسیکا) لەدژی داگیرکەری فەرەنسی ئەم وڵاتە، کەفەرەنسیەکان داگیریان کردبوو کۆمەڵانی خەڵك، بەژن وپیاو، جوان و پیرەوە هەستابوونە سەرپێ و گڕوکڵپەی ئاگری شۆڕش هەڵگیرسابوو، دەشت وچیا و شارو لادێی گرتبۆوە..

خەڵك داوای ئازادی و سەربەستی و سەربەخۆیان دەکرد... دەیانویست بەزمانی خۆیان بدوێن و بخوێنن و بنووسن. مێژووی خۆیان بخوێنن، کاروباری خۆیان بە وازو ئارەزوی خۆیان و بەپێی بەرژەوەندی خۆیان بەڕێوەی ببەن. شۆڕشگێڕان توانیان شاری (باستیای) ڕزگار بکەن، بەڵام داگیرکەران دوای یازدە ڕۆژو لەشەڕێکی خوێناویدا شارەکەیان لەدەست شۆڕشگێران دەرهێنا و سەدان کەسیان کوشت و هەزارانیان ئاوارەی کەژو کێوو ئەشکەوتەکان کرد. داگیرکەر حوکمی عورفی ڕاگەیاندو پێنج لاوی قارەمانی هەڵواسی.

(کابتن مۆریس) سەرۆکی مەحکەمەی عورفی فەرەنسی پیاوێکی دڵڕەق و بێویژدان و بێبەزەیی بوو. لەوپێنج لاوەی بەناحەق حوکمی لەسێدارەدانی دابوون یەکێکیان بەناوی (ب) تازە کچی مامی بەدەسگیران کردبوو، کەناوی (پولین) بوو (پولین)ی شۆڕشگێڕ توانی تۆڵەی دەسگیرانەکەی بکاتەوە بەکوشتنی (کابتن مۆریس).

لەشی کردنەوەی چیرۆکەکە بۆمان دەردەکەوێت نوسەر بەشێوەیەکی ڕەمزی بەرهەمەکەی داڕشتووە. (کورسیکا)ی وەکو هێما و ڕەمز بەکارهێناوە لەباتی وڵاتەکەی خۆی، کە کوردستانە.

لەڕووی هونەریی‌یەوە وەستایانەو پسپۆڕانە دای ڕشتووەو ڕووداوەکانی بەیەکەوە بەستووەو گرێی داوە.

دەوری ئەکتەرەکانی دیاری کردووەو کچە شۆڕشگێڕی داخۆ قین لەدڵ لەدژی داگیرکەر سەرکەوتوانە تۆڵەو قەرەبوی دەسگیران و کوڕە مامی خۆی کردۆتەوەو ئەوجا وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە. نوسەری ئەم چیرۆکە لەبەکارهێنای ڕەمزدا زیرەکانەو سەرکەوتوانە دەستبەکار بووە... کوردستانی خۆمانی لەبەرچاو گرتووەو نووسینەکانی لەڕێگاو پێناوی خزمەتی گەلی خۆی تەرخان کردووەو نەخشەی ڕزگاریی و تۆڵە سەندنەوەی لەدژی داگیرکەری بێگانە بۆکێشاون. دیارە برایم ئەحمەد لەترسی ڕەقابەی میری بەناوی (کۆرسیکاو)ە نووسیوە.

## ٥) لەوڵاتی قارەمانانا[٧٦]:

باس لەپیرەژنی کەنەفت و پەککەوتەی سۆڤیاتی (ئۆلگا ڤاسیلڤا) دەکات، کەهەردوو کوڕەکەی – ئیڤان و ئەندریڤ– لەشەڕی ئەڵماندا لەپێناو گەل و نیشتماندا شەهید کران و ئێستاش چاوەڕێی نەشتەرگەری (دیمترۆڤ) کوڕی سێیەمی دەکات، کەلەشەڕی بەرگریدا زامدار بووە. دوای نەشتەرگەری، (دیمترۆڤ) گیان لەدەست دەداو (ئۆلگای) دایکی خۆی پێ‌ناگیرێ و لەپرمەی گریان ئەدات و ئینجا دێتەوە سەرخۆو: دەڵێت: دکتۆر گیان دەستم دامێنت مەڵێ (ئۆلگا)م بینی دەگریا !!ئەزانی بۆ ؟ چونکە دوو کوڕی پێشترم شەهید بوون نەگریام، بەڵام ئێستا بۆیە دەگریم چونکی تەنیا ئەو کوڕەم مابوو شانازی پێوەبکەم لەشەڕدا بێت لەدژی دوژمنی داگیرکەری لەناکاو هێرش بەری سەر وڵاتەکەم...

[٧٦] ئەم کورتە چیرۆکە لە هەڵەبجە لە ساڵی ١٩٤٢ز نووسراوە.

(حسین عارف)[٧٧]. پێی وایە ئەم پێنج کورتە چیرۆکە لەهەڵسەنگاندندا دەستنیشان دەکرێن، کەسەربە ڕێبازی ڕیالیزمن...

لەمەدا لەگەڵ هەمونوسەرانی قۆناغەکەو بگرە قۆناغی دواتریشدا یەك دەگرنەوە، بەڵام لەگەڵ جیاوازیەکی گەورەی لەگەڵ هاوقۆناغانی‌دا، ئەویش ئەوەیە فیکرێکی ڕوون‌و بۆچوون‌و تێگەیەشتنێکی دیاریکراو بەمانای ئایدۆلۆجیایەکی ڕێپیشاندەرو ئیلهام بەخش لەپشت بەرهەمەکانیەوە ڕەنگیان تێدا دەداتەوە.

دوو جیهان، دوور جۆر خەڵك، دوو بەرە، دوو سەنگەر، لەململانێدان‌و بەیەکدا دەدەن‌و دژ بەیەکتر دەجەنگن...

ئاغاو بەگ‌و میرو دەسەڵاتدارو داگیرکەرو دەست‌و پێوەندەکانیان‌و دام‌ودەزگاکانیان لەلایەك... پاڵەو جوتیارو مرۆڤی ڕەنجدەرو زەحمەتکێش‌و چەوساوەو بەشخوراویش لەلایەکی تر.

ئامانجیش ووشیارکردنەوەو هاندان‌و ڕاپەڕینی بەرەی ئەملایە بەڕوی ئەولادا.

## ٦) ژانی گەل (یان) داستانی هیوا: [٧٨].

ئەم شاکارە ڕۆمانە لەساڵی ١٩٥٦ز لەلایەن (هـ.ل.ب= بلە) نوسراوە. پێشەکی‌یەکەی دکتۆر کمال فوئاد بۆی نووسیوە.. لەساڵی ١٩٩٦ز دووبارە چاپ‌و بڵاوکراوەتەوە.

داستانەکە لەبەسەرهاتی (جوامێر) ناوێك دەدوێت، کەلاوێکی خوێن گەرم‌و تێگەیشتوی شار بووە ... باس لەپەیوەندی‌و خوازبێنی کچە پووری بەناو (کاڵێ)ی دەکات...

---

(٧٧) حسین عارف، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە ٢١٥٢، ل٦، ٢٢/٥/٢٠٠٠.

(٧٨) برایم ئەحمەد، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، ساڵی ١٩٩٦ز ل٩٧-١٠٣.

دواتر بەسەرهات و کارەساتی لەختوخۆڕایی گرتن و بەندیخانەی (جوامێر) دەگێڕێتەوە.. ئەوجا دە ساڵ زیندانیکردنی بەبیانوی ئەوەی گوایە سەرکردەی خۆپیشاندانی کردووەو ویستویەتی هێرش بکاتە سەر پۆلیس خانەو چەك و تفاق بەسەر خۆپیشاندەران دابەش بکات و ئاژاوە بنێتەوەو ئاسایشی شار بشلەژێنێ. داستانی (ژانی گەل) لە (١٩) بەش پێکهاتووەو (٢٥٢) لاپەڕەی مام ناوەندی گرتۆتەوە.. نووسەر پێشکەشی کردووە بەگەلی جەزائیری تێکۆشەر لەخەباتیاندا لەپێناو ڕزگارکردنی نیشتمانیان و دەسەلاتی سیاسی خۆیان و وەدەرنانی ئیمپریالیزمی فەرەنسی لەولاتیاندا.

لەڕاستیدا ئەم ڕۆمانە وێنەیەکی دەقاودەقی کوردستانەوڕەنگدانەوەی شۆڕشی ڕزگاریخوازی و گەلەکەیەتی. کەسەکانی (ئەکتەرەکانی) ناو ڕۆمانەکە، ناوو ناوەڕۆك، هەست و نەستیان کوردانەیەو لەسەردەمی ڕژێمە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق بەسەر گەلی کوردستانیان هێناوەو شەلم کوێرم کەس نابوێرم تەڕو ووشکیان بەیەکەوە سووتاندووەو هەزاران کەسی بێگوناهو بێتاوانیان زیندان و زیندەبەچاڵ کردووە. ڕاستە چیرۆکەکە پێش بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان نوسراوە، بەلام نوسەر ئەوەندە شارەزا بووە بەسروشتی داگیرکەران وەستایانە چیرۆکەکەی داڕشتووە.

وەك ئەوەی بەخۆی لەناو ڕووداوەکاندا ژیابێت، بەوشێوەیە گۆی هونەری بردۆتەوەو بەشەکانی بەیەکەوە گرێداوە. تراژیدیای ناو چیرۆکەکەو بەسەرهاتی (جوامێر)و (هیوای) کوڕی و (کاڵێ)ی خێزانی و شێوەی زیندانیکردن و باری چەوت و نالەباری ناو بەندیخانەکەو شێوەی دادگاییەکەو مانەوەی دوورودرێژی لەیاریدەو هاوکاری خزم و کەسی

سەرگەردانی ژن و منداڵەکەی و باری خراپ و ناڵەباری ناو شارو ڕەشە کوژی و ڕەش بگیری و خاپور کردن و تێکدانی هەزاران گوندو دێ و داربڕین و کانی ئاوپڕکردنەوەو وێران کردن، ڕەزو باخ سووتاندن و قەدەغەکردنی هاتوچۆی ناو شارو دەوروبەری شاروگوندەکان.

ئینجا بڵاوبوونەوەی هەژاری و نەداری، نەخوێندەواری و نەخۆشی، پیسی و وێرانکاری لادێکانی کوردستان و دەستدرێژی سوپای داگیرکەرو جاش و چەکداری بەکرێگیراو بۆسەر خەڵکی هەژاری کوردستان، سەرەڕای ئەوەش کاروکردەوەی ناڕێك و ناڵەباری هەندێ لە کەسانی پیشمەرگە بەرانبەر بەخەڵکی بێتاوان کەنایناسن، هەروەها ڕۆڵی ئیجابی ڕێکخستنەکانی ناو شار لەهاندان و جۆشدانی کۆمەڵانی خەڵك بۆ بەرگری لەبەرانبەر بەدوژمن، دواتر ناچاربوونی (جوامێر) کە بچێتە ڕیزی پێشمەرگەو بەشداریکردنی لەفیداکاری لەپێناو ناموس و ئابڕو، حەیاو شەرەفی گەل و شەهیدبوونی هیوای کوڕی و کاڵێ خێزانی لەگەڵ زیاتر (٩٠)نەوەت کەس لەگوندی گوڵان، هەموو ئەم دیمەن و ڕووداوانە تابلۆیەکی ڕاستەقینەی شۆڕشی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستان دێننە بەرچاو.

هەر ئەڵێی نوسەر ئەم چیرۆکەی، (واتە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول و شۆڕشی نوێی گەلەکەمان نووسیوە.

لێرەدا جوامێر ڕەمزە، هێمایە بۆ زیندانیەکی سیاسی بێتان و ستەمی داگیرکەر، ناچاری دەکات بچێتە ڕیزی شۆڕشگێڕان و چەك بکاتە شانی کەواتە جوامێر کەسێکی ڕاستەقینە نی یەو ژن و کوڕەکەشی بەهەمان شێوە.

لێرەدا نوسەر لەکارەکەیدا شارەزایەو پارێزگاری لایەنە هونەریەکانی کردووە. بایەخێکی زۆری بەناوەڕۆك و ڕووخسار داوە. لەداڕشتن و مەرجە هونەریەکان وەك نوسەرێکی سەر بەڕێبازی ڕیالیزم هەنگاوی بەرچاوی

ناوه. برایم ئەحمەد – ڕۆڵێکی بەرچاوی لەهونەری چیرۆك دا گێڕاوەو چەپکێك کێشەی نەتەوایەتی و خەباتی چینایەتی پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەیەکەوە گرێداوەو لەم چیرۆکەدا جێگیری کردوون. بەحەماسەوە بەرەو ڕووی ئەم هونەرە چووە لەپێناو بەرژەوەندی پیرۆزی گەلەکەیدا.

## ٧) ڕۆمانی دڕك و گوڵ

چیرۆکێکی درێژەو بریتییە لە دوو بەش، بەشی یەکەم ١٣٨ لاپەڕەیەو بەشی دووەم (١٥٩) لاپەڕەیە.

بەشی یەکەمی چیرۆکەکە لە کێشەی نێوان (زۆراب بەگ)و (گوڵناز خان)ی خێزانی دەدوێ و باسی نەبوونی متمانەو پێکەوە نەگونجان لەنێوان ژن و مێردا دەکات. هەروەها زیندانی کردنی تاقە کوڕەکەیان (نەریمان)، کە خوێندکار بووە لە بەغداو بە گەیشتنەوەی بۆ شار، ڕۆژی دواتر گیراوە لەلایەن دەزگا جاسوسییەکانی ڕژێمی داگیرکەرەوە، بەبیانووی ئەوەی هاتووەتەوە سەرپەرشتی یاخیبوون و خۆپیشاندان و قڵیشانەوە بکات لە دژی میری، (نەریمان) دەستگیر دەکرێ و ڕەوانەی بەندیخانەی ئاسایش دەکرێ.

ڕێکەوت وا دەبێ ڕۆژی دوایی خۆپیشاندان دەکرێ و خەڵکێکی زۆر بریندار دەکرێن و دەکوژرێن، سەدان کەسیش دەستگیر دەکرێن و جۆرەها ئەشکەنجە دەدرێن.

کەسێکی ڕاپەڕیو بەزامداری خۆی دەگەیەنێتە ماڵی زۆراب بەگ ی باوکی نەریمانی شۆڕشگێڕو تێکۆشەرو زیندانی کراو، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆراب بەگ پیاوێکی خراپ و چاوچنۆك و دڵپیس و ترسنۆك و بێ بارو بەرچاوتەنگ و کاسەلێس بوو.

خۆی لەبەرپرسانی ڕژێم نزیك دەکردەوە، مامەیی لەبەردەکردن و هەر خەریکی پارەکۆکردنەوەو داوێن پیسی بوو، پەیوەندی لەگەڵ زۆر ئافرەتی نەفس نزم هەبوو، هەمیشە ڕێگرو لەمپەر بوو لەڕووی گوڵناز خانی خێزانی و نەریمانی کوڕی، کە بەشداری بکەن لە تێکۆشان شانبەشانی میللەتەکەی خۆیان.

هەرچەندە نەریمان و دایکی گوێیان پێ نەئەدا، لەهەمان کاتدا (فەرەیدون) ناوێك خزمی زۆراب بوو، ڕۆڵێکی ناجوامێرانەی دەگێڕا لەتێکدانی پەیوەندی نێوان زۆراب و گوڵناز خانی خێزانی و گزیری و دوو زمانی و دەلاڵیشی بۆ زۆراب بەگ دەکردو جاروبار دزیشی لێ دەکرد، بەدرۆو تەڵەکەبازی قۆڵی (خورشە)ی کارەکەری بڕی بوو..

(ئاسکۆڵ)یش کچە مام و ئامۆزای گوڵنازخان ژنێکی ڕێك و پێك و زۆر باش بوو، بەدەنگیانەوە دەهات، بەتایبەتی لەو کاتەدا کە (برزۆ) بەزا مداری لە ماڵی گوڵناز خان بوو.

(دکتۆر کامەران)یش زۆر هاوکاری لە تیمارکردنی زامەکانی (برزۆ)دا دەکرد بەبێ ئەوەی ماوە بدا کەس هەستی پێبکات.

لەم بەشەی چیرۆکەکەدا تاوانبارکردنی ڕژێم و نەریتە گومڕاییانەکەی کە نرخی مرۆڤایەتی تیا نابینریّ و لەسەر ستەم بنیات نراوەو ڕەنگی داوەتەوە. هەروەها بەزەقی دیارە، نووسەر لە ڕووی هونەری تەکنیکەوە شوێنی تایبەتی خۆی گرتووە.

هەڵبژاردنی پاڵەوانی چیرۆکەکە (زۆراب بەگ) و دوور نەکەوتنەوەی لە واقعێکی گونجاو مەرجێکی سەرەکی چیرۆکنووسی سەرکەوتووە.

لێرەدا بەپێی خواست و مەبەست کەرەسەی ڕووداوەکان و کەسانی ناو چیرۆکەکەی دەرخستووە. بەوەش ڕەنگێکی ڕاستەقینەی پێ بەخشیوە..

نووسەر کەرەستەکانی بابەتەکەی لەناوجەرگەی شارەوە دەرهێناوەو مرۆڤی پاکی وەك (گوڵناز خان)و (ئاسکۆڵ خان)یشی دیاری کردووە بەرامبەر نا پاکی و داوێنپیسی و ڕاڕایی و گومڕایی (زۆراب بەگ)و (فەرەیدون)ی شاگردی ڕایگرتوون.

## بەشی دووەمی ڕۆمانەکە.

بەشی دووەمی ڕۆمانەکە پێکهاتووە لە سەفەرکردنی زۆراب بەگ بۆ بەغدا، بۆ ئازادکردنی نەریمانی کوڕی بەهۆی (نووری بەگ)ی خزمییەوە، کەلەبەغدا پارێزەر بووەو لەسەردەمی حکومەتی (نووری سەعید)یشدا کۆنە وەزیر بووە.. لە بەغدا لە ئوتێل دابەزیوە. بەهۆی خزمەتچییەکی ناو ئوتێلەکەوە کە ناوی (بەهنام) بووە، دۆستایەتی و ناسیاوی لەگەڵ ژنە لوبنانییەك بەناوی (مەدام جۆرج)، پەیدا کردووە.

(مەدام جۆرج) مێردەکەی کە ناوی (جۆرج خلیل) بووە، لەلایەن کاربەدەستانەوە گیراوە، بە بیانووی پڕوپووچ بۆ خۆ نزیك کردنەوە لە ژنەکەی و دەستبەسەراگرتنی بۆ کاری نابەجێ و ئابڕووبەرانە.

دیارە یاساش لە پشتیانەوە وەستاوەو داکۆکی و پارێزگاری لێ کردوون، هەروەها نەزانی و نزمی پلەی گوزەران و ئاڵۆزی ژیان، ئەمانەش پەیوەست بە دەسەڵاتی بێ سنووری ساماندارەکانەوە بووەو بۆیە بە مەیل و ئارەزووی خۆیان کچ و ژنی خەڵکی هەژاریان خافڵگیر کردووەو کاری ناڕەوایان لەگەڵدا کردوون.

ئیتر دوای ئەوەی سەردانی نووری بەگی حزمی کردووە، لەجێگای تایبەتی خۆی (نووسینگەی پارێزەری). مامە قالەی قاوەچی و بەردەستی

نووری بەگ زۆر ڕێزی لێ دەگرێ‌و داوای تووتنی لێ دەکات‌و ئەمیش بەڵێنی پێ دەدات.

نووری بەگ دێتەوە بەخێرهاتن‌و ماندوو بوونی لێ دەکات‌و هەواڵی گوڵنازخان‌و نەریمانی لێ دەپرسێ، (زۆراب بەگ)یش هەواڵی گرتنی نەریمانی پێ ڕادەگەیەنێ.

نوری بەگیش لە وەڵامدا دەڵێت ئاسانەو چارەی دەکەم‌و، پێی دەڵێت تۆ سەرێکی ماڵەوەی (مونا خانم)ی دایکی (عدنان)بدە چاوەڕێتان دەکات‌و ڕەنگە کاری پێتان بێت.

بەهەر حاڵ، پێش ئەوەی بچێتە ماڵی نووری. بەگ شەو لە ئوتێل چاوی بە مامۆستایەکی ناسیاوو دۆستی خۆی دەکەوێت، بەیەکەوە دەچنە تیاترۆ خانەو کاتێکی باش بەسەر دەبەن.. بۆ شەوی دواتر وادەیان هەبوو لە ماڵی نووری بەگ کە میواندارییەکی گەورەی کردبوون‌و چەند لێپرسراوێکی گەورەی میری بەشداری میوانداریییەکە بوون، بانگێشت کرابوون بۆ سەر خوانی نووری بەگ. لەوانە بەڕێوەبەری گشتی پۆلیس‌و ئاسایش‌و کۆنە وەزیری دەرەجە دار، جۆرەها خواردن‌و خواردنەوەو مەزەو میوە لە ئوتێل (سمیرامیس)وە لەگەل چەند خزمەتچیەك هاتبوون، خزمەتیان دەکرد، مێز ڕازایەوەو خواردنەوەو یاری پۆکەر دەستی پێکرد.. لەلاوە (ژێربەژێر) نووری بەگ‌و زۆراب بەگ جەختیان لە بەڕێوەبەری پۆلیس دەکرد بۆ ئازادکردنی نەریمان.. ئەویش خوا هەڵناگرێ پیاوانە پەیمانی پێدان.

بۆ بەیانی بەهەر شێوەیەك بێت بەرەڵای بکات، نووری بەگ بە پارەی زۆراب بەگ دەستی بەیاری پۆکەر کرد. هەروەها میوانداریەتییەکەش لەسەر حسابی زۆراب بەگ بوو.

دوای ئەوەی نووری بەگ زۆری دۆڕاند، داوای لە زۆراب بەگ کرد لە جێگای دابنیشێ‌و یاری بۆ بکات. لە ماوەیەکی کەمدا زۆراب مێزەکەی پێ چۆڵ کردن‌و زەرەرەکەی خۆیانی هێنایەوەو (٢٢٠ دینار)ی زیادیشی بردەوە. هەریەکەیان (١١٠) دیناری قازانج بوو، جگە لە (٩٠) دیناری دوو چەکی بانك.

بۆ ڕۆژی دواتر نەریمان کوڕی زۆراب بەگ ئازاد کراو لەگەڵ باوکی دەچنەماڵی نووری بەگی خزم‌و دۆستیان بۆ ئەوەی نووری بەگ تۆزێك ئامۆژگاری بکات، تا واز لە سیاسەت بهێنێت‌و خەریکی خوێندن‌و ڕابواردنی خۆی بێت. دیارە نەریمان ئەو قسەو ئامۆژگاری‌و ڕاوێژانەی نووری بەگی قبووڵ نەبوو، کەوتە دەمەتەقێیەکی سەخت لەگەڵ نووری بەگدا. لەجیاتی ئەو ئەم قەناعەتی بەو کرد ئامادە نییە ڕێگەی خەبات بەربدا. چونکە ئەو ڕژێمە گەندەڵ‌و بودەڵەیە.

بمانەوێ‌و نەمانەوێ بەرەو چاڵی نەمان دەڕواو تەمەنی بۆگەنی کورتە بەو هەموو حساباتە سیاسییانەی ئەو ڕۆژگارە. باوکی‌و نووری بەگیشی هێنایە سەر ئەو باوەڕە ئەو حکومەتەی عێراق نۆکەری ئەڵقە لەگوێی ئیمپریالیزمەو دوژمنی سەرسەختی نەتەوەی کوردەو هەموو دەرگاو پەنجەرەکانی لەخەڵك گرتووەو ئازادی‌و سەربەستی‌و خۆشگوزەرانی‌و بەختیاری لەکۆمەڵانی خەڵك زەوت کردووە.

بۆیە پێویستە خەبات لەدژی بەردەوام بێت، تا کۆتایی بەدەسەڵاتی ستەمکارانەی دێت. هەرچەندە نووری بەگ زۆری وت بەڵام نەریمان کەمی بیست. کەگوایە کوردایەتی هیچ ئەنجامێکی نییەو نابێ‌و کورد نابێت بەهیچ‌و ناگاتە ئەنجام. هەرچی نەریمانە گوێ بیستی قسەکانی نەبوو.

زۆر زرنگ و ژیرانەو بەهێمنی و هێوەری شێوازو ڕێبازی کوردایەتی و سەرکەوتنی حەتمی گەلی بۆ شیکردنەوەو دەیان بەڵگەو نموونەی بۆ هێنانەوە.

جاروبار زۆراب بەگ دەهاتە خەت و لایەنگری نووری بەگی دەکرد، بەڵام لەبەرامبەر هوشیاری و خۆڕاگری و پتەوی بیروباوەڕی بەرزی نەریمان هیچیان خۆیان پێ ڕانەگیرا.

لەلایەکی تری دانیشتنەکە، (زۆراب بەگ)و (مونا خانم) خەریکی ئیمزاکردنی بەڵێننامە (عقد)ی هاوبەشی بوون، دوای ئەم بێنەو بەردەیە، نەریمان و باوکی گەڕانەوە ئوتێل و زۆراب نەریمانی ڕازی کرد، کە ئەویش دایکی خۆی گوڵناز خان ڕازی بکات ماڵەکەیان بێتە بەغدا، چونکە سلێمانی بەکەڵکی دانیشتن نایەت و لە بەغدا کارو کاسبی زۆرترە.

نەریمان نامەیەکی جوانی بۆ دایکی نووسی و پشتگیری خۆی دەربڕی لە پرۆژەی ماڵ گواستنەوە بۆ بەغدا، لەولاشەوە زۆراب پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ سلێمانی، (جۆرج خەلیل)و هاوسەرەکەی قەناعەت پێ کردن بەیەکەوە کارو کاسبی بکەن و ئاپارتمانێك بگرن بە کرێ و بیکەنە نووسینگە بۆ کاروکاسبی، پارە لە زۆراب و کار لەوان. ئەو نووسینگەیە بکرێتە جێگای حەوانەوەی شەوو ڕۆژی جۆرج و خێزانەکەی.

ئەوە بوو بەیەکەوە سەیری ساختمانێکیان کرد، چوار ژوورو هۆڵێکی باشی تیا بوو، ڕێکەوتن ساڵی بە (٢١٠) دینار. جۆرج خەلیل و هاوسەرەکەی بەم ساختمانە زۆر دڵخۆش بوون و بەبیری خۆیان دەرگای ڕەحمەت و نازو نیازیان بۆ لەسەر پشت کراوەیە، ئاگاداری ئەوە نەبوون، زۆراب بەگ لەژێرەوە خەریکەو چ پیلانێکی بۆ خانمی هاوسەری داڕشتووە.

بۆ ڕۆژی دواتر زۆراب گەڕایەوە سلێمانی بەڕوویەکی خۆش و قسەی لووس و هەنگویناوی بۆ ڕازی کردنی گوڵناز خان بۆ گواستنەوەیان بۆ بەغدا.

لە دڵی خۆیدا خەریکی لێکدانەوەو شیکردنەوەی ئەو بەرنامەیە بوو، پیلانی دادەنا چۆن باسەکە لەگەڵ هاوسەرەکەی بکاتەوەو ڕازی بکات.

دوای چەند ڕۆژێك دوو دڵی و لێکدانەوە، نامەکەی نەریمانی دایە گوڵناز خان. ئەمیش زۆر بەنابەدڵی ڕازی بوو، هەرچەندە لەدڵی خۆیدا هەستی کردبوو ئەم ماستە موویەکی تێدایەو زۆراب لەژێرەوە شتێکی تری لەژێر سەردایە.

دوای چەند ڕۆژێك مام قادر تەلەگرافی کرد بۆ زۆراب بەگ، کە لەنزیك ماڵی نووری بەگ، خانووی بۆ گرتوون و داوای لێکرد دەستبەکار بێت.

ئیتر زۆراب و فەرەیدون ڕێککەوتن. کە فەرەیدون سەرف و سونی کارەکانی بکات و قەرزەکانی بۆ وەربگرێتەوەو لە ٥٪ی ئەو قەرزانە بۆ فەرەیدون بێت و لە خۆشیا وەخت بوو باڵ بگرێت، چونکە لە خەویشدا ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات..

گوڵناز خان کەوتە سەردانی خزم و کەس و کارو دوعاخوازیو خانووەکەیان بەکرێ داو خۆشیان چونە ماڵی ئاسکۆڵ خانی خزمی، تا ڕۆژی سەفەرکردن بەرەو بەغدا.

بەیانی ڕۆژی سەفەرکردنیان (خورشە)ی کارەکەر چووە دەرەوە قاوەڵتیان بۆ بێنێ، ڕۆیشت و نەهاتەوەو بزر بوو. زۆر چاوەڕوانیان کرد بێ هوودە بوو، ناچار کەتنە ڕێ و زیاتر نەدەکرا چاوەڕێ بکەن. لەبەر ئەوەی ماڵەکەیان بار کرابوو.

- تەواو -

بە بۆچوونی من: ئەگەر بەسنگ و تەرازووی هەڵسەنگاندنی ئەدەبی، ئەم ڕۆمانە بکێشین و لە قۆناغێکی دیاری کراودا بینرخێنین، دەبینین برایم ئەحمەد نووسەرێکی بالایەو لە ریزی پێشەوەی بەخشین و داهێنان و هونەرمەندیدایە. بەرهەمەکانی مایەی سەرنج و لێکۆڵینەوەی شارەزایانی ئەدەبی کوردین و بەرێزو نەوازشەوە دەتوانین پەنجە بۆ سەرکەوتنی رابکێشین بەتایبەت لەو قۆناغەی چیرۆکی کوردی پێدا تێپەڕ بووە.

نووسەر لەم چیرۆکەیدا بایەخێکی چوونیەکی بەڕووخسارو ناوەڕۆك داوە، بۆیە دەبینن لە دارشتن و ڕۆنان پاراوی ڕەوانەی زمان و مەرجە هونەرییەکانی وەستایانەو شارەزایانە بەسەر هۆش و زەینی خوێنەرو خوێندەواراندا زاڵەو سەرکەوتووەو هونەرمەندانە لە دڵی خوێندەواران جێی تایبەتی بۆ خۆی کردووەتەوەو ئەوەش کالای سەردەم بەرهەمەکانییەتی، وەك نووسەرێکی سەر بە ڕێبازی ڕیالیزم هەنگاوی گەورەو بەربلاوی ناوەو پارێزگاری لایەنە هونەرییەکانی کردووە.نووسەر لەم چیرۆکەدا بەکەلێن و کەلەبەرەکانی شاراوەی ئەم ژیانە ئاشنامان دەکات و لاپەڕەی چەند دەردێکی کۆمەلایەتیمان بۆهەڵدەداتەوە، کەهۆیە سەرەکیەکانی تێکچوونی ژیانی خێزانییە بەگۆڕانی هەڵسوکەوتی زۆراب و دیداری لەگەڵ ئافرەتی لەش فرۆش و کەوتنە داوی یاری قومارو خواردنەوە.

لەلایەکی ترەوە چیرۆك نووس ویستوویەتی تاماوەو مەودایەکی فراوان و بەربلاو دیمەنی دڵسۆزی و وەفاداری و دلۆڤانی ژنی کوردستان نیشان بدات (گوڵناز خان) بەرانبەر بەهاوبەشی ژیانی سووتان لەو پێناوەدا.. هەرچەندە لەژیانییدا خۆشی لێ نەدیبوو، بەلام تروسکایی لەدەروونیدا نەکوژابووەوە.

ڕووداوی چیرۆکەکە هەروەکو نووسەر بۆخۆی باسی دەکات، دەگەڕێتەوەبۆسەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابردوو- واتە نیوەی دووەمی چەرخی بیستەم – لەوسەردەمەدا دەوڵەمەندەکانی شاری سلێمانی ڕوویان لەپایتەختی عێراق دەکرد، ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان: بۆ کاروکاسبی و دیارە لەشارە گەورەکان کاروکاسبی باشتر بەڕێوە دەچوو قازانجی زیاتری لێ چاوەڕوان دەکرا. دووەم: نائارامی شارەکانی کوردستان بوو بەهۆی بزووتنەوەی سیاسی، کەلەو سەردەمەدا پتر گڕوکڵپەی سەندبووو بڵێسەی ئاگرەکەی هەموو لایەکی گرتبووە.

دەوڵەمەندو سەرمایەدارە خۆماڵیەکان دەروازەی کارو کاسپیان لێ تەسك کرابووەو لەهەمان کاتدا ڕۆڵەکانیان بەشداری ئەو جووڵانەوە سیاسیانەیان دەکردو بگرە هەندێکیان ڕۆڵیان تیا دەبینی. هەر بۆ نموونە، کۆچکردوان (دکتۆر سەروەری کاکە حەمەو، ئەمیری حەفید زادە) لەسلێمانی و شەهیدان (مەئمون دەباغ و مەناف و جەمال حەیدەری، فازلی سەعید ئاغاو شەمسەدین موفتی) لەهەولێر.

هەموو ئەو هۆیانە ڕۆڵیان هەبوو لەوەی سەرمایەدارو دەست ڕۆشتووەکانی شارەکانی کوردستان ڕوو لەبەغدا بکەن بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانیان لەسیاسەت دوور بخەنەوەو تووشی گرتن و گێرمەو کێشەیان نەکەن.

هەروەك لەڕۆمانی (دڕك و گوڵ)دا هاتووە، سەرباری ڕۆڵی کوڕە بۆرژواکان لەبزوتنەوەی شۆڕشگێڕی دا لەناو شارەکانی کوردستان دا لەو ئان و ساتەدا دەبینین کوڕە شێخ و سەرەك عەشیرەتەکان ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو لەبەشداری کردنی بزووتنەوەی نیشتمانی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی مارکسی لەکوردستان دا.

هەربۆنموونە لەدەشتی دزەیی و دەوروبەری شاری هەولێردا کوڕە ئاغاو دەرەبەگەکان بەتایبەتی کوڕانی حوسەینی مەلا لە گوندی ( قازی خانە) و کوڕانی حەمە دەمین دزەیی لەگوندی (دوو گرتکان)و برایم عەلی لە گوندی (ئۆمەراوا)و مشیر ئاغالە گوندی (قوڵتەپە) هەستی نەتەوایەتی و سیاسی و شۆڕشگێڕی و پیشکەوتن خوازی و بیروباوەڕی ( مارکس)و (لینین)، ئەوان بڵاویان دەکردەوە لەناو جوتیارانی دەشتی دزەیی و بووە هۆی ڕاپەڕینە مەزنەکەی جوتیاران لەدەشتی هەولێر لەساڵی ١٩٥٣زدا.

ئەو ڕاپەڕینەی پارتی و شیوعی ڕابەڕایەتیان دەکرد بووبەهۆی هەڵگرتنی ستەمی چواریەك و سۆرانەو سوغرەو زبارەو ئاو خواردنەوەو ڕێگرتن لە دەرکردنی جوتیار لەسەر ئەرزو بەبێ هۆ...

بۆیە لەم ڕۆمانەدا (دڕك و گوڵ)- دەبینین نووسەر زۆر بەووریایی و ژیری، بەبیری وردو هەستی ناسك، ئازارو ئەندێشەی بڵاوو بێ سنوور، داڕشتنی ووشەو دەربڕینی جوان و ڕازاوە، بەزنجیرەی نەپساوەی هزرو بیری خۆی چیرۆکەکەی کێومال کردووە، بەشێوەیەك دەکرێ لەڕیزی پێشەوەی ڕۆمانە جیهانییەکان پایەیەکی بۆ دەست نیشان بکرێ، بەتایبەتی لەدەربڕین دا.

بەلای ( حسین عارفەوە) لەچیرۆکە کورتەکاندا ململانێی چینایەتی زاڵەو لەڕۆمانەکاندا نەتەوایەتی ئەگەر چی لەهەردوو کیاندا فیکرێکی ڕوونی شۆڕشگێڕانە هاندەرو ڕەنگرێژی بەرهەمەکانە[٧٩].

[٧٩] حسێن عارف (ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ) ژمارە ٢١٥٢، شەممە ٢٠٠٠/٥/٢٢، ل٦،

# (٢)

# وەرگێڕان

لەبواری وەرگێڕاندا برایم ئەحمەد دەستێکی باڵای هەبووەو دەتوانین بڵێین لەوسەردەمەدا شۆڕە سواری مەیدانەکە بووە، چونکە لەدەسپێکی نووسینەوە، کەیەکەم نامەی بۆ ڕۆژنامەی ژیان ناردووە لەساڵی ١٩٣٢ز وادەی داوە بەژیان، کەوتار لەڕۆژنامەکانی ڕۆژئاواوە بۆ وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردی. دیارە ئەو بەڵێنە لەو کات و ساتەدا، کەهێشتا سەرەتای ژیانی لاوێتی و خوێندکاری بووە، یاراو بەهرەی لەخۆیدا بینیوەو دڵخوازو ئارەزووی وەرگێڕانی هەبووەو زمانی ئینگلیزی زانیوەو لەمەیدانی فێربوونی ئەو زمانەدا خۆی ماندووکردووە. لەزمانی عەرەبیشدا شارەزا بووە، بەبەڵگەی ئەوەی لەساڵی ١٩٣٧ز توانیویەتی بەناوی ( الاکراد والعرب) نامیلکەیەك بەزمانی عەرەبی چاپ و بڵاوبکاتەوە. شارەزایی لەزمانی عەرەبی و ئینگلیزی ئارەزوو زەوقی ئەدەبی هاوکارێکی باشی بووە، کە بەئاگا بێت لەئەدەب و ڕۆشنبیری جیهان و لەڕووداو بەسەرهات و کارەسات و کێشەکانی دونیادا.

ئەوەندەی بۆیکراوە کەڵکی لێ وەرگرتووە ئەوەی بۆ ئەو ڕۆژە سوودی بووبێت وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

بەدواداچوون و شارەزایی پەیداکردن لەئەدەب و کەلتورو ڕۆشنبیریی و بیروباوەڕە تازەکانی دونیا کاریان تێکردووە چ لەباری ئەدەبی و لەباری ڕامیاریشەوە لەنەتەوە پەرستی (ژ.ك)ەوە بەرەو ئایدیای ناسیونالیستی و سۆسیالیستی و بیروباوەڕی مارکسی... لەشیعرو پەخشان و چیرۆکەکانیدا لەکلاسیکەوە بەرەو ڕۆمانتیك و ڕیالیستی سۆسیالیستی ڕۆیشتووە.

ئەو بیروبۆچوونانەی لەکاری ڕۆژانەی سیاسی و چیرۆکەکانیدا ڕەنگیان داوەتەوە، کەهەموو باس لەچینی چەوساوەو کرێکار دەکەن..

تادەگاتە ئەوەی لەپرۆگرامی پارتیدا لە ساڵی ١٩٥٣ز، کەدەبێتە سکرتێری گشتی بەزەقی بیروباوەڕی سۆسیالیستی پێوە دیارەو دایڕشتووە، بۆیە دەتوانین بڵێین برایم ئەحمەد ڕۆشنبیری بەئاگا بووە، لە فاك وفیكی سەردەم تێگەیشتووە، لەگەڵ ڕەوڕەوەی پێشکەوتن ڕۆیشتووە، مەلەوانێکی شارەزاو باش بووە.

لەوەرگێڕاندا ئەو چیرۆکانەی هەڵبژرادووە، کەلەڕاستی بارودۆخی کوردستانەوە نزیك بوون و هەستی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری و شۆڕشگێڕی یان تێدا بەهێزبووە، بۆ ئەوەی خوێندەواری کورد ئەو هەستانە لەناخیدا بێت و خەبات لەپێناویدا بکات.

برایم ئەحمەد زۆر چیرۆك و وتاری لەزمانەکانی بێگانەوە وەرگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی و لەڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بلاوکراونەتەوە.

زۆربەری زۆری ژمارەکانی (گەلاوێژ) چیرۆکی وەرگێڕدراوی برایم ئەحمەدیان تیادا بلاوکراوەتەوە. هەروەها دەیان وتاری لەسەرکردەو فەرماندەو گەورەپیاوانی دونیا، کەلەڕۆژنامەو گۆڤارەکانی ڕۆژئاواوە وەری گرتوون و وەریگێڕاونەتە سەرزمانی کوردی... .

لەوانە لەسەر ( غاندی، نەهرۆ، ناپلیۆن، ترۆتسکی، لینین، چەرچل، مارشاڵ نای، فۆرشیلۆف، ئەناتۆل فرانس، .... تادوایی)..

هەروەها چەندین وتاری تری وەرگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی لەسەر ( وولاتی ژاپۆن)، ( ژنانی ترکستان)، ( پروسیا. خاکی گوم بووی کوردستان) هەروەها چەندین وتاری وەرگێڕاوی تری هەیە لەسەر:

١- ماتا هاری جاسوسی هەرەبەناوبنگ لەمێژوودا.

٢- چۆن ئیش بکەین.

٣- خوێندنەوە.

٤- ڕابواردنی بەخۆشی لەماڵەوە.

٥- بلیمەتی.

٦- نبرەیەکی تاڵ.

٧- هۆی تەنگ‌وچەڵەمەی سناعی.

٨- ڕەگەزو خوێن پاکی.

٩- شێت یاژیر.

١٠- ووتارێکی ( مستەر ئی پی‌سۆن).

١١- ڕۆژنامە نهێنییەکەی پلۆدسکی.

١٢- دراو

١٣- ئیش بەدەست.

١٤- یەك بیر ئازارم دەدات.

لەبواری چیرۆکی وەرگێڕاودا ئەم چیرۆکانەی لەزمانەکانی بێگانەوە وەرگرتووە لەوانە...

## ١- تۆڵە سەندنەوە[٨٠]:

چیرۆك نووسی بەناوبانگی ئینگلیزی (تۆماس ئەلەن)، وەرگێڕ برایم ئەحمەد ئەم چیرۆکە باس لەشێوەی تۆڵەسەندنەوەی باوکێك دەکات، کەکوڕەکەی لەئەمەریکا کوژراوە لەلایەن (پۆڵسۆن) ناوێکەوە لەشاری (Pesent City). کوڕە کوژراوەکە ناوی جۆنسۆن بوو، باوکی ناوی (راتری)ی بوو، ئەوەبوو بەهەرحاڵ (راتری) تۆڵەی کوڕەکەی کردەوەو (پۆلسۆن)ی لەتینا خنکاند.

## ٢- بازرگانی ڤینیسیا: The Mercant of Venice

بازرگانی ڤینیسیا یەکێکە لەچیرۆکە بەناوبانگەکانی (ولیام شکسپیر)ەو کورتکراوەی (چارلس لام)ە وەرگێڕانی بۆسەر زمانی کوردی (برایم ئەحمەد)ئەم چیرۆکە دەربارەی بازرگانێکی دەوڵەمەندی جوولەکە بوو بەناوی شایلۆك (Shylock). لەشاری ڤینیسیای ئیتاڵیدا. ئەم بازرگانە دەوڵەمەندە زۆر ڕژدو پیس و چاوچنۆك، دڵ ڕەق و بێبەزەیی بوو.... هەموو خەڵکی شارەکە ڕقیان لێی بوو لەبەر ئەو ڕەوشتانەی لەسەرەوە باسکران... لەبەرانبەردا بازرگانێکی تر هەبووە بەناوی (ئەنتۆنیۆ Antonio) پیاوێکی تابڵێی باش و چاوتێرو دەست بڵاوو بەڕێز بوو. خەڵك هەموو خۆشیان دەویست. ئەم دوو بازرگانە زۆر ڕقیان لەیەکتر بووە، چونکە دوو بۆچوون و دوو هەڵوێستەی جیاوازیان بوو بەرانبەر بەخەڵك و خوا.

(ئەنتۆنیۆ) دڵ نەرمترین و باشترین پیاوی سەردەمی خۆی بووە، لەچاکەکردن بەرانبەر بەخەڵك ماندوو نەدەبوو. هەرلەو سەردەمەدا ئەنتۆنیۆ هاوڕێیەکی زۆر خۆشەویست و خانەدانی هەبووبەناوی (باسانیۆ –

[٨٠] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ١-٢، ساڵی ٣، کانوونی دووەم و شوباتی ١٩٤٢ز، ل(٨٧-٩٢).

Bassanio) ئەم مرۆیە لەخانەدانەکانی ڤینیسیا بوو، لەباوك و باپیریەوە میراتێکی کەمی بۆبەجێ مابوو، چونکە دەست بڵاوو چاوتێر بوو.

( باسانیۆ) دەچێتە لای (ئەنتۆنیۆ)ی هاوڕێی داوای لێدەکات دەستی بگرێت بۆ ئەوەی خۆی ڕاستبکاتەوەو خانمێکی دەوڵەمەندی زۆر خۆشەویستی هەبوو تابیخوازێت...

بۆ ئەو مەبەستە پێویستی بەسەد هەزار (دوکاتی Ducat)ی ڕۆمانی هەبوو. بەقەرز بۆ ئەوەی ئەو خانمەی پێبگوازێتەوەو ئەوسا پارەکەی ئەم بداتەوە.... ڕێکەوت وادەبێت لەوکاتەدا (ئەنتۆنیۆ) پارەکەی لەدەستا نابێت و هەمووی بەکەل وپەل و شت و مەك درابوو ئومێدی هەبوو لەماوەیەکی نزیکدا بۆی باربکرێت و بگاتەجێی مەبەست و بفرۆشرێت و لەگەڵ سەماریەکەی قازانجێکی زۆریشی دەست بکەوێت.

بۆیە بەیەکەوە دەچنە لای (شایلۆك)ی بازرگانی ڕژدو پیسکەو دەست قووچاوو داوای لێ دەکەن و ئەویش دەیانداتێ بەمەرجێك سەنەدێکی بۆ ئیمزا بکەن، ئەگەر قەرزەکەی دواکەوت لەکاتی دیاریکراودا بتوانێت (پاوەندی) گۆشت لەهەرجێگایەك لەلەشی ئەنتۆنیۆ بەئارەزوی خۆی بکاتەوەو هیچ قازانجیشی لێناوێت لەبەرامبەر قەرزەکەدا.

لەوەودوا دۆستایەتی یەکتر بکەن و چیتر نێوانیان گرژو نائارام نەبێت...

دیارە ئەم سەنەدەش هەربۆگاڵتە پێیانی ئیمزا کردو نیازی خراپی تێدانییەو مەبەستی هیچ کارێکی خراپ نییە بەرانبەر ئەنتۆنیۆ. باسانیۆ زۆر ناڕازی بوو لەو ئیمزاکردنەو ئەنتۆنیۆ گوێی نەدایەو بەیەکەوە چوونەلای پارێزەرێك سەنەدەکەیان کردو پارەکەی وەرگرت و دایە باسانیۆ...

قەزاوقەدەر وارێکەوت کەشتیەکانی ئەنتۆنیۆ لەکاتی خۆیدا نەگەیشت توشی شکست هاتن و دەنگ وباس بڵاوبووە کەلوپەلەکانی هەمووی فەوتاوە...

کاتی دانی قەرزەکەش هاتبوو. باسانیۆش چوو خانمەکەی کەناوی (پۆرشیا Portia) بوو لەناوچەی ( بلمۆنت –Belmont) دەژیا لەنزیك ڤینیسیا گواستەوەو زەماوەندی خۆی سازدا، کەبەڕاستی پۆرشیا خانمێکی جوان و ژیر بوو، لەجوانی و خاتوونی و سەلاری‌دا لەپۆرشیای بەناوبانگی کچی (گیتۆ Cato)ی ژنی ( برۆتس Brutus)هیچ کەمتر نەبوو باسانیۆ بەیارمەتی و پشتگیری ئەنتۆنیۆی هاوڕێ و کەسوکارێکی زۆرەوە بەپێش خزمەتی (گراسانیۆ Grationa)ی پیاو ماقوڵی بەناوبانگ ڕووی‌کردە بیلمۆنت و پۆرشیای گواستەوە، پۆرشیای شۆخ وشەنگ بەبەسانیۆی ووت:–

( من کچێکی نەخوێندەوارم، دونیام کەم دیوە، بەلاَم هێشتا ئەوەندە نەچوومەتە ساڵەوە کەفێر نەکرێم، واگیانی خۆمت ئەخەمە بەردەست چۆن ئارەزوو ئەکەیت واهەڵی سووڕێنە) هەروەها گوتی: ( خۆم هەرچیم هەیە بۆ تۆو هی تۆیە).

لەوەرگێڕانی هەرچیرۆك و باسێکدا دوو شت زۆر گرنگ و پێویستە لەبەرچاو بگیرێ، تاوەرگێڕ تیایاندا سەرکەوتوو بێت.

*یەکێکیان واتایە:* کەزۆر گرنگە وەرگێڕ بتوانێت ماناو ناوەڕۆکی چیرۆکەکە بەتەواوی بدات بەدەستەوەو زنجیرەی بیری ڕووداوەکە لەپچڕاندن بپارێزێ و تووشی دابڕینی نەکات.

*دووەم:* تام و چێژو سەلیقەی چیرۆکەکە مەرجی سەرەکی‌یە، کەوەرگێڕ بتوانێ پارێزگاری لێ بکات و تام و بۆی کەم نەکاتەوە، شان بەشانی ئەوەش ڕەوانی زمان و ڕازاندنەوەی دەربڕینەکان.

ئێمە پێمان وایە برایم ئەحمەد لەوەرگێڕانی ئەم چیرۆکەدا بەتەواوی توانیویەتی پارێزگاری لەو دوو بنەما سەرەکیە بکات و لەڕووی هونەرو تەکنیك و فۆرم و داڕشتن و زەوقەوە سەرکەوتووانە هاتۆتە دەست و هەر دەڵێی خۆی چیرۆکەکەی داڕشتووە نەك لەزمانی ئینگلیزییەوە وەریگێڕابێ..

چیرۆکەکەشی لەناوەڕۆکدا ئیلهام بەخشە بەخوێندەوارو گوێگر، کەپیاوی واپیس و چاوچنۆك خەڵك و خوا ڕقی لێیەتی و هەرگیز سەرکەوتوو نابێت و پیاوی باش و بەخشندەو دەستبلاویش جێگای ڕێزوستایش و حورمەتی هەموو خەڵکە.

ئەم شاکارە ڕۆمانە، کەنووسەر وەریگرتووەو بلاوی کردۆتەوە بۆ ئەوەی خوێندەواری کورد وانەو پەند لەو ڕووداوو ئەزموونە وەربگرن، کەلەناوەڕۆکی ڕووٚمانەکەدا هاتووە، هەست و بیری ئینسانی و چاکە لەدڵ و دەروونی خەڵکدا بچەسپێ و گەشەبکات لەجێی ڕەزیلی و دڵ ڕەقی و چاوچنۆکیدا.

## ٣- خان و کوڕەکەی[٨١]:

نووسینی نووسەری بەناوبانگی سۆڤیەتی (مەکسیم گۆرگی ١٨٦٨ز-١٩٣٥ز) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد (Selected Russian Short stories)

لەنیمچە دوورگەی ( قەرم)دا خانێ هەبوو (موسەیلەمە ئەلئەسراب) (مسیلمة الأسـراب) بیان پێ‌ئەووت کوڕێکی هەبوو (طليـق الغلـة) یان پێ‌ئەگوت.

---

[٨١] گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە ١٠، ساڵی ٦، ١٩٤٥ز.

بەم وتانـەی سـواڵکەرە کوێـرە تاتاریەکـەی پـاڵی دابـوو بەقـەدی بـۆری بریقەداری مێوە مارانەکەوە..

سـەرەتای گێڕانەوەیـەکی لەئەفسـانە کۆنـەکانی نیمچـە دوورگەکـەی دامەزراند، کەپڕن لەبیرەوەری و یادگاری ڕۆژانی ڕابردوو.

بەدەوری حیکایـەت خوانەکەدا دەستەیەك تاتـار بەبەرگی ڕەنگـاوڕەنگی بریسکەدار لەبەرو کەلاوەی بەتاڵی ژێـر نەخشـێنراو لەسـەر، دانیشـتبوون لەسەر ئەو پارچە بەردانـەی ئـاخۆ ڕۆژگـار لەکۆشـکی کـام کۆنـە خانـەدانی کردۆتەوە...

ئێوارەبوو ڕۆژ لەسـەرخۆ خـەریکی نوقـوم بـوون بـوو لەدەریاکەدا تیشـکە سـوورەکەی ئـەیدا لـەو کۆمەڵـە گـەڵا سـەوزە پیرانـەی وەریبوونـە دەوری کەلاوەکـەو بـەگوڵ گوڵـی ڕۆشــن ڕۆشــنیش ئــەیدا لەبــەردە قــەوزە داپۆشـراوەکان و لاولاوە سەوزە هـەڵچووەکان. بائـەیدا لـەلق وپۆپی سـوورە چنارە پیرەکان، دەنگـێ لەگەڵاکانـەوە دەھـات دەتـووت چـەند جۆگـە ئاوێکی نادیار بەناو ھەوادا ئەڕۆن، دەنگی سـواڵکەرە کوێرەکە، کەبێ تین و لـەرزۆك بوو، چرچ و لۆچی ڕووە بەردینەکـەی لـەدڵنیایی بـەولاوە چیـتری نـەدەنواند. ئەو وتانەی لەبەری کردبوو کەوێنەکەی پڕ ھێزو پێزانینی ڕۆژانی ڕابردووی خۆمانیان تیادەدی.

خــان پــیر ببــوو کــابرای کوێــرە ووتــی: بــەڵام گــەڵێ ژنــی ھــەبوو لەحەرەمەکەیدا. چونکە ھێزو گوڕی ھێشتا ھەرمابوو بەخۆوە گوشینەکانی گەرم و گوڕو بەتین بـوون ھـەموو خۆشـیان دەویسـت. خۆژنیـش ھەمیشـە ئەوکەسەیان خۆش دەوێت کەتوند بەخۆیانەوە ئەگوشـێ حـەز دەکـات باپیر بێـت، ھـەموو دەموچاویشـی چرچ ولـۆچ بێـت چونکە جوانـی لەھێزدایـە نـەك لەپێسـتی لـووس و ڕوومــەتی وەك گوڵـدا. ئـەوان ھــەموو خانیـان خـۆش

ـەدڵا چوو بوو.

ـەکەی خۆشی

کەهەریەکـــە

جـوان بوون و

ـەربەســتی

ــــپـەڕن. زۆرجار

ــردە لای خۆی بۆ قەڵاکەی، کەبەسەر دەریادا

ـیڕوانـی و کەلـەوێدا هـەرچی پێویستە بۆ ئەوەی ژیـانی پڕبکـات لەخۆشـی بۆی ئامـادەکردبوو.. لەهـەمان کـاتدا خـان پشـت ئەسـتوور بـەو زانینـەی (ئەلگالا)ی کوڕی ناوبـانگی خانەوادەکـەی کـەم ناکاتـەوە، کـەوەکو گـورگ پـەلاماری دەشـتەکانی ڕوسـیای‌دا. ئـەو وولاتـەی هەمیشـە بـەتاڵانی زۆرو ئافرەتی تـازەو سـەرکەوتنی نوێـوە لێـی ئەگەڕێتـەوەو سـام و خوڵـەمێش و لاشەو خوێنی تیا جێ‌دێڵێ. جارێك ( ئەلگالا) لەپەلاماردانێکی سەر ڕوسیا دەگەڕایەوە بەزم‌وڕەزمی تیا دامرکێنێتەوە. دوای ئەو بێ‌دەنگیە بەدەنگێکی نزمی لەسەرخۆ ووتی: ( بیبە کەئاهەنگەکە بڕایەوە ئەتوانی بیبەیت).

ئەلگالای ئازا لەخۆشیدا وەك گوڵ گەشایەوە هـەر کەئاهەنگەکە کۆتـایی هـات، هـەردووکیان لەکۆشـك چوونـەدەرێ بـۆ حـەرەم، شـان بەشـانی یـەك بێ‌دەنگ، خان ووتـی: ( ڕۆژ بەڕۆژ ژیـانم ڕوو لەکزی‌یـە، لێدانـی دڵـە پیرەکەم تـادێت هێواشتر دەبێتـەوە. هەمیشە ئـاگری دڵم لەکوژانەوەیـە) ڕۆشـنایی و هێزی ژیانم بەخۆوە گوشین و گەرم و گوڕی ئەو کچە (قۆزاقیـە) بوو پێم بڵـی

هەربەڕاستی گەرەکتە؟؟ سەد لەژنەکانم بەرە هەموویان بەرە بۆ خۆت لەبریتی ئەو). کوڕە بێدەنگ هەناسەیەکی هەڵکێشا.

خان ووتی: چەند ڕۆژێکم ماوە ئەو کچە ڕووسیە دوا خۆشی ژیانمە – هەر ئەو ئەمناسێ و هەر ئەو خۆشی ئەوێم کەئەو نەما کێ منی ئەوێ؟ هیچ کامیان کەسیان (ئەلگالا) چۆن ئەژیم تۆ دەستت کردۆتە ملی و ئەویش ماچت دەکات.. لەبەرامبەر ژنێکا من و تۆ باوك و کوڕ نین، بۆ ژنێك ئێمە هەموو پیاوین. کوڕم لام خۆشتر بوو کەهەموو زامی کۆنی لەشم دەمیان بکردایەتەوە و دوا دڵۆپی خوێنم لەلەشما نەمایە نەك ئەو شەوەم چاو پێبکەوتایە.. کوڕەکەی هەر بێدەنگ بوو.. هاتە گۆو لەسەر خۆ ووتی بابە، من زۆر دەمێکە حەزم لێکردووە، خان ووتی ئەشزانم ئەو حەز لەتۆ ناکات. خان نەختێ بیری کردەوە و ئینجا لەبەر خۆیەوە ووتی تۆ خۆتت لەوو لەمنیش پتر خۆش ئەوێت – بەڵێ تۆش وایت. خان ووتی: ناتوانم بیدەم بەتۆ ناتوانم.

منیش لەمە زیاتر خۆم پێڕانەگیراو... یادڵم هەڵدڕەو یابمدەرێ.

خان بێدەنگ بوو بالەسەر ماهی زەردەکانەوە توورِی بدەینە ناو دەریاکەوە. خان ووتی باشە: هەردووکیان چوونە ژووری کچە، لەسەر جێگای خۆ ڕاکشابوو نووستبوو. بەرامبەری وەستان تەماشایان کرد فرمێسك لەچاوی خان باسقەنەی ئەبەست وەك مرواری بەرپیشە زیوینەکەیدا ئەهاتە خوارەوە کوڕەکەشی ڕاوەستابوو بزەی چاوی ئەهات

کچە هەڵسا و،لێوە سوورەکانی بۆ خان بردە پێشەوە ووتی ماچم کە هەڵۆکەم.

خان بەناسکی پێی ووت ئەبێ لەگەڵمان بێیت ئینجا.

ئەلگالا و فرمێسکی چاوی هەڵۆکەی خۆی پێکەوە دی و گورج بۆی چوو زوو لەهەموو شتێ گەیشت ووتی یەم نەبۆ ئەمتان نەبۆ ئەوتان دەبم .

هەرسێکیان بێ دەنگ ڕوویان کردە دەریاکە. خان کچەکەی ماچ کرد ووتی: ( خوات لەگەڵ) ئەلگالاش بۆی چەمایەوەو ووتی خوات لەگەڵ کچە تەماشایەکی خوارەوەی کرد کەشەپۆل گۆرانیان ئەوت و دەستی گوشی بەسکیەوە و پاشەوپاش کشایەوە دواوەو پێی ووتن فرێم دەنە خوارێ. ئەلگالا دەستی بۆ درێژ کردو هەناسەیەکی هەڵکێشا. بەڵام خان گرتیە باوەشی توند گوشی بەسنگی خۆیەوەو ماچی کردو هەڵی گرت و خستیە سەرسەری و کوڕە ووتی بابە بابڕۆین.

خان وەکو گوێی ڕاهێشتبێ چرپانی ووتی ڕاوەستە. دیسانەوە کات تێپەری شەپۆلەکان لەخوارەوە ئەیاندا بەیەکا و باهەڵیکرد بەسەر تاوێرەکان و لەنا درەختەکاندا ئەی لوران.

کوڕە بابە با بڕۆین نەختێکی کەش ڕاوەستە. چەند جارێك ئەلگالا ووتی بابە بابڕۆین بەڵام خان نەجولا دوایی ڕاست بۆوەو ووتی بابڕۆین کەوتنەرێ، بەڵام لەپڕ خان وەستا و لەکوڕەکەی پرسی. بەڵام من بۆ کوێ ئەڕۆم؟ بۆ کوێ؟ ئیتر بۆچی بژیم؟ هەموو ژیانم بەوەوە بوو. من پیرم

بێگومـان کەسـێك خۆشـی نـاوێم و کەسـێکیش کەکـەس خۆشـی نـەوێت و حەزی لێنەکات کەرێتی‌یە لەم دونیایەدا بژیت. بەهەنگاوی خێرا خان چووە لێواری زەردەکەو خۆی فڕێدایە خوارەوە کوڕەکەی دەستی نەهێنایە ڕێی و نەی‌توانی چونکە نەی‌پەرژا. دیسانەوە لەدەریاکەوە هیچ نەبیسترا نەهاوارو نەدەنگی کەوتنی خان تەنیا شەپۆلەکان بەیەکیاندا ئەدا لەخوارەوە، ئەیان گرمان و باش هەر گۆرانی سەیری خۆی ئەووت.

تولە بەگ (کوڕە ) زۆر بەزەردەکەدا ڕوانیـە خـوارەوە.لـەدواییدا ووتـی خوایە دڵێکی وابەهێزیش بدە بەمن ئیتر لەتاریکی شـەودا وون بـوو. بـەم جۆرە خان لەناوچوو لەجێی خۆی کوڕەکەی بووە حوکمداری (قرم)....

ئەگـەر سـەیرێکی ئـەم چیرۆکـە بکـەین، دەبینـین وەرگـێر هێنـدەی سەرکەوتنی چیرۆك نووس تیایدا سەروکەوتووە. چیرۆکەکە خۆی لەخۆیدا چیرۆکێکی خۆشەو نووسەری ئەصلی تیایدا سـوارو سـەرکەوتوو بـووەو باس لەژیانی خۆشی پاشایەك دەکات، کەخاوەنی دەسەڵات و ماڵ و کوڕو سەدان ژنی جوان بووەو ئینجا سروشتی ئادەمیزادی بەدەسەڵاتی نیشان داوەو چۆن مادەو جنس ناکۆکی دەخەنە نێوان کوڕو باوك و دایك و خوشك. هەروەکو فەیلەسوفێکی گەورەی وەك (لینین یان مارکس) دەڵێـن: ( هـەرچی لەم دونیایە ڕویداوەو ئەوەشی لەمەودوا ڕوودەدات هۆکەی تەنها مادەیە).

ئینجا دڵ ڕەقی کوڕە میرو ئاغاو بەگزادەکان دەردەخات...

سەرکەوتوویی وەرگێڕ لەوەدایە لەوەرگێڕانەکەیدا مانای چیرۆکەکە نەگۆڕاوەو وەك خۆی ماوەتەوەو زنجیرەی بیرۆکەی چیرۆکەکەی وەستایانە پاراستووە. ووشەی زۆر جوان و پاراوی بەکارهێناوە. لەڕازاندنەوەی دەربڕینەکاندا شارەزایانە هاتۆتە دەست و لەڕووی زمانەوانیەوە باشی دەربڕیو خوێندەوار هەست ناکات ئەم چیرۆکە وەرگێڕدراوە، بەڵکو دەتخاتە دونیای خەیاڵاتی ئەوەی، کەچیرۆکێکی خۆماڵی بێت و ڕووداوێکی ڕاستەقینە بێت، چونکە لەڕووی هونەرو تەکنیکەوە باڵادەست و سەرکەوتووەو گۆی هونەری بردۆتەوە.

## ٤- فیڵی ژنێک[٨٢]:

ئەم چیرۆکە ڕاستەقینەیە لەیادگاری پۆلیسێکی (سکۆتلاندیار) وەرگێڕدراوەو برایم ئەحمەد کردویێتی بەکوردی. ئەم کورتە چیرۆکە زۆر خۆش و دڵگیرە. باس لەفێڵی ژنان دەکات بەم شێوەیە:

(لانك) کچێ ئەبێت جوان و ئێسك سووك، ژیانێکی تێروتەسەل و خۆش ڕائەبوێرێت و هەمیشە خەریکی خۆڕازاندنەوەو ئارایش و جوان کردنی خۆی ئەبێت. ڕۆژێك جلی هەرە گرانبەها لەبەردەکات و خۆی زۆر باش ئەڕازێنێتەوەو سواری عەرەبانەیەکی جوان ئەبێ و ڕووئەکاتە دوکانی گەوهەر فرۆشێکی گەورەی لەندەن..

[٨٢] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٩، ساڵی١، مانگی ئابی ١٩٤٠ز، ل٤.

کەئەچێتە ژورێ هەرچی گەوهەرو خشڵی گران بەهاو جوان هەیە داوای بینینیان دەکات و ئەم دیوو ئەودیویان ئەکات و کابرای گەوهەر فرۆش واتێدەگات ئەمە بەڕاستی کڕیارێکی چەورو زیاتر ڕێزی ئەگرێ.

(لانک خان) ئەڵێت: دەمەوێ گەوهەری هەرە گرانبەهاتانم چاو پێبکەوێت، کابرای گەوهەر فرۆش دەچێت لەسندوقە پۆڵاکە دەری دێنێ لەناو چەند قوتویەکی چەرم بەدەستەوە کەوا گەوهەرەکانیان تیایە پیشانی (لانک) یان ئەدات ئەویش یەکێکیان پەسەند دەکات کەبەقسەی کابرا چاکترین گەوهەری دوکانەکەیەتی و نرخەکەی لە (دە هەزار) لیرە کەمتر نییە.

لانک خان دەڵێت: گەوهەر فرۆش دەمەوێت ئەمە نیشانی مێردەکەمی بدەم، کەناوی دکتۆر (کۆنگدەن)ە چونکە ناتوانێ نەخۆشخانەکەی جێبێڵێ و نازانم چیبکەم؟

گەوهەر فرۆش دەڵێت: کەواتەخانم تۆ خێزانی دکتۆر (کۆنگدەنی) بەڕێوەبەری نەخۆشخانەی نەخۆشی مێشکیت؟

لانک .. بەڵی وایە.

ئینجا کابرای گەوهەر فرۆش بەتەواوی ئەگۆڕێت، چونکە ئەزانێ یەکێکی وەك دکتۆر (کۆنگدەن)ی بەناوبانگ و دەوڵەمەند بەئاسانی دەتوانێ دەهەزار لیرە بدات بۆ ڕازیکردنی دڵی ژنە جوانەکەی.

خانم ووتی: ئاخ ئەمشەو ئەگەر بمتوانیایە ئەم گەردانەیە لەملکەم پیشانی مێردەکەمی بدەم؟ ئەوە عەرەبانەکەمە لەبەردەرگا، لێرەشەوە نەخۆشخانە زۆر نزیکە.

گەوهەر فرۆش ووتی: فەرمو بائەم شاگردەم لەگەڵتا بێت و پیشانی دکتۆری بدەن و ئەگەر ڕازی بوو پارەکەی بدەنێ و ئەگەر ڕازی نەبوو گەردانەکە بنێرەوە، لانک خان ئەچێتە ژووری دکتۆرو پێی دەڵی کوڕی

خوشکم (خوشکەزاکەم) تەمەنی ٢٢ ساڵەو تووشی نەخۆشی مێشك بووە نامانەوێ کەس بزانێ و ئێستا بەمنەوە گرتویەتی و دەڵێ گەردانەکەم بدەوەو پێشتر بەدایکیەوە گرتبووی، دەیگوت دەستت بەخوێنەو خەڵکت کوشتووە، پێم باشە فەحسێکی چاکی بکەیت و گوێ لەقسەکانی نەگریت گوێمەدە بەهات و هاواری، بەڵام من ئەچمە دەرەوە بەئارەزووی خۆت هەموو پرسیارێکی لێبکەو بیدوێنەو گوێشی لێبگرە. منیش ئەگەر دەرگایەکی تر هەبێت بچمە دەرەوە زۆر باشە.

دکتۆریش ووتی: بانگی بکەو تۆ لەو دەرگایەوە بڕۆرە دەرەوەو چاوەڕێی بە.

خانم کوڕەکەی بانگ کردە ژووریێ و خۆی بۆی دەرچوو.

دکتۆریش کەوتە پرسیارو وەڵام لەشاگردە کلۆڵەکەو شاگرد واقی وڕمابوونەیدەزانی مەسەلەکە چییە؟ هەستی کرد دکتۆر بەهەڵە لەمەسەلەکە گەیشتووەو کردی بەهاوارو قیژەو گوتی دکتۆر گیان من نەخۆش نیم گەردانەکەم یا پارە !!.

ئەگەر باوەر ناکەیت ئەوە تەلەفۆنی دوکانەکەمان و ئەوە خاوەن دوکانەکە ئەم زۆری گوت و دکتۆر کەمی بیست و خانمیش بۆی دەرچوو...

گەیشتە سەردەریا و بلیتی پاپۆری بری و سواربوو بۆ ئەمەریکا شاگردو گەوهەرفرۆش دەستیان لەبنی هەمانەوە هاتەدەروەو منیش هاتمەوە هیچم پێنەبرا.

لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکە دیارە کە وەرگێڕ توانیویەتی زنجیرەی بیرو بۆچوونی نووسەری چیرۆکەکە بپارێزێ و بەئاگاییەو ڕووداوە ڕاستەقینەکەی لەزمانی ئینگلیزیەوە وەرگێراوە، بۆیە دەڵێم بەئاگاییەوە چونکە تام و چێژو زەوقی چیرۆکەکە لەوەرگێڕاندا کەم نەبۆتەوەو بۆن و

بەرامەی ڕەسەنی خۆی پاراستووەو لەکۆمەڵی کوردەواری (مەکری ژنــان) زۆر باوەو قسەی لەسەرکراوە.

ئەم چیرۆکەش یەکێك لەمەکرو فێڵی ژنان دەردەخات. هەروەها سروشتی ژنان، کەحەز بەجوانی و خۆڕازاندنەوە دەکەن دەردەخات.

(لانك خان) تێروتەسەل بووەو بەدڵی خۆی ڕایبواردووە، بەڵام زۆرتر حەزی لەخشڵی گرانبەهاکردووە. جوانیەکەی خۆی تەرخان کردووە بۆ پیلان و هەڵخەڵەتاندنی خشڵ فرۆش و دکتۆری مێشك و ئەوان بڕوایان بەسەرو سیماو جوانی (لانك) کردووەو ئەویش تەڵەکەبازی و پیلانی خۆی سازکردووە، دەمێ دەس بەکاربووەو ڕاستەوخۆ بەرنامەکەی ئامادەبووەو وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە.

ئەم چیرۆکە ئەو لایەنەی ژنانمان بۆ دەردەخات، کەلەپێناو خۆڕازاندنەوەو ئارایش و جوانکاریدا ئارەزووی بێ سنووریان هەیەو، لەو پێناوەدا ئامادەن کاری ناشایستەو نایاسایی بکەن، نووسەر لە وەرگێڕانی ئەم چیرۆکەدا ویستوویەتی لایەنی یاخود بڵێین دیوی ناوەوەی ئارەزووەکانی ژنانمان بۆ دەربخات.

## ٥- لەشەوی جەژنا:

نووسەری ئەم چیرۆکە (هانز کرستیان ئەندرسۆن)یەکێکە لەنووسەرە هەرەگەورەکانی دانیمارك. وەرگێڕانی برایم ئەحمەدەو ساڵی ١٩٤٣ز. ئەم چیرۆکە سەرگوزشتەی کچە منداڵێکی هەژار دەگێڕێتەوە لەچلەو سەرماو سۆڵ بەندان و تۆفی زستاندا، کەبەفرو بارانێکی یەکجار زۆر باریوەو کچە جوانکیلەکە لەماڵەوە هاتۆتە دەرەوە بۆ شقارتە فرۆشتن و ئەو ڕۆژی هیچی لێنەفرۆشتووە شەوی بەسەردا دێت. ئەو شەوە شەوی جەژنی لەدایك

بوونەو لەترسی باوکی ناوێری بگەڕێتەوە ماڵەوە لەبەرئەوەی هیچی نەفرۆشتووە، ڕەنگە باوکی دارکاری بکات. کچە چەندین دەنکە شقارتە دادەگیرسێنێ بۆ دەست گەرم کردنەوەو لەگەڵ بڵێسەی هەر دەنکە شقارتەیەکی خەیاڵی بۆلای قازی برژاوو میوەی خۆش و بینینی نەنکی چووەو لەئەنجام دا لەجێگەی خۆی لەسەرماندا وشك و ڕەق بۆتەوە.

## ٦- تاوانی باوکێک[٨٣]:

لەمۆباسانەوە وەرگیراوە. وەرگێڕانی برایم ئەحمەد ساڵی ١٩٤٣ز هەموو شاری (فیزی لەرتیل) بەجارێك لەپشت تەرمی (مسیو بادەن لیریمانس)وە ئەڕۆیشتن کەبردیان لاشەکەی بەخاك بسپێرن. هەموو فرمێسکی گەرمیان بۆئەڕشت و هەناسەی ساردیان بەدوایدا هەڵکێشا، کەحاکمی شارەکەی هەڵسا قسە لەسەر تەرمەکەی بکا وتی ( گەورەکانم پیاوی چاك و بەشەرف بەمردنی (مسیو بادەن لیریمانس) یەکێکیان لێ کەم بووەوە. هەربەڕاستی بادون پیاوێکی بەشەرف بوو لەهەموو کارێکدا کەبیکردایە، پیاوێك بوو دەست پاك و زمان پاك و بەخشندە، کەلەناشتنی بوونەوە کوڕو کچ و زاواکەی گەڕانەوە ماڵەوەو ئۆقرەیان لێبڕابوو لەخەم دا. وەسیەت نامەیەکیان لەناو کتێبخانەکەی دەرهێناو خوێندیانەوە نووسرابوو (مناڵە خۆشەویستەکانم بڕوا ناکەم لەودنیا هەرگیز سرەوتم بێت تاباسی گوناهێکی خۆمتان بۆ نەکەم کەبەهەرزەکاری کردوومە بەدرێژایی تەمەنم تارماییەکەی بەرچاوی بەرنەداوم).

---

[٨٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧، ساڵی٤، مانگی تەمموزی ١٩٤٣ز، ل٦٤.

تاوانەکەشی بریتی‌یە لەکوشتنی منداڵێکی بیژیی خۆی لەگەڵ کچێکی پاریسی هەژاردابۆ ئەوەی کچی پیاوێکی دەوڵەمەند بخوازێ و واز لەکچە هەژارەکە بهێنێ. کوشتنی منداڵەکەش بەهۆی سەرماوە بوو تاگیانی دەرچووە.

## ٧- وولات پەرستی[٨٤] :

وەرگێڕانی برایم ئەحمەد ١٩٤٣ز.. ئەم چیرۆکە باس لەکچە فەرەنسیەك دەکات، کەکاتی گەنجی لەپاریس کوڕێکی ئەڵمانی ناسیوەو خۆشی ویستووەو مێردی پێ‌کردووەو بەخۆشی لەگەڵی ژیاوەو پاشان مێردەکەی لەشەڕی یەکەم لەگەڵ فەرەنسادا کوژراوەو هەستی نیشتمان پەروەری وای لێ‌کردووە سەربازێکی برینداری فەرەنسی بشارێتەوە، سەربازە فەرەنسی‌یەکە گیانی خۆی بەخت دەکات لەپێناو پاراستنی شەرەفی ژنە فەرەنسیەکەدا.

## ٨- خەوبوو[٨٥] :

چیرۆکی (گی‌دی موباسان) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد ١٩٤٣ز ئەم چیرۆکە هی چیرۆك نووسی بەناوبانگ (گی‌دی موباسان)ە.

هەروەکو نموونەیەکی بیروباوەڕیەتی بەرامبەر بەمرۆڤ تێکڕاو بەرامبەر ئافرەت بەتایبەتی. هەروەها وەرگێڕانی (حەرفیە) کەنموونەیەکی ئەخەینە

---

[٨٤] ولاتپەرستی، کۆمەڵە چیرۆکێکی جیهانییە، برایم ئەحمەد کردوویە بەکوردی، ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، ١٩٩٦.

[٨٥] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٢، ساڵی٤، ١٩٤٣ز.

پێش چاو (دڵداری کرد خۆش ویستراو مرد) ( ڕۆژێکی باران ئەچێتە دەریَ خیانەت لەدڵدارەکەی بکات، سەرمای بوو مرد).

ئەم ووشانە نوسراوی سەر کێلی قەبرەکان بووە (لێرەدا جاك ئۆلیڤان پشووئەدات لە (٥١) ساڵیدا مرد بۆ ئەوەی سامانی باوکی پیَ ببڕێت بەدڵ ڕەقی‌یەکی وا لەگەڵی جولآیەوە کەبووبەهۆی لەپێش وەختا کوشتنی، گەڵ ئازاری ئەدا زۆری لەمناڵەکانی ئەدا، فێڵی لەدراوسێکانی ئەکرد لەهەرکەسی بۆی‌بکرایە دزی ئەکرد بەبەدبەختی سەری نایەوە.)

## ٩- داستانی کچێك[٨٦] :

(چیرۆکی گی دی موباسان) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد..

کچە ووتی نەزان بووم‌و کوڕێکی دوکانداری دراوسیَ هەڵی خەڵەتانم‌و ڕووم کردە شار استغلالیان کردم لەگەڵیان ڕامبواردم ئەم دەست‌و ئەو دەستیان پی‌کردم جانازانم تاوانی من یاتاوانی ڕۆژگارو کەس‌وکارم بوو کەتووشی ئەم شەرمەزاریە هاتووم گریا و لەگەڵی گریام، لەوڕۆژەوە بەزەیم بەژنا دێتەوەو ڕقم لەپیاوە..

## ١٠- لیرەیەك[٨٧] :

(لووسیان دی هەم) لەدوای ئەوەی دوا پارەی گیرفانی دۆڕاند کورسیەکەی بەجیَ‌هێشت سەرشۆڕو خەمبار خۆی بەکێش کرد تاگەیشتە کورسیەکی قوڵ درێژ کەلەقوژبنێکی ساڵۆنەکەدا دانرابوو لەوێوە بەچاوی

---

[٨٦] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، ساڵی١، مارت، ١٩٤٠.

[٨٧] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧، ساڵی١، ١٩٤٠ز، بەکورتی لە (فرانسۆ کوبی)یەوە وەرگیراوە.

پڕلەقین و دوژمنایەتیەوە ئەیڕوانیە یاریکەران کەهەریەکە کۆمەڵی لیرەیان لەبەردەم دا بوو، لەپاشان گەڕایەوە سەرخۆی گەڵێ سەزەنشت و لۆمەی خۆی کرد و گەڵێ قسەی بەخۆی ووت بەم جۆرە بەدەم شەپۆلی بیر و لێکدانەوەی جیاجیاوە هاتووچوو تاخەوی لێکەوت. لووسیان لیرەیەکی لەکچێکی هەژار دزی دیسان ئەچێ قوماری پێئەکات و پارەیەکی ئێجگار زۆر ئەباتەوە. دوای سەعات دوو ئەچێتە جێگای کچە بچکۆلەکە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆی بیباتەماڵەوە دەبینێ کچە مردووە لەوڕۆژەوە، قوماری وازلێهێناو چووە جەزائیر و بوبە عەسکەری فەرەنسا و کەوتە چاکەو پیاوەتی..

## ١١- لەژوور سەری نەخۆشێ[٨٨] :

نووسینی (ی.ل. بیرتس) نموونەی ئەدەبیاتی تازەی عیبرانی‌یە.

نیوەشەوە تاریکە چاوچاو نابینێت. دەنگەدەنگ دێ لەجەهەنەمەوە، هی نێڵەنێڵی ئاگر و هاژەی لێشاوی قەترانی لەکوڵ و قاقای پێکەنینی ئاگر خۆشکەران و ناڵەناڵ و هاواری دڵتوێنەوەی ئازار داران.

دەنگێکی تیژ بەرزبووەوە گرمەو هەراکەی بڕی ئەیووت: داڤید لەگیانەلادایە ئەجەلی ئەویش هات پەیڕەوی دەستوری شەرعی نەئەکرد لەنینۆك کردندا گوێی نەئەدایە دەست نوێژ، زۆرجار نوێژی ئەچوو کێ بنێرین گیانی بکێشێ؟ من!

فریشتەیەکی ناشرین قژبژ وەڵامی دایەوە، مەنجەڵێکی تریان خستە سەرئاگر و پڕیان کرد لەقەتران، کڵپەی ئاگر بڵێسەی سەند بزە فڕی و لەچاو وون بوو، فریشتە جوانەکە لەژوورسەری نەخۆشەکە وەڵامی دایەوە و ووتی:

---

[٨٨] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١١،١٢، تشرینی یەکەم و دووەمی ساڵی ١٩٤٠ز.

(خـوای ڕەحمـەت ناردومیەتـە ئێرە چونکـە ئـەم کابرایـە پیـاوێك بـووە خێرەومەندو دڵسۆز، گوێی نەداوەتە دەستنوێژ بەڵام دەستوپل پاك بووە. نوێژی چووە، ئەو خەریکی دڵدانەوەی لێقەوماوان بووە....

## ١٢- قارەمانی کچێکی لیتوانی:

نووسینی (نیپومنباشچی)، وەرگێڕانی برایم ئەحمەد...

ماریچامە ئیفیکیت. کچێ بوو تازە بۆ بیست ساڵی دەچوو. لەشاری (زاراسـی ی) لـەدایك بووبـوو کەبـەلیتوانیا ناوئـەبرێت و بـەگۆمی دڵگـیرو دارستانی چڕو گردە جوانەکانی بەناوبانگە، لەحەوتساڵیەوە کەوتە ئیش کـردن لەگـەڵ باوکیـا کـەقفڵی دروسـت ئـەکرد نـاوی بـاوکی ( جـوزا پـاس مەلینکیت) بوو. دایك و باوکی لات و دەستکورت بوون. ماریجا زۆر شانازی بەژنە لیتوانی(گرازینا)وە دەکرد کەپێش شەش سەد ساڵ لەدژی ئەڵمانەکان بوو لیتوانیـان داگـیرکرد. ماریجـا (کۆمـەڵێکی لاوی ژێرزەمـین)ی لـەخۆی و لەهاوڕێکانی پێکەوەنا و گەلێ بەیاننامـەیان لـەدژی داگیرکـەر بڵاوکـردەوە و ئاگریـان لەعـەمبارەکانیان داو ئەڵمانـەکان بـەدوای ماریجـادا دەگـەڕان و لەشەڕێکی قارەمانانەدا بەبریندار دەستگیرکرا لە ١٩٤٣/٧/٨ سێدارەی بۆ هەڵواسراو خەڵك دەستیان کرد بە گریان بۆی. بەڵام ئەو ڕاوەستاو سەیری دەوروپشتی کـردو پـڕ بـەدەنگ ووتـی (مـەگرین، لەشـکری سـوور تۆڵـەم ئەسێنێ، هەربژی لیتوانیای سۆڤیەتی، هەربژی هاوڕێ ستالین).

## ١٣- دکتۆری دان:

نووسینی ئەنتوان چیخۆف، وەرگێڕانی برایم ئەحمەد.

(واند)ی ئێسك سووك لەنەخۆشخانە هاتەدەرەوە لات و بێ پوول و پارە... چی بکات هەرچی هەیبوو موستیلەیەکی پیرۆزە بوو، ئەویش لەناچاریدا دایناوبوو لەبارمتەی ڕۆبلێکدا. زۆر بەتەنگ خواردن و نوستنەوە نەبوو ئەوەندی بەتەنگ زانینی ئەم و ئەو بوو بەرامبەر بەجوانی خۆی. بیری کردەوە پیلانێکی داڕشت بچێتە لای دکتۆر (ڤیگلْ) دکتۆری دان لەیانەکەدا پەرداخێك شەرابی بەسەرا ڕژاندبوو و پێکەنی‌بووو هیچ دڵگیر نەبوو.

چووە ماڵی دکتۆر لەدەرگای دا خزمەتکارەکە دەرگای کردەوە و ووتی فەرموو دانیشە ئێستە دکتۆر دێت، (واند) لەشەرمی خزمەتکارەکە نەیدەزانی چۆن داوای قەرز لەدکتۆر بکات و ئاواتەخوازبوو خزمەتکار بچێتە دەروە بەڵام هەرنەڕۆیشت کەدکتۆر هات گوتی فەرموو بڵێ گوتی ددانم دێشێ و دکتۆریش ددانی کێشا و کچە خواحافیزی کردو دکتۆر پرسی دەڵێی نیازت نیە هیچ پارەو پول بدەی کچە لەشەرما سەری سورما و ئەموستیلەکەی داکەندو لەپەنجەی دکتۆری کرد لەجیاتی پارەو چووە دەرەوە خوێنی تف دەکردەوە و بێ نیاز ئەڕۆیی و لەبەرخۆیەوە بۆڵە بۆڵی بوو...

## ١٤- بێ تاوان[٨٩] :

نووسینی نوسەری بەناوبانگ (لیڤ تۆلستۆی) ... وەرگێڕانی برایم ئەحمەد.

لەشاری (ڤلادیمیر) بازرگانێکی لاو هەبوو ناوی (ئیڤان دیمتریج ئەگزۆنۆڤ) بوو. دوو دوکان و خانویەکی هەبوو کوڕێکی زۆر ڕووخۆش و

[٨٩] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی٩، ١٩٤٨ز

شەل بوو حەزی لەگۆرانی ئەکرد. بەرلەوەی ژن بهێنێ زۆر شەرابی ئەخواردەوە، بەلام کەژنی هێنا بەبۆنەوە نەبوایە نەیدەخواردەوە لەسەفرەێکا هاورێیەکی بازرگانی دەکوژرێو بەسەر ئەمیدا دەهێنن و حوکمی ئەبەدی بەسەرا دەدەن و ڕەوانەی سیبریا دەکرێت و ٢٦ ساڵی تیا بەسەر دەبا بەبێ تاوان.

## ١٥- هەڵتوو [٩٠] :

نووسینی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسی.. ئەلفۆنسۆ دۆدی ١٨٤٠ – ١٨٩٧ Alphonse Daudet جۆرج لوری – ئاسنگەر – ئەو شەوە زۆر مات بوو. جاران بەرلەکوژانەوەی ئاگری دوکانەکەی و پێش خۆرئاوا کورسی‌یەکی دائەنا لەبەردوکانەکەیداو لێی دائەنیشت تۆزێك بحەسێتەوە. بیر لەسەربازە هەڵتووەکان ئەکاتەوە کەبەبەرچاوی دێن و دەڕۆن و لەبەرخۆیەوە دەڵێت ( ئەمانە بەرازن، نامەردن، شوورەیی‌یە فەرەنسی بن).

کەچی ئاگای لەوە نەبوو کوڕە گەورەکەی خۆیشی فیراری سەربازی‌یەو هەڵتووە بۆیە بەتووڕەییەوە قۆڵی کوڕەکەی گرت و بردیە دوکانەکەی و پێی ووت ئەمانە هەمووی بۆ تۆو من خواحافیز ئەچم شەش ساڵ سەربازی دەکەم لەجیاتی تۆ قەرزاری نیشتمانی دایکی کەفەرەنسایە ئەوەندەی کوڕەکەیەو پیرەژنەکەی تکایان لێکرد بێسوود بوو بەتەمەنی ٥٥ ساڵیەوە چووە سەربازی).

---

[٩٠] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ٨ ص٩ ١٩٤٨ز ولات پەرستی کۆمەلە چیرۆکێکی جیهانی‌یە، وەرگێردراوەتە سەر زمانی کوردی (ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا، ١٩٩٦.

## ١٦- شەوێکی بەسام[٩١] :

نووسینی ئەنتۆن چیخۆف/ بەدەسکاریەکی کەمەوە کراوە بەکوردی لەلایەن برایم ئەحمەدەوە. (ئیڤان بترۆڤیچ) گەروی پاکژکردەوە بەدەنگێکی لەرزۆك و ڕەنگێکی زەردەوە ئەم باسەی بۆ میوانەکانی گێڕایەوە. شەوی جەژنی سەری ساڵی ١٨٨٣ز زۆر تاریك بوو لەماڵی هاوڕێکەم ئەهاتمەوە کەوا خەریکی گفتوگۆکردن بووین لەبارەی گیان (روح)ەوە کەماڵمان لەنزیك (کڵێسەی) (ئەسام سوم) بوو.

کەڕۆیشتم ترس و ماتەمینی دایگرتبووم، کەچوومە ژوورەکەم تابووتێکم بینی وەخت بوو شێت ببم هاوڕێیەکی ترم ئەویش وەك منی بەسەرهاتبوو.

لەڕوی ئەم بەسەرهاتەوە سێ مانگ کەوتمە ناوجێ... بازاڕی تابوت و کێل فرۆشتن گەرم بوو.

## ١٧- لەشەوێکی تۆفدا[٩٢] :

نووسینی مەکسیم گۆرگی - وەرگێڕانی برایم ئەحمەد.

لەڕێکخستنی چیرۆکێ بوبومەوە کەبەسەرهاتەکەی لەڕۆژێکی زستاندا ئەقەوما قەڵەمم لێ فڕێدابوو بەژوورەکەدا ئەهاتم و ئەچووم و بیرم ئەکردەوە وەخت شەو بوو، لەپڕ هەستی هەوا ئالوژیکردم و دەنگی سەیر سەیر لەشەقامەکەوە ئەهات، پیرەمێردە کوێرە لەدێ چووە دەرێ بەهاوڕێ و چاوساغی ژنە دڵسۆزەکەی دەشت و دەریان گرتەبەر بۆ سواڵ کردن

---

[٩١] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١١، تشرینی دووەمی ١٩٤٨، ل٦٤.

[٩٢] وڵات پەرستی، کۆمەڵە چیرۆکێکی جیهانییە، برایم ئەحمەد کردوویە بەکوردی، ئامادەکردنی: ئومێد ئلشنا، ل٨٥.

ئەڕۆیشتن و هیچیان دەست نەکەوت و لەڕێگا لەسەرمان ڕەق بوونەوە.
لەخەیاڵدابووم پرسیارم لەخۆم کرد لەپڕ تارماییەك وەڵامی دامەوە ووتی: چ شەیتانێك ئەم چیرۆکانەت پێدەنوسێت و وێنەی ژیانی ئەم هەژارانەت پێئەگرێت؟ ژیان خۆی پڕ ئێش و ئازارە بۆ تۆ بەوێنەگرتنی کلۆڵیەکانی و ڕازاندنەوەی ئازاردارتری ئەکەیت بۆ دەماخ ئەوسوتێنی کەئەم وێنەی کوێرەوەری و هەژاریانە کار لەدڵ ئەکەن. نیازت لەمە چییە؟ ئەتەوێ ئەوتۆزە زات و دان بەخۆداگرتن و مل بۆ بارکەچ کردنەی لەدڵی خەڵکا ماوە ئەویش نەهێڵی، یان گەرەکتە لەهیوای کامەرانی و بەش خوراویان بکەیت؟ یان هەر قینت لێیانەو ئەتەوێ ئارەزوی ژیانیان ژەهراوی بکەیت؟ وەڵام بدەرەوە سەرم لەم کارەی خۆم سوڕما... وەڵامم دایەوە هێزی هونەر لەهێزی واقع زیاتر کار لەخەڵك ئەکات.

## ١٨- بەچرای ڕۆن گەرچەکەوە [٩٣] :

نووسینی (رئیف خوری)

لەعەرەبییەوە بەدەستکاریەوە لەلایەن برایم ئەحمەدەوە کراوە بەکوردی.
پیاوێك دەستێك جلی شڕی لەبەردا، پێخاوس و تۆزاوی، بەقژێکی سپی بەردراوەوە دانیشتبوو لەدەشتاییەکدا لەتەنیشت بەرمیلێکەوە کەهەموو خانوماڵەکەیەتی تیایدا ئەخواو ئەنوێ و بیرئەکاتەوە و خەو ئەبینێ.
تارماییەك لەشێوەی جەنگاوەرێك دا خودە لەسەرو شیر بەلاقدا شۆڕ بووەوە، لێی نزیك ئەبێتەوە و لەژوورسەری ئەوەستێ وسێبەری لێدەکات و

[٩٣] وڵات پەرستی، کۆمەڵە چیرۆکێکی جیهانییە، برایم ئەحمەد کردوویە بەکوردی، ئامادەکردنی: ئومێد ئلشنا، ١٩٩٦.

پێی ئەڵێت: (من ئەگەر خۆم نەبوومایە ئاواتم ئەخواست تۆ بم بڵێ چیت ئەوێ بۆتی بکەم). من ئەسکەندەری گەورەم کابرا هەست دەکات شتێکی وون کردووە، گورج ئەزانێ کەوا ئەو خۆرەی وون کردووە کەخۆی لەبەرهەلخستبوو، بۆیە وەلامی ئەداتەوەو ئەلێ (تۆ دۆستمی، بەری هەتاوەکەم لێ مەگرە).

هەر ئەو مرۆڤە بەو جلە شڕانەوە لەبازاڕی ئەثینا ئەسوڕێتەوەو چرا بەدەستەوە لەبەر دوکانێکا ئەوەستێ، ئەبینێ خانمێ سەگێکی بەدواوەیە بۆنی خۆشی پیاو کاس ئەکا ڕووئەکاتە خانمەکەو پێی ئەڵێ: (بەچ حەقێ تۆ ئەمەی کەهەیت؟! باسەگەکەت ئەمە بێ کەهەیە ؟! منیش ئەمە بم کەئەم بینی؟) خانم تووڕە ئەبیو پۆلیس بانگ ئەکاو دایئەپلۆسنو ئەڵێن (پیس ئەتناسین کێیت تۆ هەمیشە دادتە. خەڵك بێزار ئەکەیتو بەلای کۆشکەکاندا ئەڕۆیتو محاکەمەی دەوڵەمەندان ئەکەیت. ئەسکەندەر گەورەت ئەکاو تۆ پێی ئەڵێیت سێبەرم لێمەکە) لەپڕ دەنگ پەیدائەبێ ئەڵێن شازادە لەکەژاوەکەیدا گەیشت. لەشازادە ئەچێتە پێشو پێی ئەڵێت (خاتونێك هەیە ئەوەی بەخۆیو سەگەکەیەوەیەو بەشی چەند سەد کەس ئەکات نانی برسیو جلی ڕووت بەدەس چەند ئیحتیکاریەکەوەیە). پاڵی پێوە ئەنێنو ئەکەوێتە خوارەوە پشتو پەراسوی بریندار ئەبێو ئەشکێ چراکەش پارچەپارچە ئەبێو خۆی لەباوەشی پیاوێکی بازاڕیدا ئەبینێتو یەکێك لەگەڵ بەندەیەکە چراکەی بەرزئەکاتەوەو فویەکی لێئەکاتو هەناسەیەك هەڵئەکێشێ ئەڵێت: (دۆزیمەوە) ئەگەر چراکەی نەکوژاندایەوە زوو بەدۆزینەوەی یەکێك وازی لەگەڕان بێنایە چەند بڕوای زۆر بوو کەچاکە زۆرە ئەبو بڵێ بەو بازاریەی گرتیەوە وەرە لەگەڵم خێراکە بایەکێکی کەی وەکو خۆمو خۆت بدۆزینەوە تا شەقامەکەو هەموو شەقامەکان پڕ ئەبوون

لەخەڵك و جمەیان ئەهات ئەم مەوكبە ئەكەوتەڕێ بەخۆی و چرا داگیرساوەكەوە بیان نەڕاندایە. (ئەسكەندەر تۆ دۆستمی بەری خۆرم لێ مەگرە. پۆلیس ئێمە سەربەستین لەقسەكردن و بیركردنەوە بۆیە قاچت ئەشكێنین ئەگەر شەقت پێوەشاند). بەسەر ئیحتیكاردا یاتێر ئەخۆیت یاورگت ئەدڕین بەسەر شازادەدا پێویستەگوێمان لێبگری، ئەبێ بوەستی ئەگینا بەخۆت و كەژاوەكەتەوە تێكت ئەشكێنین) ئەوسا ئەشێ چراكە بكوژێنیتەوە بەڵام هێشتا زۆری ماوە..

## ١٩- لەڕێی وەفادا:

(جۆرجین شاسنلیكس) بەرلەشۆڕشی گەورەی فەرەنسا لەدایك بوو لەباوكێكی خانەدان هاتە دونیاوە كەپشتاوپشتی لەڕێی پاشەیەتیدا لەناوچوون. گێژەلووكەی شۆڕش هەڵیكرد ئەم خانەدانەش دووچاری گەلێ سەرگەردانی و دەربەدەری بوون) لەساڵی ١٨١٠دا كەهاتنەوە فەرەنسا نابلیۆنی یەكەم ئیمبراتۆر بوو.

هەموو شتێ گۆڕابوو، پاشایەتی هەر ڕێ و شوێنی وون بوو ئیمتیازی خانەدانەكان گشت تورِ هەڵدرابوون، كۆسپی بەینی چینەكانی میللەت ڕوخێنرابوو دەزگا و یاسا و نەریتێكی تازە دانرابوو. جۆرە پیاوێكی تر پێگەیشتبوون. خانەدانی شاسنلیكی كەهاتنەوە سەركاری خۆیان و دەیان كەس بەچەقۆی (زیلوتین) سەربڕابوون و دەی تریشیان لەشەڕی ناوخۆدا كوژرابوون. كۆشكی كۆنی بەناوبانگیان هەركەلاوەكانی مابوو. زەوی و زاریان هەمووی داگیركراوە جاكچێ لەم جۆرە ناوچەیەدا گەورە بووبێت پاشا پەرستێكی لاسارو سەرچڵ ئەبێت و دوژمنی ئیمبراتۆرو ئیمبراتۆریەت ئەبێت.

خزمێکیان بوو بەناوی (شارل دولا بیروابیر) نـاو لەتەمـەنی ٢٥ سـاڵیدا کوڕێکی قۆزو گیان سووك و ڕووخۆش و خانەدان، عەیبی تەنیا ئەوە بوو لەسوپای ئیمبراتۆر ئەفسەرێکی دەرەجەدار بوو.

نیسانی ١٨١٤ خوێن خۆران بەرەو باریس ئەکشێن و نابلیۆن لەتـەخت دێننە خوارێ و هەیە ڕووی لێ وەرئەگێڕێ تاهاوڕی نزیکەکانی لێئەتەکێتـەوە (شارل) زۆری پێگران ئەبێ ئیمبراتۆر وابێکەس و تەنیا بمێنێتەوەو ڕائەکا بۆلای و ئەکەوێتە خزمەتکردنی.

دواتر ئەگەڕێتەوە لای مناڵەکانی بەڕەزامەندی نابلیۆن لەوێ دائەنیشێ و پاشان وەزیـری جـەنگ ئـەینێرێ بـۆ (شـابیری) بازگـەی شـەڕو پاشان بـۆ (گرینویل) بۆ شەڕی نابلیۆن و نەڕانی: (هەربژی ئیمبراتۆر) خۆی پێنەگیرا ڕایکردە لای نابلیۆن و سەرکەوتن، دوای سەد ڕۆژ دیسان نـابلیۆن شـکاو لویسی هەژدەهەم هاتەوە سەرتەخت و دەستی تۆڵە لەوکەسانەی لایەنگری نابلیۆن بوون درێژکراو قین و تۆڵە سەندن پیاوەتی و لێبوردنیان بەزاند[٩٤].

## ٢٠- تاریخی ئادەمیزاد:

نووسینی ( ئەناتۆل فرانس) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد کەشازادە ( زەمیر) چووە سەرتەختی فارس فەرمانیدا هەرچی زاناو پیاو ماقوڵی وولات هەیە بێتە پێشی. پێی ووتن مامۆستام (دکتۆر زەب) فـێریکردووم کەپاشـایان پێویستە مێژووی ئادەمیزاد بخوێننەوە بۆیە ئەمەوێ بەسەرهاتی هـەموو خـەڵك بخوێنێتـــەوە. زاناکـــان بـــەڵێنیان دا کـــەئارەزووی شـــازادەی لاو جێبەجێبکەن، دوای بیست ساڵ کاروانێکی بیست حوشتری هەریەکە پێنج

(٩٤) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٣ی ساڵی٥، مارس ١٩٤٤.

سەد بەرگ کتێبیان هەڵگرتبوو، هاتنە خزمەت پاشاو سکرتێرەکەی گوتی ئەم تاریخە شەش هەزار جزمەو - بەش- هەموو شتێکی تێدایە. پاشا فەرمووی کورتی کەنەوە دوای دە ساڵ هاتنەوە باری کەرێکیان کتێب پێبوو بەڵام پاشا پیر بوو بوو چاوی کز بوو لەسەرەمەرگدا بوو سکرتێرەکەی ووتی: گەورەم من ئەم تاریخە گەورەیەت بۆ ئەکەمە حەوت ووشە (خەڵك لەدایك ئەبن. ڕەنج ئەدەن ئەمرن) ئاوا بەم ڕەنگە پاشای وادرەنگ لەژیانیدا فێری تاریخی ئادەمیزاد بوو.

## ٢١- ڕێکەوت:

نووسەری گەورەی فەرەنسا- جورج لینور- نووسیویەو برایم ئەحمەد وەریگێراوە.

ناپلیۆن ویستی سەری یەکێك لەقارەکانی سەروی فەرەنسا بدا. شار ڕازایەوە (مسیو کولوری) فەرمانبەرێکی بچووکی شارەکە بوو لەتەمەنی ٣٠ساڵیدا بوو. مسیو کولوری چونکە فەرمانبەرێکی گەورە نەبوو لەدوورەوەی خەڵك وەستابوو. کە ئیمبراتۆر گەیشت هەموو تێکڕا هاورایان کرد ( بژی ئیمبراتۆر) کەژاوەی پاشا وەستاوە تاپێیانەوە بگەرێ. ئیمپراتۆر کەدابەزی بەرانبەر مسیو کولوری بوو ڕاستەوڕاست نەختێ لەنکی و پێی ئازاری ئەدا خۆی بەکێش کرد تاریزی مەئمورەکان، ئیشارەتی کردە مسیو کولوری لێی بچێتە پیشەوە ئەمیش بەترسەوە چووە پێش و ناپلیۆن توونند قۆڵی ڕاوەشاندو پێی ووت لێم گەڕێ باشان بدەمە سەر قۆڵت ساڵ تێنەپەڕی مسیو کولوری بەرزبۆوە شەڕ دەستی پێکرد ناپلیۆن شکا ئەم لەگەڵی دابەزی لەساڵی ١٨٤٨ شازادە لویس ناپلیۆن چووە سەرتەخت ئەستێرەی میسوکولوری گەشایەوە. میسو کولوری بەچەند مانگێك پیش

مردنی بەکوڕەکەی ووت: ڕۆڵە ئەتەوێ بزانی ناپلیۆن چیبەمن ووت کاتێ خۆی بەسەرشانمدا دابوو ووتی بەڵێ ووتی جنێوی ئەدابەوکەسەی پێلاوەکەی بۆ دروست کردووە چونکە تەسك بوو ئەم سڕەم بۆیە نەدرکاندووە چونکە چارەنووسی منی پێوە بەندبوو: کوڕم ئەوە هەمووی لەبەرئەوە کەسەعاتێ جێدار دەستی ناپلیۆن بوومو شانی داداوەتە سەرقۆڵم.

## ٢٢- کۆشکی چۆڵ [٩٥] :

کۆشکی چۆڵ داستانێکی دوورو درێژو نووسینی نووسەری بەناوبانگی فەرەنسا (بەلزاك)ە کەیەکێکە لەداستانووسەکانی سەدەی نۆزدەهەم. برایم ئەحمەد وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. چیرۆکەکە دەڵێت:

ئەو ژوورە تایبەتیە کەلەکۆشکەکەدا بۆ مادام دیمیریە دانرابوو لەقاتی خوارەوە بوو گەنجینەیەکی لەسەربوو بۆ مادام دیمیریە کردبوی بەجێگای جلەکانی... ناوەڕۆکی چیرۆکەکە باس لەناپاکیو بێبڕوایی ماڵە ئاغاو پاشاو دەرەبەگەکان دەکات. چۆن مێرد خیانەت لەژنەکەی دەکاتو درۆی لەگەڵدا دەکات دەست لەگەڵ دەیان ژنی ڕەوشت نزم تێکەڵ دەکات.. هەروەها ژنەکانیشیانو خزمەتکارەکانیشیان بەهەمان شێوە فێری دزیو خیانەتو درۆ دەبنو لەئەنجام دا تاوانەکانیان ئاشکرا دەبنو شیرازەی خێزانەکانیان تێك دەچێتو نائارامیو بێبڕوایی پەیدادەبێت. هەڵبژاردنی ئەم چیرۆکەو وەرگێڕانی بۆ سەرزمانی کوردی لەگۆڤاری گەلاوێژدا بۆ ئەوەی خوێندەواری کورد بەئاگابێنێ لەکۆشكو باڵەخانەی خانەکاندا چ

---

[٩٥] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥-٦، ساڵی٢، مایسو حوزەیرانی ١٩٤١، ٧٩-٨٧.

قەوماوەو چ دەقەومێ.. هەروەها دەریدەخات ژن فێڵبازو مەکر بازو حیلە بازو زۆرزانن و چۆن دەتوانن پیاو تەفرە بدەن و مەرج و بەڵێن و قسەی خۆیان بەمێردو پیاوەکانیان بسەپێنن.

نموونەی ئەو ڕووداوانە لەم چیرۆکەی سەرەوەدا خۆی دەنوێنێ لەنێوان (میسیۆ دینیریۆد) (مدام دیمیریەی) خێزانی کەچۆن ژنە بەدرۆ خۆی نەخۆش دەخات و دۆستێکی خۆی لەژووری خەزنەکە دەشارێتەوەو پیاوەکەی شەوێکیان هەستی پێدەکات و دەرگای خەزنەکە بەخشت و گەچ دەگرێ و ژنە بەحوکمی پارە پەنجەرەیك دەهێڵێتەوەو ڕەشوەت ئەدا بەوەستاکە پاشان لەناکاو بەهەوڵ و تەقەلای خۆی ئەیەوێت دیواری دەرگاکە بشکێنێ و دۆستەکەی ڕزگار بکات، چونکە لەژێر چاودێری نهێنی مێردەکەی دەبێت لەئەنجاما هەموو شتێك ئاشکرا دەبێت..

## ٢٣- لەناوێنەدا:

نووسینی ئەناتۆڵ فرانس و وەرگێڕانی برایم ئەحمەد ئەم چیرۆکە خاوەنەکەی ( ئەناتۆڵ فرانس)ە کەیەکێکە لەماموستا گەورەکانی ئەدەبیاتی تازەی فەرەنسا. ئەگەر هەرە گەورەکەیان نەبێت. لەپاریس لەساڵی ١٨٤٤ز هاتۆتە دنیاوەو لە (تۆر) لەتشرینی یەکەمی ١٩٢٤ز مردووە، خاوەنی داستانی (تاییس، سەوسەنی سوور، جزیرە پێنگوین)و گەلێکی ترە، ئەم چیرۆکە هەرچەندە کەمێك دەسکاری کراوە لەلایەن وەرگێڕەوە، بەلام بەڕاستی وێنەیەکی جوانی نووسین و بیرکردنەوەو فەلسەفەی تەوسی ئەناتۆڵە.

لەپاریس لەدەوری لویسی یازدەهەم خانمێکی خانەدان هەبوو (ڤیولانت)ی ناوبوو جوان و ئێسك سووك و دڵگیر، قەزاوقەدەر وای کرد

شووبكات بەپارێزەرێك لەپەرلەماندا، كابرایەكی بەدخوو ڕەنگ زەردو دەردەدار، زۆر قینی لەهەژار بوو. فیولانتی خێزانی هاتوچۆی كەنیسەی دەكرد خۆی ئەڕازاندەوەو (باباژانتێرێر) قەشەی كەنیسە ئامۆژگاری فیولانتی دەكرد تەوبە بكات و لەگوناه پەشیمان بێتەوە هەروەها (مسیو فلیب دی كوكیس) كوڕێكی شۆخ و شەنگ تەماعی تێ‌كردبوو دانسی لەگەڵ كردبوو... دوای ماوەیەك ئامۆژگاری كردنی فیولانت بۆ ئەوەی تەوبە بكات چونكە بەشیری كەر خۆی شتبوو، (قەشە) سەفەری فینیسیاییكەوتەبەر بۆ ئیتالیا و چووەلای خانم و ووتی چیت بۆبێنم بەدیاری ئەویش ووتی ئاوێنەیەكی جوانم بۆ بێنە.. كەگەڕایەوە كەللە سەرێكی مردووی بۆهێنا بەدیاری بۆ ئەوەی ببێتە عیبرەت و تەوبە بكا، كەئەنجامی هەموو كەسێ مردنەو دواڕۆژ چاوەڕێی هەموانە...

ئینجا خانم تێگەیشت بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی (ژان تیریر) كەئەنجام ئەمەیە پێویستە مرۆڤ سوود لەو ماوە كورتە وەربگرێ كەلەژیاندایەو بێ‌دڵی خۆی نەكات و فلیبی بانگ كردەماڵەوەو لەژووری نوستن بەیەكەوە ڕایان بوارد.

ئەم چیرۆكە كارێكی هونەری و فەلسەفی‌یە هەروەها ئاینیش و پەندو دەرسە بۆ خەڵك بۆیە وەرگێڕ هەڵیبژاردووە چونكە لەلایەك ڕۆڵی پیاوە ئایینی‌یەكان دەردەخات لەئامۆژگاری كردنی خەڵك بۆ تەوبەو وازهێنان لەگوناه.لەلایەكی تر (ڤیولانت)ی شۆخ و شەنگ لەئەنجامی ئەو ئامۆژگاری‌یانە تێدەگات ژیان كورتەو مردن نزیكە. كەواتە بافرسەت لەدەست نەدەیت و بەخۆشی بژیت و بێ‌دڵی خۆت نەكەیت[٩٦]...

---

[٩٦] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧-٨، ساڵی٢، مایس و حوزەیرانی ١٩٤١، ل٨٨-٩٥.

### ٢٤- چیرۆکی خزمەتکار:

نووسینی نووسەری مەزن (سیمیونوف) لەعەرەبی یەوە برایم ئەحمەد کردوویە بەکوردی.

(چیرازیم) بەر لەجەژن گەرایەوە بۆ مۆسکۆ، ئیش و کاری دەست نەکەوت و هاورێکانی بێزار کردبوو ڕۆژێکیان چووەلای هاوڕێیەکی کەلەلای ئاغاکەی خۆشەویست بوو ناوی (شارۆڤ) بوو هاوڕێکەشی ناوی (بەگور) بوو خۆهەڵکێش و فشەکەر بوو.

(بەگور) داوای لەئاغاکەی کرد خزمەتکارێکی پیریان هەبوو دەری بکات و جیرازیم لەجێگای دابمەزرێنێت کەناوی (پۆڵێکار) بوو.

شارۆڤ ڕازی بوو بۆلێکار دەربکات و جیرازیم لەجێی دابمەزرێنێت. بەڵام جیرازیم کەگوێی لەو نەقس و نەهامەتی و بێ پارەیی پۆلیکارو خێزانەکەی گرتبوو، کارەکەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت چونکە لاوێکی بەویژدان و پاک و بێ گەرد بوو[٩٧].

دوای ئەوەی (٢٤) بیست و چوار چیرۆکی کورتی وەرگێڕاومان خستە پێش چاو کەلەلایەن برایم ئەحمەدەوە وەرگێڕاون لەزمانی ئینگلیزی یەوە بۆ زمانی کوردی و بەبیرو بۆچوونی تایبەتی خۆمان هەندێکیانمان شی کردۆتەوە، هەندێکیشیان لەبەرکورتی مەوداوماوە تەنها باسی ناوەڕۆکی چیرۆکەکەمان کردووە. ئەویش بەشێوازێکی تایبەتی چونکە ناکرێ لەسەرجەمیان بکۆڵینەوە ئەگەر هەریەکە لەم چیرۆکانە بەوردی لێی بدوێین باسێکی قەوارە گەورەی لێ دەردەچێ. کتێبەکەی ئێمەش تەنها (باسی ژیانی برایم ئەحمەدو بی هرەو داهێنانیەتی واتە هێماکردن بەبەرهەمەکانی و لێکۆڵینەوەو شیکردنەوەی هەندێکیان دەگرێتەوە نەك سەرپاکانیان چونکە بەرهەمەکانی یەکجار زۆرن و شیعرو چیرۆك و چیرۆکی

---

[٩٧] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی٧، ئابی ١١٩٤٦، ل٦٢.

وەرگێڕاوو وتارو ڕۆژنامەگەری لەخۆگرتووە. جائێمە لێرەدا لەسەر بەشێکی زۆری چیرۆکە وەرگێڕدراوەکانی لێکۆڵینەوەمان نەکردووەو شیمان نەکردوونەتەوەو وەك ووتمان تەنها هێمامان بۆکردوون و کرۆکیانمان دەرخستووە ئەوەتا ئومێد ئاشنا لەم بارەیەوە دەڵێت (وەرگێڕانی کورتە چیرۆك لەزمانە زیندووە جیهانی‌یەکانەوە بۆ زمانی کوردی کارێکی ڕاستەوخۆی هەبووەو هەیە لەپێشکەوتن و گەشەکردنی ئەم لقە گرنگەی ئەدەبەکەمان)[٩٨].

برایم ئەحمەد لەماوەی دەساڵی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا بەرهەمی هزرو قەڵەمی خۆی بەخشیوە بەخوێندەواران و مێژووی ئەدەبی کوردی. بەشێوەیەکی دیارو بەرچاو لەزمانی ئینگلیزی‌یەوە چەندین شاکاری جیهانی ڕاستەوخۆی کردووە بەکوردی. ئەمە ڕووداوێکی گرنگ بوو لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا.

من بڕوام وایە، کەهەتا ئێستا لەوێنەی ئەم هەوڵەی ئەودا بەبەردەوامی و بەوچڕو پڕیە لەلای هیچ ئەدیبێك نەبووەو لەهیچ گۆڤارێکی کوردیدا وەها پەرەی پێ‌نەدراوە، کەبەوپەڕی پێشکەوتنەوە ڕۆڵی خۆی دیاری بکات..

شایانی تۆمارو پاکردنەوەو سەرنجی واقعیانەو زانستی‌یانەیە.

لەڕاستیدا ئومێد ئاشنا باش بۆی چووە، کەئەم کارە هونەری و ئەدەبیەی برایم ئەحمەد لەمەیدانی وەرگێڕاندا کارێکی گەورەیەو جێگای ڕێزی ڕۆشنبیرانە، چونکە مەبەستی نووسەر ئەوە بووە:

١)- هونەری چیرۆکی گەلان بەکورد بناسێنێ و ڕۆشنبیری کورد سودی لێوەربگرێ چیرۆکی ڕێبازی جیاجیای وەرگێڕاوە، لەڕێبازی کلاسیکەوە بیگرە تادەگاتە ڕێبازی ڕۆمانسی و ڕیالیزم و ڕیالیزمی سۆسیالیستی..

---

[٩٨] ئومێد ئاشنا، وڵات پەرستی، کۆمەڵە چیرۆکی بیانی برایم ئەحمەد کردوویە بە کوردی، ١٩٩٦، ل کۆتایی.

ئـەوەش بـۆ ئـەوە بـووە ئـەدیب و چـیرۆك نووسـی کـورد سـوود لەهـەموو ڕێبازەکان وەربگرن و شارەزایی تیا پەیدا بکەن.

٢)- ناوەڕۆکی چیرۆکەکان جیاوازن، نیشتمان پەروەری و کۆمەلایەتی و بەرگری و ڕۆشنفکری و ژن.. هتد. واتە هەموو جۆری تێدایە.

٣)- زمـانی وەرگێڕانـەکانی بەگشـتی لـەئینگلیزی و عەرەبیـەوە بۆسـەر زمانی کوردی‌یە، جێی وتنە، کەکوردی‌یەکی ڕەوان و بێکۆسپ و گرێ‌یە.

٤)- لەهونەری وەرگێڕاندا سەرکەوتوو بووە، هەموو لایەنەکانی هونەری پاراستووە، جوانی ووشە، ڕازاندنەوەی دەربڕین، ڕەوانی زمان، زنجیرەی بیر هەستی ناسك و خەیالاتی بەربلاو.

## نەخشەی چیرۆک وەرگێڕان لای برایم ئەحمەد

| ئینگلیزی | سۆڤێتی | فەرەنسی |
| --- | --- | --- |
| ١- تۆماس ئەلەن | ١- مەکسیم گۆرکی. | ١- گی دی مۆپاسان (٢ چیرۆك). |
| ٢- ولیام شکسپیر. | ٢- ئەنتوان چیخۆف (٢ چیرۆك) | ٢- ئەلفۆنس دۆدی. |
| ٣- هـانز کریسـتیان ئەندرسۆن. | ٣- سیمیونۆف. | ٣- ئەناتۆلْ فرانس (٢ چیرۆك). |
| | ٤- لیف تۆلستۆی. | ٤- جۆرج لینۆر. |
| | | ٥- بەلزاك. |

١- لەنموونـەی ئـەدەبیاتی عیبریشـەوە، لـەچیرۆك نووسـی بـەناوبانگ (ی.ل. بیرتس) چیرۆکێکی وەرگرتووە (لەژوور سەری نەخۆش).

٢- لـەچیرۆك نووسـە عەرەبیـەکانیش لـە (رئیـف خـوری) چـیرۆکێکی وەرگرتووە لەژێر ناوی (بەچرای ڕۆن گەرچەکەوە).

# (لەئەدەبی گەلانەوە)

## چەند وێنەیەك لەنووسینی جیهانی

**وەرگێڕانی برایم ئەحمەد لەئینگلیزیەوە:**

برایـــم ئەحمـــەد جگـــە لەشـــیعرو چیرۆكـــەكانی خـــۆی و چیرۆكـــە وەرگێڕاوەكانی، كەلەزمانی ئینگلیزیەوە وەری‌گرتـوون. كۆمـەڵێك ووتـاری بەنرخیشی لەگۆڤاری گەلاوێژدا نووسیوەو بڵاوكردۆتەوە.

تائێستا ئێمە چەندین ووتاری لەوجۆرەمان دەست كەوتووە. ووتارەكان دەربارەی كەسایەتی و پیاوە ناودرەكانی دونیایە، كەلەو سەردەم و زەمانەدا باویان بووەو لەمەیدان و گۆڕەپانی سیاسەت و ئەدەبدا ناسرابوون. ناكرێ لـێرەدا ووتارەكـانی وەك خۆیـان بڵاوبكەینـەوە، بـەڵام بـەكورتی و بەچـەند دێڕێك لەمەڕ ئەو ووتارانەوە دەدوێین:

دیارە وەرگێڕ كاتی خۆی كەئەو بابەتانەی بڵاوكردۆتەوە نیازی ئەوەبووە خوێنـدەواری كـورد، ئەو پیاوە نـاودراو گەورانـەی دونیا بناسـێ و زانیـاری لەبارەیانـەوە هـەبێت. هـەروەها دەربـارەی وولات و بیروباوەڕیـان و سـەنگیان لـەگۆڕەپانی جیهانی‌دا ئاشـنایەتی پـەیدا بكات، چونكـە سـەردەمی شـەڕی دووەمـی جیهان و بزوتنـەوەی ڕزگـاری‌خوازی گـەلان بووەو كـورد پێویسـتی

بەوە هەبووە بزانێ لەدونیا چ باسەو ڕەوتی مێژوویی گەلان بەرەو کوێ دەڕوات و تائەمیش وانەو سوودی لێوەربگرێت..

نووسەر ئەم ووتارانە نەقل دەکات، چونکە ووتراوە کەتێکڕا مێژووبەتایبەتی مێژووی زیندوو نووسین زۆر فەرمانێکی بەئەرك و هونەرەو لەمەش هونەرترو زەحمەت تر، ئەوەیە بتوانێ ڕاستی بدۆزێتەوە لەناو ئەو هەزاران ئەفسانەو داستانانەدا کەدۆست و دوژمن لەدەوری ژیانی سەرکردەکانی ئیمڕۆ ئاڵاون..

**١)- ماتاهاری[٩٩]:**

جاسوسی هەرە بەناوبانگ لەگۆڤاری (Parade) وە ماتاهاری بەناوبانگترین ژنە جاسوسە کەلەمێژوودا ناوی هاتبێ. لەڕۆژی لەناوبردنیەوە لەساڵی ١٩١٧ دا تائێستا بەهەزاران ووتاری دەرهەق نووسراوەو بەسەدان کتێبی لەسەر دانراوە. ئەم کچە (سەماکەرە) لەساڵی ١٩١٤ دا شوێن لەشکری ئەڵمانیا کەوت بۆ بەلجیکا، لەوێوە چووە ئینگلتەرە، دیسان هاتەوە فەرەنسا و بەناوی (مارگرێت زیل) مایەوە. ئیستخباراتی فەرەنسا بەمەی زانیبوو، کەحکومەتی ئەڵمانیا لەساڵی ١٩٠٥ وە مانگانەی بۆ بڕیوەتەوە. لەئەنجاما لەئەڵمانیا لەئوتێل گیراو لەسێدارە درا.

---

[٩٩] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٩-١٢، ساڵی ٢، ئەیلول و کانوونی یەکەمی ١٩٤١، ل١١.

## ٢)- چەرچڵ:

وینستۆن لیۆنارد سپنەر چەرچڵ سەرەك وەزیرانی ئینگلتەرا لە ١٨٧٤/١١/٢٠ز لەدایك بووە. باوكی لۆرد ڕادۆڵف چەرچڵ دایكی ژنێكی ئەمەریكی یە. لەكۆلیژی هارو وساند هیچست خوێندویەتی و لەساڵی ١٩١٢ قانونی تەواو كردووە. چەندین وەزارەتی لەئەستۆ گرتووە. لەساڵەكانی ١٩١٨تا ساڵی ١٩٣٠ دوو جار بۆ ئەندامی پەرلەمان هەلبژێردراوە و لەساڵی ١٩٣٩ز یش بۆ سەرەك وەزیران. چەرچڵ ووتاربێژو نوسەرێكی بەتوانا بووەو چەندین پۆستی وەزارەتی وەرگرتووە.

## ٣)- هیتلەر:

ئەدۆڵف هیتلەر دیكتاتۆری ئەڵمانی لە ٢٠ی نیسانی ١٨٨٩ز لەبرۆتۆ لە (ئاوستریا) لەدایك بووە. باوكی فەرمانبەری گومرگ بووە. لەساڵی ١٩٠٠ز چووە میونیخ لەباڤاریا خەریكی وێنەفرۆشتن بووە. لەساڵی ١٩١٤ز كەشەڕ هەڵگیرسا خۆی كردە سەرباز لە ١٩٢٨ دا پارتی ناشناڵ سۆشیالیست (١٢) ئەندامی لێ هەڵبژێردرا بۆ (ڕێخشتاگ)و ئەستێرەی هیتلەر گەشایەوە لەساڵی ١٩٣٢ لەهەڵبژاردنی سەرەك كۆمار (مستشار) دووەم دەنگی هێنا لەساڵی ١٩٣٣ بەهاوكاری ناشنالیستەكان بوو بەسەرەك كۆمارو كەوتە بژاركردنی نەیارەكانی. لە ١٩٣٩ز كەوتە داگیركردنی خاكی نەرویج و

پۆڵەنداو چیکۆسلۆڤاکیاو .. شەڕی دووەمی جیهان دەستی پێکردو لە ١٩٤٥ز هیتلەر شکاو تیاچوو..

## ٤)- ستالین:

جۆزێف ستالین سەرکردەی هەموو وولاتی سۆڤیەت، کوڕی (گورجییەکی) پینەچی‌یەو لە ١٨٧٩ز لەدێیەکی نزیك (تبلیس) لەدایك بووە، بەنیازی بوونە قەشە لەکڵێسەدا خوێندوویەتی. لە ١٩٠٣ی ز بۆتە ئەندامی پارتی پۆڵشەویك‌و ناوی خۆی‌نا ستالین، واتە (ئاسنین). چەند جار گیراوەو نەفی سیبریا کراوە. لە ١٩١٩ز بووبە سکرتێری کۆمیتەی ناوەندی پارتی‌و لەدوای مردنی لینین لەکانوونی دووەمی ١٩٢٤ دا کەوتەن ناکۆکی لەگەڵ (ترۆتسکی). لەساڵی ١٩٣٦ز – ١٩٣٧ز کەوتە بژارکردنی زۆر پیاوی بەناوبانگی حزب‌و کۆمەڵ. کوڕو کچێکی هەیە لەژنە گورجیەکەی. شارەزاییەکی زۆری هەبووە لەمەیدانی ئابووری‌و زۆری حەز لەسینەما بووەو لەماڵەوە پیاوێکی بێدەنگ‌و سادە بووە.

سەرکردەی بەرەی ڕۆژهەلاتی شەڕی دووەمی جیهانی کردووەو تیایدا زۆر سەرکەوتوو بووە. لەسەردەمی خۆیدا سەرکردەیەکی بێوێنە بووەو ئەورووپای ڕۆژهەلاتی لەدەست نازیەکان ڕزگار کردووەو سیستەمی سۆسیالیستی تیا دامەزراندووە.

**٥)- مۆسۆلینی:**

ینیستۆ مۆسۆلینی دیکتاتۆری ئیتاڵیا و دانەری (فاشیزم) لە ٢٩ی تەموزی ١٨٨٣ز لە (پرداپیۆ) لەهەرێمی (فۆرلی) لەدایك بووەو باوکی ئاسنگەر بووە. مۆسۆلینی لەپێشەوە وەك هەڵگری بیروباوەڕی سۆشیالیستی هاتەکایەوە لە ١٩٠٢ز نەفیکرا بۆ سویسرا لەوەدوا گەڕایەوە ئیتاڵیا.

لە ١٩١٢ز کاروباری ڕۆژنامەی (ئاڤانتی) خرایە ژێر دەست، کەزمان حاڵی پارتی سۆسیالیست بوو. لە ١٩١٤ز شەڕ هەڵگیرسا. لەساڵی ١٩١٥ز دا کەئیتاڵیا چووە ناو شەڕەوە مۆسۆلینی عەریف بوو لەسوپادا، لەساڵی ١٩٢٥ز مۆسۆلینی بەئینقلابێك _کودەتایەك) خۆیکردە دیکتاتۆری ئیتاڵیا و بەربووە گیانی ناحەزو نەیارەکانی.

لەحوزەیرانی ١٩٤٠ز هەڵی کوتایە سەر فەرەنسا و دواتر پەلاماری یۆنانیداو چووە ناو شەڕی دووەمی جیهانەوەو پاشان تیاچوو.

مۆسۆلینی خوێندەوارێکی باش و نوسەرێکی چاك بووە، زمانی فەرەنسی و ئەڵمانیشی زانیوە.

**٦)- چی ئەزانی لەبابەت دڵتەوە:**

لەگۆڤاری (Your Life)ی ئەمەریکایی وەرگیراوە.

**٧)- حەوت ناحەزەکەی پیاو. (The Seven Acainstman)**

## ٨)- (جۆرج سلڤستەر ڤێرک):

نووسەری ئەم وتارە لای وایە پیاو تا کەر بیٚ بەختیار ترو دڵنیاترە.

ئـەم نووسـەرە لـەبارەی حـەوت مـرۆی ناسـراوی دونیـاوە دەدویٚ کـە هەریەکەیان لەبوارێکدا ناوبانگیان دەرکردووە، ئەمانەی خوارەوەن:

١- گالیلۆ.

٢- لۆڤەر.

٣- ڕۆسۆ.

٤- داروین.

٥- مارکس.

٦- فرۆید.

٧- ئەنشتاین.

١- *گالیلۆ* **Galillo** ١٥٦٤-١٦٤٢:

زانایەکی گەورەی ئەستێرەناسی ئیتالیایە.

٢- *لۆڤەر* **Maylinh Luther**:

قەشەیەکی ئەڵمانییە لە ١٤٨٣-١٥٤٦دا ڕێژەی یەکەم بەردی بناغەی چاککردنی ئایینە.

٣- *ڕۆسۆ* (ژان ژاك ڕۆسۆ):

فەیلەسوفێکی سەدەی ١٨یەمی فەڕەنسییە، نووسینەکانی ئینجیلی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە بوون.

٤- *داروین* **(Charle Darwen)**:

زانایەکی بەناوبانگی ئینگلیزییە (١٨٠٩-١٨٨٣ز.

٥- *مارکس:*

باوکی سۆشیالیزمی تازەیە، ١٨٠٨ لە ئەڵمانیا لەدایك بووەو لە ١٨٨٣دا مردووە.

٦- *فرۆید:*

زانایەکی بەناوبانگی (سایکۆلۆجی تازەیە) لە ١٨٥٦ز لە مۆراڤیا لەدایك بووە، لە ١٩٤٠دا مردووە.

٧- *ئەنشتاین* **(Ensten)** :

بەدانەری بیردۆزی ڕیلیتیڤیتی **Relativity** بەناوبانگە، لە ساڵی ١٨٧٤ز لە میونخ لەدایك بووەو دواتر تا مردنی لە ئەمەریکا ژیاوە.

**٨)- پیاوی ڕەش سپی ئەکرێتەوە:**

لەگۆڤاری (بی. تی. ئۆ) بەکورتی وەرگیراوە. ڕەنگی ئەندامی لەشی پیاو وەك پێستو دەموچاوو شوێنەکانی تری بەپێی جۆرو زۆریو کەمی ئەو (بۆیا)نەیە کە لەلەشدان.

هەموو ئەزانین کە پێستی ژنێکی سك پڕ تا لەوەختی منداڵبوونی نزیکتر ببێتەوە نەختێ ڕەنگی ڕەشتر دائەگەڕێ. ئەم بۆیانەش بەسایەی (هۆڕمۆن)ی لەشەوە ڕەنگی تایبەتی خۆیان ئەدەن بە ئەندامەکانی لەش.

بۆ دەرخستنی کاری هۆڕمۆن لە پێست، چەند ساڵێك لەمەوبەر پرۆفیسۆر (زۆندیك)و (بیر) ناو لەگیاندارانی مەمکداردا چەند هۆڕمۆنێك دەردەهێنن و بەدەرزی (سرنج) ئەیدەن لە ماسییەك، هەر گورج دوای دەرزییەکە ئەو ماسییە بۆرە بچووکە سوورو زێڕین هەڵدەگەڕێ.. تاد.

## ٩)- لەڕێی زێڕدا:

نووسینی (هێنز مێنن)، وەرگێڕانی برایم ئەحمەد لە گۆڤاری **Perade** وەرگێراوە.

... ئەوەندەی خوێن بەتەنها لەڕێی دەسکەوتنی زێڕدا ڕێژراوە، هەموو کانزاکانی تر بەسەر یەکەوە ئەوەندە خوێنیان لەڕێدا نەڕێژراوە. کەچی شتێکی بێ فەڕو لەخۆیا چ نرخێکی ئەوتۆی نییە. دەردی ئەندازیارێکی کانهەڵکەنی قسە فەیلەسوفانە ئەڵێت ((پیاو بەچاوی گیمیاگەری بڕوانێتە ئەو نرخەی خەڵك داویانە بەزێڕ، زۆر سەیر دێتە بەرچاوی، چونکە ئەو زێڕە نازدارەی خەڵك خۆیانی بۆ دەدەن بەکوشت، بەپێی کیمیا لەگەڵ قوڕقوشمی بێ قیمەتدا ٣ ئەلەکترۆنیان جیاوازە)).

## ١٠)- جەواهر لال نەهرۆ: [١٠٠]

بەکورتی لە (کەرەنت مستوری)یەوە وەرگیراوە. پاندێت جەواهر لال نەهرۆ قارەمانێکی نیشتمانی نەبەزی هیندستانە، لە ساڵی ١٨٨٩ز لەخێزانێکی دەوڵەمەندو بەناوبانگی (براهمەنی) لەشاری کشمیر لەدایك بووە.

باوکی ناوی (ئاناندیە هاوان) پارێزەرێکی نیشتمانپەروەری ناودار بوو، لە ئینگلتەرە خوێندنی تەواو کردووە، لە کۆلیجی (هارۆ، ترینتی کۆلیج و

---

[١٠٠] گەلاوێژ، ژمارە ٣،٤، ساڵی ٢، نیسانو مارتی ١٩٤١ز، ل٢٥.

کامبرج) لە ساڵی ١٩١٦ز لەگەڵ (گاندی) یەکتریان ناسیوەو لەیەکتر جیا نەبوونەتەوە.

هەشت ساڵی لەبەندیخانە بەسەر بردووە، پیاوێکی دیموکراتخوازی ڕادیکالی بووە. لەساڵی ١٩٣٦-١٩٣٧ کرا بەسەرکردەی (کۆمەڵەی هەموو هیند)... تاد.

## اا)- قین: [١٠١]

(ئەلفرێد دی مۆسیی) کە شاعیرێکی بەناوبانگی سەدەی هەژدەمینی فەڕەنسییە، ئەم قەسیدەیەی وتووە لەگەڵ (جۆرج ساندا) کە ژنە ئەدیبێکی ئینگلیزییە، کەدوای ناسیاوییەکی زۆر هەڵی خەڵەتاندووە.

*دەك شەرمەزار بیت ئافرەت!*

*ئەو ئافرەتەی فێری خیانەتت کردم.*

*ئەوەی لەترساناو لە قینانا عەقڵ و هۆشت پێ نەهێشتم...*

*دەك شەرمەزار بیت، چاوە ڕەشەکە، وەك خۆشەویستی بەدخوو*

*توانی دڵم لەبەهاری عومرا لە تا ریکیدا بنێژیت.*

*لە تۆوە، لەزەردەخەنەی تۆوە، لە نیگای خۆ خرا پکەرتەوە فێربووم*

*چۆن لەعنەت لەسێبەری بەختیاریش بکەم...*

---

[١٠١] لە ئەدەبی گەلانەوە- بەرەو هەوار، وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە برایم ئەحمەد – ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، ١٩٩٦.

## ١٢)- دوو دیویی قەڵغانەکە [١٠٢]:

**نووسینی (بۆمۆند)، وەرگێڕانی برایم ئەحمەد.**

**لەسەردەمی (پاڵەوانبازی)دا شازادەیەکی ئینگلیز (بتێك) بۆ خوای سەرکەوتن دروست دەکات و لەچوار ڕێیانێك دای دەنێ، ڕمێك بەدەستە ڕاستیەوەو دەستی چەپی لەسەر قەڵغانێك دەبێت، دیوی ناوەوەی قەڵغانەکە لەزێڕو هی دەرەوەی لەزیو دەبێت و لەسەر هەردوو دیوی نووسینێك دەبێت.**

**ڕۆژێك واڕێدەکەوێت دوو سوارچاك، یەکێکیان ڕەش پۆش و ئەوی تریان ئاودامان سپی لەیەك وەختدا، بەلام بەرامبەر بەیەك پێکەوە ئەگەنە لای (بتەکە)...**

**ئەبێ بەشەڕیان و یەکتر زامدار ئەکەن و ئەکەونە خوارەوە، خواو ڕاستان (حەکیم)ێك بەڕێکەوت بەسەریاندا دێت وبرینەکانیان سارێژ دەکات و ئینجا پێیان دەڵێت:**

**لەگەڵ ئەمەشدا پەندێکی گەورە لەم شەڕەی ئەمڕۆتان هەیە... لەمەودوا نەکەن بچنە نزارێکەوە تا زۆر جوان هەردوو دیوی بابەتەکە لێك نەدەنەوەو بەراوردی نەکەن، چونکە هەردووکتان ڕاست دەکەن و هەردووکیشتان ڕاست ناکەن...**

[١٠٢] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٣-٤، ساڵی ٢، مانگی مارت و نیسان، ١٩٤٨، ل٣٢.

## ١٣)- سیاسەت چییە؟[١٠٣]

(لۆرد بەلفۆر)

غەزەتە چییەك لە لۆرد بەلفۆر دەپرسێت، سیاسەت چییە؟...

ئەویش لەوەڵامدا سەرگوزشتەی پاشایەکی هندستانی بۆ دەگێڕێتەوە کە خەونیکی بینی بوو، لە خەونەکەیدا هەموو ددانەکانی وەریبوون. و کەوتبوونە خوارەوە... هتد.

## ١٤)- ئەوانەی بەچاو دەبیستن:

لەگۆڤاری (الهلال)وە وەرگیراوە.

فەرقێکی گەورە هەیە لەبەینی ئەوانەی کەبە کەڕی لەدایك دەبن و ئەوانەی لەژیانیاندا کەڕ دەبن.

چونکە یەکەمیان هیچ لەخۆیا بەکەم و کوڕ نازانێ، بەڵام دوومیان پەشۆکاوەو هەمیشە خەڵك لەخۆی بەزیاتر دەزانێ. چونکە حاسەیەکی لەوان کەمترە، یادی بیستنی دەنگی خۆش و ناخۆش دەکات کەلەپێش کەڕ بوونیا بیستوویەتی. هەموو کەڕێك کەچاوی بەجوڵانی لێوی کەسێك دەکەوێت دەیەوێ بزانێ چی دەڵێت؟...

گەلێك مەکتەب و دەرس خانە لەوڵاتاندا بۆ کەڕان کراوەتەوە، بۆ ئەوەی فێر بکرێن لێو کەجوڵایەوە چ مانایەك دەدات. یەعنی بتوانن لەجیاتی حاسەی بیستن چاو بەکاربهێنن.

---

[١٠٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٣،٤، ساڵی ٢، ١٩٤١ز، ل٩٥.

## ١٥) کەنەوت و خەڵوز برایەوە [١٠٤] :

لەئینگلیزی‌یەوە وەرگێراوە.

لەم سەردەمی مالینەیەدا نەوت و خەڵوز نرخێکی تابڵێیت زۆریان هەیە بۆ پێشکەوتن، بۆیە کزبوونی خێرای ڕێژەی نەوتی ژێرزەمین ترسێکی گەورەیە لەڕێی شارستانی‌یەتدا. لەبەرئەمە زانایان هەرلەئێستاوە خەریکی چار بۆدۆزینەوەن، وەکو دانراوە بەڕاوێژ سوتەمەنی نەوتی دونیا بەشی تا(٥٠) پەنجا ساڵی تر دەکات، هەروەها خەڵوزیش ئینجا بەشی سەد ساڵی‌تربکات، بەنیازی دۆزینەوەی سوتەمەنی‌یەکی تر کەلەبریتی نەوت و خەڵوز بەکاربهێنرێت... تادوایی.

## ١٦)- (هەموو ڕەگەزەکانی دونیا وەک یەکن)؟[١٠٥]

(نوسینی دکتۆر واشنگتۆن بێت) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد. بەشی زۆری ئەو زانایانەی لەعیلمی ئینسساندا باوەڕ بەقسەیان دەکرێ ئەڵێن لەڕووی زەمیندا هیچ ڕەگەزێ نی‌یە کەبەپاك و پەتی‌یەتی مابێتەوەو.. ڕەگەزی تری تێکەڵ نەبووبێ و ئەگەر بهاتیەو بتوانرایە زنجیرەیەك خەڵك بەخوێن پاکی بهێڵرێتەوە بێ‌ئەوەی هیچ خوێنی بێگانەی تێکەڵ بێ هیچ گومانی نی‌یە کەئەم ڕەگەزە لەباشی و بەهێزی‌دا نەئەگەیشتە ڕەگەزێکی تێکەڵاو .... تادوایی.

---

[١٠٤] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥،٦، ساڵی ٢، مایس و حوزەیرانی ١٩٤١ز، ل٦٧.

[١٠٥] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧،٨، ساڵی ٢، تەمموزو ئابی ١٩٤١ز، ل٣٦.

## ١٧)- (هەربژی سەربەستی)(١٠٦):

ئەم پارچە جوانە لەکتێبی ( ناپلیۆن)ی نووسەری گەورەو ئازادی پەروەری ئەڵمان (ئیمیڵ لۆدفیك) وەرگیراوە.

لەرۆژێکی تشرینی یەکەمی ١٨٠٩زدا ئەوەی ناپلیۆن لەشکری نەمسا ئەشکێنێت لەکۆشکی (شۆنبروون)ی مەزن لەگوێی زێی (دانوب) کۆمەڵێکی گەورە دەبەستێت. لەو وەختەدا کوڕێکی هەرزەکار دڕ بەخەڵکەکە ئەدات کەخۆی بگەیەنێتە کۆشکەکەو ئەیگرن ئەیپشکنن کێردێکی درێژو وێنەی کچێکی لائەدۆزنەوە.

لەژووری نۆبەت چییەکاندا زۆر پرسیاری لێ دەکەن وەڵامی هیچیان ناداتەوەو ئەڵێت کەوا ڕاستی تەنیا لای ئیمپراتۆر دەڵێت... تادوایی.

## ١٨)- راباندرانات تاگور)(١٠٧):

راباندرانات تاگور- لە ١٨٦٠ز دا لە (کەلکەتە) هاتۆتە دنیاوە، لەبنەماڵەیەکی (پەنگال) کەگەلێ پیاوی گەورە گەورەی تیا هەڵکەوتووە. تاگور هەرلە ١٨ ساڵیەوە ناوبانگی بڵاوبۆتەوە بەناو خەڵکا کەئەوسا هەرچیرۆکی تەمسیلی مۆسیقی دەنووسی، لەپاشا کەوتە داستان نووسین.. شیعرەکانی بەجۆرێك لەهندستان بڵاوبووەو خەڵك کردیانە پێشڕەوی شاعیران و سەرکردەی ئەدەبیاتی تازەی هیند..

تەنانەت ئەدەبیاتی دەوری ئەویشیان ناونا ئەدەبیاتی سەردەمی (راباندرا ناتی).......

---

(١٠٦) گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨،٧، ساڵی ٢، تەمموزو ئابی ١٩٤١ز، ل٤٠.

(١٠٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

لەئەدەبیاتی ئینگلیزی شارەزابوو، لەمۆسیقا دەستێکی باڵای هەبوو.
لەفەلسەفەو شیعرو داستانو چیرۆكو گاڵتەوگەپ لەهەموو بارێکی نووسیوە. لەساڵی ۱۹۱۳زدا جائزەی (نۆبڵ)ی وەرگرت... تاد.

## ۱۹)- (ئەو باوەڕانەی لەشەڕان)[۱۰۸].

لەساڵی ۱۹٤۰ز کەڕووس و ئەڵمان دۆست بوون هاوڕی مۆلۆتۆڤ ووتی: (شەڕی ئەمڕۆ شەڕی بیروباوەڕە) خەڵك سەریان سووڕما کەوا ڕووس خۆی لەم شەڕەدا نی یە، کەرەئیسی وەزارەتەکەی بەشەڕی بیروباوەڕی دادەنێ... بەڵام وادەرکەوت کەکۆمۆنیزم و نازی هەرگیز نابن بەدۆست و دیموکراتی و کۆمۆنیزم بەرامبەر بەدوژمنایەتی نازی دەتوانن بەئاسانی قینی خۆیان فەرامۆش بکەن.

لەوچەند دێڕەی خوارەوە بەکورتی باسی ئەو بیرو باوەڕانە دەکەین کەوا لەشەڕان....

١- *دیموکراسی:* لەسیستەمی دیموکراسیدا باوەڕ وایە کەکۆمەڵ بۆ ئەوە دروست بووە کەبەکەڵکی تاکە فەرد بێ، بەڵام لەدیکتاتۆریەتدا باوەڕوایە کەفەرد ئەبێت خزمەتی کۆمەڵ بکات.

٢- *کۆمۆنیزمی سناعی تازە:* لەناوەندی سەدەی هەژدەیەم لەلایەن فەیلەسوفی ئەڵمانی (کارل مارکس)ەوە بناغەی داڕێژراوەو دەڵێت هەرچی سەروەت سامان هەیە کرێکار دەیهێنێتە بەرهەم کەچی لەم بەری ڕەنجەی هەرئەوەندەی پێئەبڕێت کەمەمرەو مەژی پێی ڕابوێرێت ئەوەی تر ئەچێتە گیرفانی سەرمایەدارانەوە.

---

[۱۰۸] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥،٦، ساڵی١، ۱۹۳۹، دووبارە بلاوکراوەتەوە.

٣- *ناشنالْ شۆسیالیزم:* جولاَنەوەیەکی قەومی ئەلْمانی یە سەرکردەی (ئەدۆلف هیتلەر) ئامانجیان یەکخستنی هەمو ئەلْمان و لابردنی پەیمانی ڤارسیل و ئەرزو مستعمرات پەیداکردن و تەنیا ئەو کەسانە ئەندامی میللەتن کەخوێنیان ئەلْمانە.

٤- *فاشیزم:* لەنزامی فاشیدا قەوم کوتەکی دەستە لەبریتی کرێکاری کۆمۆنیزم، ڕەگەزی ناشنالْ سۆشیالیزم لەنیزامەکەیان ناوی ڕەگەز نی یە.

## ٢٠)- چۆن ئیش بکەین[١٠٩]:

(بەرتراند ڕۆسل) کەیەکێکە لەفەیلەسوفە گەورەکانی ئینگلتەرەو عالیمە بەناوبانگەکانی. لەشەڕی گەورەی پیشوودا لەژێر عنوانی (بناغەی پێشکەوتنی کۆمەلْ)دا کتێبێکی نوسیوەتەوە. لەگەلْ ئەمەشدا کە ٢٥ سالْ بەسەر نووسینەوەی ڕابردووە بەلاّم وەك بۆ ئێستا دانرابێ وایە. تیایا دەلێت: لەم ژیانە کورتەماندا چۆن و چی دەتوانین بکەین بۆ ولاّت و هاولاّتی یەکانمان؟ بەشی زۆری ژن و پیاو بەدلْ ئارەزوو دەکەن وەبەپەرۆشن بۆ خزمەتی ئادەمیزاد... ژیان ئەوەندە کورتە بەشی ئەوە ناکات کەهەموو ئاواتێکمان تیا بێتەدی بیری پەسەندو تێگەیشتنی ڕاست بناغەی هەموو پێشکەوتن و گۆڕینێکە تێکڕا دوو ڕێگا هەیە بیگرێتەبەر بۆ ڕزگارکردنی کۆمەلْ لەم سەرگەردانی یە:

١- هەولْدان بۆ بەهێزکردن و بەرزکردنەوەی بیروهۆشی کۆمەلْ چەند لەتواناتاندا بێ...

---

[١٠٩] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٢،٩، سالْی ٢، ئەیلول و کانوونی یەکەمی ١٩٤١ز، ل٨٠.

٢- پێگەیاندنی فەرد یان کۆمەڵ بەسەربەخۆیی نەك لەسەر خەڵك و کۆمەڵانی تر...

٣- وەبۆ سەرکەوتنمان لەو دوو ڕێیەدا پێویستە هێزی داهێنان و پێکهێنان (الابداع والتکوین) پەروەردەو بڵاوبکەینەوە بەناو ئادەمیزاد و کۆمەڵدا... تادوایی.

## ٢١)- ژنانی ترکستان[١١٠]:

چۆن پەچەیان توڕهەڵدا؟ لە (New Yourk Times) وەرگیراوە.
کۆمەڵێك ژنانی خوێندەواری تاشکەند لەئۆپێرایەك کۆبوونەوەو زۆر بەگەرمی داوایان کرد کە قانونێك دابنرێ بەپێی ئەو قانونە ژنانی ئۆزبەکستان کەپایتەختەکەی تاشکەندە (طشقند)، پەچە نەپۆشن.

## ٢٢)- مارشاڵ فۆرشیلۆف کێیە؟[١١١]

مارشال کلیمنت فۆرشیلۆف: کوڕی کابرایەکی شوانە لەمقاتەعەی (بەکاتیر نوسلاف) لەڕووسیای خواروو لەدایك بووە لە ١٢ ساڵی دەستی بەخوێندن کردووە بەبێ هۆ لەسەرکار دەریدەکەن تەنیا لەبەرئەوەی شەبقەی دانەگرتووە بەرانبەر پۆلیسێکی گومرگ. ساڵی ١٩١٧ز بەشداری شۆڕشی کردووە.
لەشەڕی دژی ئەڵمان بەشداری کردووەو ڕوتبەی مارشاڵی پێدراوە لەگۆڤاری P.T.O وەرگیراوە.

---

[١١٠] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە٣ ،٤، ساڵی ٢، مارت و نیسانی ١٩٤١ز، ل٦٠.

[١١١] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧،٨، ساڵی ٢، تەمموزو ئابی ١٩٤١ز، ل١٧.

## ٢٣)- یەکێ مایسی جەژنی کرێکارانی دونیا[١١٢]:

## ٢٤)- ناپلیۆن لەماڵەوە:

ڕۆژێ لەژیانی دیکتاتۆرێك برایم ئەحمەد کردویەتی بەکوردی.

## ٢٥)- ماری کوری:

١٨٦٧ - ١٩٣٤ز لەژوورێکی بچووکی ساردوسڕدا بێدەزگا و کەرەسەی تەواوی ئیش کردن (ماری کوری)و (پیێری) مێردی هەندێ شتی وایان تاقیکردۆتەوە کەکاریان کردۆتە سە ڕێی دواڕۆژی زانین و چاوی پیاویان زیاتر کردۆتەوە بۆ ئەوەی زۆرتر لەدونیا لەتەلیسمەکانی بگەن و ماددەی (ڕادیۆم)یان دۆزیوەتەوە کەبۆتیمارکردنی نەخۆشی وێنەی کەمە. لەکتێبی (Leader Grear)ەوە وەرگیراوە.

## ٢٦)- چۆن لەسیانزەساڵیدا ژنم هێنا؟

ماهاتما غاندی[١١٣]

زۆر لام گرانە باسی ئەو ژن هێنانەم بکەم کەلە سیانزە ساڵیدا ڕویداوە و هەرچەندە چاوم بەمناڵی ئەم عومرەم دەکەوێت ژن هێنانە ناوەختەکەی خۆمم ئەکەوێتەوە بیر....

---

[١١٢] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، ساڵی ٩، نیسانی ١٩٤٨، ل٥٠.

[١١٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٢، ساڵی ٧، شوباتی ١٩٤٦.

## ٢٧)- ئەلبانیا:

وولاتێکە لەگوێ دەریای ئۆدریاتیک، گەورەیی (١,٧٥٧)میل مربع و دانیشتوانی نزیکەی ملیۆنێ کەسە... لەتەموزی ١٩٤٣دا کەئیتالیا هێرشی کردە سەریان و خاکی داگیرکردن. ئەمان بەسەرکردەیی ( ئەنوەر خۆجە) فاشیەتیان وەدەرنا (نوجەیمەی)خێزانی خۆجە ئێستا سکرتێری مێردەکەیەتی و فیداکاری زۆری نواندووە.[١١٤]

## ٢٨)- قارەمانی بەلقان[١١٥]:

(ستیڤان بریچیڤێ) نوسەری ئەم وتارە مارشاڵ تیفۆی قارەمانی نەبەزی بەلقان زۆر چاك دەناسێ بۆیە ووتارەکەی شایانی خوێندنەوەیەکی وردە. (تیتۆ)یەکێکە لەو سێ سلاڤەی کەلەم سەردەمی دوایی‌دا زراوی ئەڵمانیای تۆقاند. دوانەکەی تر ستالینی سۆڤیاتی و دیمترۆڤی بولغاری لەمەڕ ئاگرتێبەردانەکەی ( ڕانشتاکر)ی ئەڵمانیا. تیتۆ لەباوکێکی کرواتی و دایکێکی سلۆڤینی لە (زاگرب) لەدایك بووە لەکڵێسەی کاسۆلیکی دێکەیان ناونراوە (حوسب برزو) لەساڵی ١٨٩٠ز لەدایك بووە.

## ٢٩)- جەنگیز خان (تەموجین)[١١٦]:

لەساڵی ١١٦٢ز لەدایك بوو.

وادیارە دنیا بێ جەنگیزخان و تەیموری لەنگ نابێت بۆیە خوا (هیتلەر)ی بۆ سەدەی بیستەم دروست کردووە. لەئینگلیزی‌یەوە وەرگیراوە.

---

[١١٤] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٢، ساڵی ٧، شوباتی ١٩٤٦.ل٥٥

[١١٥] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٠، ساڵی ٥، تای ١٩٤٦، ل٦٠-٦٢.

[١١٦] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥، ساڵی٤، مایسی١٩٤٣.

حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر عەشـرەتێکی کۆچـەری سـوارەی ( مـەغۆل) ئیمپراتۆریەتی پارچەپارچەی چینیان وەك گێژەڵوکە دایەپێش خۆیان.

### ٣٠)- مارشاڵ نای چی لیّهات[١١٧]؟ :

پیـتر سـتورات نـای لـەگۆڤاری (Parede) ەوە یـەکێ لەنهێنیـیـەکانی تـاریخی تازە مردنـی مارشاڵ نای قۆمـاندانی گـەورەی ناپلیۆنـە. بەتـەاوی باوەڕکراوە کەمارشاڵ نای جەنەڕاڵی گەورەی ناپلیۆن لەلایەن سـەربازەکانی لویسـی هەژدەهەمـەوە نەکوژراوە. لـە ١٨١٥/١٢/١٦ز حوکمەکـەی خـۆی پـێ ووتـرا کەئیعدامـەو ئەفسـەرەکان ڕزگاریـان کـردووەو ڕەوانـەی ئەمـەریکایان کـردووە لەسـاڵی ١٩٤٢ لەتەمـەنی ٧٧ سـاڵیدا مـردوو لەسـەر کێلەکـەی نوسـراوە (یادگـاری نیشـتمان پەرسـت و سـەربازێکی شۆڕشـی فەرەنسـی بەردەستی ناپلیۆن).

### ٣١)- مەترسی شەڕ[١١٨]:

تـۆوی نـاکۆکی گـەلێجار گـەلێ ڕۆژنامـە کۆنەپەرسـتەکانی ئینگلـیزو ئەمـەریکا داوا دەکـەن کەلـەبریتی ئـەو سیاسـەتی ئاشـتی و برایـەتی وەك یەکیـەی هەیـە لـەناو گـەلاندا سیاسـەتی بـەکارهێنانی هـێزی دڕندانـە پەیڕەوی بکرێت.

### ٣٢)- شێت یان ژیر...[١١٩]:

---

[١١٧] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٥،٦، ساڵی ١، ١٩٤٠.

[١١٨] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٦، ساڵی ٧، حوزەیرانی ١٩٤٤، لە ئینگلیزییەوە.

[١١٩] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١١،١٢، ساڵی ١، تشرینی یەکەم و دووەمی ١٩٤٠.

لەوتارێکی نایاب و خۆشی نوسەری ئەمەریکی بەناوبانگ ( فرانك وارد بیکەر) وەرگیراوە کەبۆ گۆڤاری (The Modern Thinker) ی نووسیوە. دەڵێت: (بەبیری من ئەبێ هیوامان هەرشێت بێت، لەتاریخی بەشەردا بگەڕێیت هەمیشە شێت پێشەنگ بوون. چونکە شێت هەرئەوە دەزانن ملی ڕێ بگرن و بۆ پێشەوە بڕۆن، هەموو قارەمانەکانی دنیا لەناو شێتەکاندا هەڵبژێردراون هەروەها هەموو داهێنەرەکانیش نمونەی ( هاین بال و (ناپلیۆن) و (کۆلۆمبسکی) و (جۆرج واشنتن) و (ئەنشتاین) ئەرستۆ دەڵێ: (هیچ بلیمەتێ نەبووە کەڕەگی شێتێتی تیانەبێ).....

## ٣٣)- ژن و پیاو:

لەسەرەتادا نواشتری ( ئەفسانەی هندستان) ئەرزو ئاسمان و ئەو شتانەی لەسەر ئەرزن دروست کردو ویستی ژن دروست کات، ڕوانی هەرچی کەرەسە هەیە لەدروستکردنی پیاودا بڕانویەتییەوە بیری کردەوەو زەردەخەنەیەکی سەرکەوتوانەی لەسەر زار بوو.

ئینجا: لەمانگی چواردە خڕی، لەمار پێچاوپێچی، لەسنەوبەر بەژن وبالا، لەگیالەرزەی لەچڵ پێکاچوونی، لەمیوە مەینی، لەگوڵ نەرم و ناسکی، لەگەڵا سوکی، لەگا کێوی چاوی، لەهەور فرمێسکی و لەڕۆژ هەتاوی وەرگرت.

لەباگۆڕین، لەنەسیم سازگاری، لەکەروێشك ئێسك سوکی، لەتاوس فیزی، لەتووکی قو نەرمی و لەئەڵماس ڕەقی وەرگرت. لەهەنگوین شیرینی لەمرۆر تاڵی لەئاگر گەرمی و لەبەفر ساردی لەتوتی چەنەبازی و لەبولبول ئاوازی وەرگرت، هەموو ئەمانەی تێکەڵ کردو ژنی لێدروست کرد ئینجا بەخشی بەپیاوو پێی ووت هائەمە بکە بەهاوبەشی خۆت و لەخۆشی و تاڵیدا...

## ٣٤)- ڕۆژنامە نهێنییەکەی پلۆدسکی[١٢٠]:

نووسینی وولیام جەنس وەرگێڕانی برایم ئەحمەد

لەهاوینی ١٨٩٣ز دا کۆمەڵێکی بچووك لەنیشتمان پەرستەکانی پۆڵۆنیا زۆر بەدزیەوە لەنزیك (ڤیلنادا) کۆبوونەوە کەئەندامی پارتی شۆسیالیستی یاساغ کراوی پۆڵەندە بوون. نیازیان لەگردبوونەوە تەگبیری دەرهێنانی ڕۆژنامەیەکی سۆشیالیستی بوو کەبیری سۆشیالیستی پێبڵاوبکەنەوە لەناو کرێکارە پۆڵەندییەکاندا...

سانسۆری ڕووسی زۆر بەتوندی ئیشی دەکرد وەئەم چەشنە تەقەلایە تاوانێکی گەورەبوو... هاوڕی فیکتۆر هیگۆ ئەم فەرمانەی گرتە ئەستۆ- ....

## ٣٥)- زووبە پێشکەوە. دنیا چاوەڕێی کردەوەت دەکا...:[١٢١]

ن. ع لەگۆڤاری Psychlogy

دونیا چاوەڕێی تۆ دەکا بەشی خۆت پێك بێنی. ئێستادەوری شت دروست کردن و شت پەیداکردنە. بیری دروستکەر کردەوەی دروستکەر ئەم دنیایە هەڵدەسوڕێ دامەنیشە تەمبەڵ مەبە نووست و خەواڵو مەبە بۆ شتی تازەی بەکەڵك بگەڕێ لەدووی بڕۆ. شتی تازە فێربە، مەشقی تازە بکە، تەجرەبەی تازە ئیرشاداتی تازە وەرگرە، خۆت پێشخە... نووسینی (نیوتۆن روجرس)

---

[١٢٠] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی ١، تەمووزی ١٩٤٠،ل٥.

[١٢١] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧، ساڵی ١، ١٩٤٠.

## ٣٦)- سیمۆن بۆلیڤار: ١٧٨٣ - ١٨٣٠

لەناو هەمو سەرکردە شۆڕشگێڕەکاندا کەلەدنیای تازەدا هەڵکەوتوون دوانیان لەوانە ئەگەنە پایەی هەرەبەرزی گەورەیی. لەئەمریکای ژووروودا (جۆرج واشنگتن) کەبووە باوکی وولاتەکەی خۆی. وەلە ئەمریکای خوارووداا ( سیمۆن بۆلیڤار) ئەم دوو پیاوە لێکچوونێکی زۆر لەنێوانیاندا هەیە لەڕووی خێزان و بنەماڵەو پلەو پایەوە سیمۆن بۆلیڤار باوکی شەش گەل و وولاتە لەئەمەریکای لاتین فنزویلا، کۆلۆمبیا، پاناما، ئەکوادۆر، پیرۆ، پۆلیڤیا بەباوکی خۆیانی دەزانن و دادەنێن و هەمووشیان لەقەبی (ئازادکەر) یان لێناوە.

## ٣٧)- خەوبینین:

هەموو یەکێك لەئێمە کەخەونێ: ئەبینێ بیری لێ ئەکاتەوە ئاخۆ ماناکەی چی‌بێت بەزۆری خەرافات و قسەو باوەڕی کۆن و پڕوپووچی تێکەڵ دەبێت. هەندێ جاریش ڕاست دەردەچێت وەك خەونەکەی (ئەبراهام لنکۆلن) سەرەك کۆماری ئەمەریکا.

## ٣٨)- دەستوری ئەتلانتیك:

وولاتە گەورەکەی بەریتانیا لەشەڕە عالەمیەکەدا کەشەڕێکی مردن و ژیان بوو. جابەوبۆنەیەوە دەستوری ئەتلانتیکمان بەوەرگێڕاوی لەگەلاوێژدا بلاوکردەوە. هیچ شکیش لەوەدا نی‌یە کەکۆمەڵی کوردیش یەکێك دەبێ لەو کۆمەلانەی کەسەربەستیان نیازەو مەبەست لەو دەوڵەتە گەرورەیەیە.

سەرەك كۆماری شارەزای وولاتە یەكگرتووەكان ( مستەر ڕۆز فەلت)و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا ( میستەر چەرچڵ) كەحكومەتی بەریتانیا دەنوێنێ كۆبوونەوە پێكەوەو بڕیاریان دا.

١- وولاتی هەردوولایان چاویان لەدەستكەوتی هیچ زەوییەك و شتی تر نییە.

٢- هیچ لایەكیان ئارەزوو ناكەن بەئارەزوو خوایشتی ئازادانەی نەتەوەكانی پەیوەندیدار نەبێ هیچ گۆڕینێ لەوولات و خاك و زەویدا بكەن.

٣- لایان وایە كەهەموو نەتەوەكان بەدەستی خۆیان، چەشنی حكومەتی خۆیان هەڵبژێرن.

٤- تێئەكۆشن لەهەموو دەوڵەتەكان گەورەو بچووك وەك یەك بەشداربن لەبازاڕدا.

٥- هەردوولا ئارەزوومەندن كەلەناو هەموو نەتەوەكاندا هەرەوەزێكی تەواو بێتە بەرهەم.

٦- لەدوای لەناوبردنی نازی زۆردار هیوایان هەیە كەئاشتییەكی وەها دامەزرێنن كەچەسپاو بێت.

٧- هەردوولا بڕوایان وایە دەبی نەتەوەكان دەستهەڵگرن لەبەكارهێنای هێز.بەیانی دەوڵەتە یەككگرتووەكان (تصريح مشترك) كەلەلایەن (نەتەوە یەككگرتووەكانی ئەمەریكا، یەكێتی سۆڤیەت، چین، ئوستورالیا، بەلچیكا، كەنەدا، كۆستاریكا، كوبا، یۆنان، چیكۆسلۆڤاكیا).

## ٣٩)-فەلسەفەی دلێری و مردن[١٢٢]:

لەگۆڤاری (الهلال)ەوە وەرگیراوە (دەربارەی شەڕی یابان و چین)
دوای ئەو شەڕە یابانیەکان تێگەیشتن لەچین پیاو هەیە فەلسەفەو بیروباوەڕ هەیە، ئەو فەلسەفەیە خەڵك فێردەکات و بڕوامان هەیە کەمردن گەورەی ژیانەو ئەبێ بۆ ئەوە بژین بزانین چۆن شەڕ دەکەین.

## ٤٠)- فنلەندە[١٢٣]:

بەبۆنەی شەڕی سۆڤیەتی و فنلەندەوەلە **(Life)** وەرگیراوە .
وولاتێکە لەژووروی ئەوروپایەو دانیشتوانی چوار ملیۆن کەسەو گەورەیی ٣٨٨هەزار کیلۆمەترە زمانەکەیان لەمەجەڕی دەچێ، پایتەختەکەیان (هەڵسەنکی)یەو وولاتێکی زۆر ساردە ٤٤ هەزارو ٨٠٠ گۆمی تیایە، وەزۆر پێشکەوتوو خوێندەوارن.

## ٤١)- خواردەمەنی دواڕۆژ:

لەئینگلیزییەوە وەرگیراوە.
زانایان دەمێکە خەریکن لەمەوادی کیمیاوی خواردن دروست بکەن، بەلام بۆنەگبەتی، دروستکردنی پرۆتین لەهەموو شتێ گرانترو زەحمەت ترە..

## ٤٢ -٤٣)- شەڕی پێشوو:

چەند کەسی تیاچوو؟ وەچەندی تێچوو؟.
لەگۆڤاری **(Parade)**وەرگیراوە.

---

[١٢٢] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١، ساڵی ١، ١٩٣٩، ل٤٩.

[١٢٣] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١، ساڵی ١، ١٩٣٩، ل٥٣.

جگە لەڕووسیا کوژراو ٧٠٧٥٣٩٦ کەس، بریندار ١٣٥٠٠٦٠٩ کەس بوو، زەرەروزیان ٨٠,٠٠٠,٠٠٠ لیرەی ئینگلیزی تێچوو کەبۆ دروستکردنی خانوو بۆ هەر خێزانێك ٥٠٠ لیرەی تێئەچوو ناومالیش ٢٠٠لیرە بەشی ئەکرد[١٢٤].

## ٤٤)- فرانکلن ڕۆزفلت (Franklin Roosevelt) :

سەرکۆماری وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو ١٨٨٢/١/٣٠ لەهایدپارکی نیۆیۆرك لەدایك بووە، لەڕەچەلەکدا هۆلەندین لەسالی ١٦٤٩ز هاتونەتە ئەمەریکا. حقوقی خوێندووە لەسالی ١٩١٢ بۆ کۆمەلی پیرانی نیۆیۆرك هەلبژێردراوە. لەسالی ١٩٢٨بۆ حکومداری نیۆیۆرك‌و لە ١٩٣٢ بوو بەسەرۆك کۆماری ئەمەریکا لە ١٩٣٦دا دیسان هەلبژێردرا تاسالی ١٩٤١ز[١٢٥].

## ٤٥)- دراو[١٢٦] : (Money)

(لەپێشەوە چۆون کرین‌و فرۆشتن کراوە پارە چی‌یە بۆداهاتوو)

لەزەمانی پێشوودا شت کرین‌و فرۆشتن بەگۆڕینەوە بووە، بەلام گۆڕینەوە زۆر قۆرتی دروست کردبوو بۆیە بەهۆی پێشکەوتنەوە سەرەتا ئاسن‌و دوایی مس‌و زیوو دواتر زێڕ بەکارهات‌و ئێستا بۆتە دراو.

---

[١٢٤] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، سالی ١، مارتی ١٩٤٠،ل٤٨.

[١٢٥] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧، سالی ١، حوزەیران ١٩٤٠، ل٤٩.

[١٢٦] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ١٠، سالی ١، ئەیلول ١٩٤٠، ل٢٤.

## ٤٦)- بەختیاری لەچیایە؟ :

ئەگێڕنەوە جارێك پاشایەك زاناكانی وولاتەكەی كۆدەكاتەوەو لێیان دەپرسێ بەختیاری چی‌یە؟ لەچیدایە؟

یەكێكیان دەڵێت لەدەست ماچ كردن و خزمەتكردنی پاشادایە، پاشا دەڵێ چاوی هەڵكۆڵن (ڕیاكارە).

یەكێكیان دەڵێت: لەدەسەڵات و توانادایە، پاشا دەڵی لووتی ببڕن.

یەكێكیان دەڵێت: لەدەوڵەمەندیدایە، پاشا دەڵی فڕێی بدەنە دەریاوە.

یەكێكیان دەڵێت: لەتێرخواردنداية، پاشا دەڵی هێندەی دەرخوارد دەن تاشەق دەبات.

یەكێكیان دەڵێت: لەنەماندایە، پاشا دەڵێت لەناوی بەرن.

یەكێكیان دەڵێت: لەبیرولێكدانەوەی جواندایە، پاشا دەڵێ فڕێی دەنە زیندانەوە.

دوای چەند ڕۆژێك دەری دەهێنن لێی دەپرسنەوە، ئەڵێت لەگەڵ ئەوەشدا تووشی ئەوكارەساتە هاتم بەڵام تائەرز ئەرزبێت و ئاسمان ئاسمان بێت بەختیاری هەرلەبیركردنەوەی باشدایە[١٢٧].

## ٤٧)- وورد و ویلسن:

١٨٥٦ - ١٩٢٤ لەكتێبی Great Leaders وەرگیراوە بیست و هەشتەمین سەرۆك كۆماری ئەمەریكا بەجۆش و چالاك بوو. گەورەی سەردەمی خۆی بوو. لەناوخۆیدا فەرمانی گەورە گەورەی پێك هێناوە. كوڕی پیاوێكی قەشەبوو لەفێرجینیا لەدایكبووە، دكتۆرای لەفەلسەفەدا هەبووە بەهەوڵی ئەو بوو كۆمەڵەی (پەیمانی كۆمەڵانی گەلان) پێك هات.

---

[١٢٧] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٨، ساڵی ١، تەمموزی ١٩٤٠، ل٢١.

## ٤٨)- پەرداخێک ئاوو دینامیتێکە:

بە موناسەبەتی بۆمبای ئەتۆمەوە (٥) ساڵ لەمەوپێش لە گۆڤاری (ئارام جیرسانیس)دا نووسرابوو:

کاتێ ئەلفرێد نۆبڵ **Alfred Nibil** کە نایترۆ گلیسرینی چەورو خەستی گیراوەی ئەکرد بە دینامێت، ئەیزانی کە دەستی لەگیانی خۆی شتووەو دانس لەگەڵ مردن دەکات، زانایان پێیان وایە یەك مۆلۆکۆڵ ئاو بشکێنرێ هایدرۆجین و ئۆکسجینەکەی لێ جیا بکرێتەوە هێزێك پەیدا دەبێت. هێزێکی یەکجار گەورە لە یەك پەرداخدا دێتە دی، ئەوەندەی ئەو هێزەیە (٤٨٠٠) تەن خەڵووز پەیدای ئەکات..

## ٤٩) چۆن مانگرتنەکە بەئاشتی برایەوە؟

لەشاری ناپۆلی لە ئیتالیا هەموو مانیان گرت، بەمە هاتووچۆ وەستا، کۆمەڵێ مانگرتووان لە مەیدانی (سەرکەوتن) لە ڕۆڵەکانی ناپۆلی بەرووخۆشی مانیان گرت، پۆلیس بە جل وبەرگەکانیانەوە، دەستەیەك سەرباز بەسەرکردەیی ئەفسەرێکی جوانەوە تەماشایان دەکرد، نوێنەری کۆمپانیای (نزام) نەراندی بەسەر مانگرتووەکان کە ڕێگا بەربدەن، بەڵام بێ سوود بوو. بەڵام مانگرتنەکە بەئاشتی کۆتایی هات.[١٢٨]

---

[١٢٨] گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە ٦، ساڵی ٩ حوزەیرانی ١٩٤٨، ل٤٧-٥١.

## ٥٠) ژان ژاک ڕۆسۆ ١٧١٢-١٧٧٨ز:

نیوەی خراپی و هەموو چاکی دنیای تازە ناوبەناو سەپێنراوە بەسەر (ژان ژاك ڕۆسۆ)دا، هە بەڕاستیش زۆری بزووتنەوەی -شعاراتی- سەدو پەنجا سالی ڕابردوو ئەگەرچی دەستکردی ڕۆسۆ نین، بەلام مۆری ئەویان پێوەیە، لەجنێف لەدایك بووەو باوکی سەعات چی بوو نووسەرێکی ناسراوی گالتەوگەپ بوو، ڕۆمان و داستانی زۆری نووسیبوو، جۆرە نووسینێکی تازەی داهێنا، رمانتیسیزمی بوژاندەوە.

## ٥١) یۆگۆسلافیاو دەستوری تازە:

وولاتێکە لەگۆێ دەریای ئەدریاتیك گەورەیی بەر لەشەڕ ٩٥,٠٠٠کم و دانیشتوانی ١٣,٩٠٠,٠٠٠کەسە (٦ ملیۆن صرب)و (٤ ملیۆن کروات)و (٥٥٠ هەزار) کەس هەنگاری و (٣٠٠ هەزار) کەس ئەلبان نەژادن لە سالی ١٩٤١ ئەلمانیا داگیری کرد دەستورەکەیان لەگەل هی زۆر وولاتی تر جیاوازە، بەپێی ئەو دەستورە لەهەر فەرمانگەیەکدا یەك سەرۆك و شەش جێگرو ٢٩ ئەندامیان هەیە. هەموو کەس سەربەستە لەئایین و بیرو باوەڕیش کلێسە لەدەولەت جیایە هەموو بێگانەیەك ئەتوانێ پەنابەرێتە بەر یۆگۆسلافیا.

## ٥٢) یەکە قارەمانی چین:

چیان کای شەك Chiang Kai Shek مارشال و سەرکردەیەکی نیشتمان پەروەری چینە لەسالی ١٨٨٨ز لە ڤەنگۆ Fenghua لەدایك بووە چیانگ لەهەموو شۆڕشەکانی ١٩١١، ١٩١٢، ١٩١٧زی چینا دەستی بووەو ئیشی تیا کردووە لەسالی ١٩١٧ - ١٩٢٢ یەکێبوو لەئەرکان حەربیەکانی (سەن یات سین)لە ١٩٢٣دا چووە ئەکادیمی سەربازی مۆسکۆ لە ١٩٢٤دا

گەڕایەوە ئەکادیمیای چینی سەربازی لەدوای مردنی (سەن یات سین) کرا بەسەرکردەی (کومن تانگ)بەیارمەتی کۆمۆنیستەکان واتە بوو بەگەورەی هەموو جەنەڕاڵەکان لە **The Punguin Political Dictionary** وەرگیراوە[(١٢٩)].

## ٥٣) بروسیا چۆن بەرز بووە؟

لەئەڵمانیا سێ پیاو هەوڵ و تەقەلایەکی زۆریان دا، توانیان ڕێگەیەک بکەنەوە بۆ یەکێتی ئەڵمانیا ئەمانە بوون (بسمارك، مولتك، ڕەوون)[(١٣٠)].

(١٢٩) گۆڤاری گەلاوێژ (٤)، ساڵی (١) مارت ١٩٤٠ ل٤٨.

(١٣٠) گۆڤاری گەلاوێژ (٥-٦) نیسان و مایسی ساڵی١، ١٩٤٠ ل٥٧.

# (نەخشەی پێناسەی وتارەکانی برایم ئەحمەد)

ئەگەر بەووردی سەرنجی ئەو (٥٣) ووتارەی پێشەوە بدەین، کەبرایم ئەحمەد نووسیویێتی و لەگۆڤاری گەلاوێژدا لەماوەی دە ساڵ دا بڵاوی کردۆتەوە. چەند ڕاستیەکمان بۆ دەردەکەوێ:

١- برایم ئەحمەد لەزمانی ئینگلیزیدا پیاوێکی شارەزا بووە، توانیویەتی ئەو شارەزاییەی بۆ گەشەکردنی بیروباوەڕی سیاسی و ئەدەبی تەرخان بکات.

٢- هەوڵی‌داوە ئەو شارەزایی و زانیاریانە بگەیەنێتە خوێندەواری کوردو، گەلەکەی خۆی پێ هوشیارو شارەزا بکاتەوە.

٣- شێوەی وەرگێڕانەکەی سەرکەوتوانە بردووە بەڕێوە، تام و چێژی ووتارەکان و بیروڕاکانی بەووردی و جوانی گەیاندووە.

٤- زیاتر هەوڵی‌داوە شانبەشانی زانیاری گشتی بابەتی فیکری و سیاسی و نیشتمانی و پێشکەوتن خوازی بڵاوبکاتەوە.

٥- مەبەستی بووە پیاوە ناودارەکانی دونیا بەخوێندەواری کورد بناسێنێ.

٦- لەخوێندنەوەی ئەو ووتارانەدا دیارە هەوڵی‌داوە گرێکوێرەکان و بیروڕاکان بەجوانی بگەیەنێ و لێڵی و پەردەپۆشی تیا بەدی ناکرێ.

٧- لەهەرباخێ گوڵێك و لەهەر وولاتێك چڵێکی هەڵبژاردووە.

٨- لەبەرئەوەی برایم ئەحمەد پیاوێکی سیاسی بووە بەدرێژایی و بەردەوامی ئەو حەفتا ساڵەی ژیانی ئەدەبی و سیاسی بەر شاڵاوی گرتن و ڕاوەدونان و ئاوارەیی کەوتووە لەمەیدانەکاندا لەململانێدا بووە، بۆیە دەبینین کەم کەس لەنووسەران توانیبێتی باسی شیعرو چیرۆك و وەرگێڕانەکانی بکات هەرلەبەرئەوەشە چونکە نووسینەکانی لەعێراقدا یاساغ و قەدەغە کرابوون خۆئەگەر باسیش کرابن لێکۆڵینەوەی زۆر کەم و بەرتەسکیان لەسەرکراوە، یان بەهێما و ڕەمز ناویان هاتووە. لەکوردستانیشدا لەو ماوە کورتانەی ئازادی بیروڕا هەبووە، بەتایبەتی ١٩٥٨- ١٩٦١ وەلەساڵی ١٩٧٠ -١٩٧٤و لەساڵی (٩٩١)ەوە تاساڵی (٢٠٠٠)کەتیایدا کۆچی دوایی کردووە کەم باس کراوە و لێکۆڵینەوە لەسەر بەرهەمەکانی نەکراوە، لەبەر ناتفاقی و دوبەرەکی و ناڕێکی ناومالی کورد، تەنها (ئومێد ئاشنا)ی نووسەری جوانەمەرگ نەبێت لەساڵی ١٩٩٦ز بەرهەمەکانی برایم ئەحمەدی دووبارە چاپکردەوە، ئەویش بەبێ ئەوەی بوارو دەرفەتی ئەوەی بووبێ لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات... .

٩- وەرگێڕاوەکان هەمەچەشن و هەمەڕەنگ و هەمە بیروباوەڕن و هەمە بۆچوون و زانیاری تیا ڕەنگی داوەتەوە .. لەوپەڕی چەپەوە بۆ ئەوپەڕی ڕاست.. کێشەو قەیرانی کۆمەڵایەتی و ئابوری و ڕامیاری و زانستی و ژنانی لەبەرچاوگرتووە..

١٠- لەسەردەمی گۆڤاری (گەلاوێژ)دا، زیاتر لە (٥٠)پەنجا ووتاری تیابلاوکراوەتەوە، ئەمە جگە لەچیرۆك و شیعری خۆماڵی و وەرگێڕدراو لەزمانی ئینگلیزی و عەرەبی لەبەرهەم و زاخاوی مێشکی کەڵە شاعیرو چیرۆك نووسە جیهانی یەکانە.

ڕەنگە کەم ژمارەی (گەلاوێژ) هەبێت بەرهەمێکی (بلە)ی تیا بلاونەکرابێتەوە و تەنانەت هەندێ جاریش لەیەك ژمارەدا زیاتر لەبەرهەمێکی بلاوکردۆتەوە، بەلام ناوی خۆی نەنووسیوە، یان لەبەر سانسۆر بەڕەمز نووسیویەتی.

١١- ووتارەکان ڕەنگاوڕەنگن و بیروبۆچوونی جوداو هەمە جۆریان تیایە ... واتە دەستە گوڵە، نەك تاکە گوڵ، لەهەرباخە گوڵێکی دیارو گەشاوەی هەڵبژاردووە، گەورە پیاوانی وەك (ستالین و ناپلیۆن و مارشاڵ فۆرشیلۆڤ مۆسۆلۆنی و جەنگیز خان و چەرچڵ و هیتلەرو واشنتۆن) چەندین کەسایەتی سیاسی و کۆمەڵایەتی هەڵبژاردووە، ژیان و کارو کردەوەکانیانی هەڵسەنگاندووە.

١٢- هەر لەو ووتارانەدا باسی حەوت بیردۆزی زانستی جیهانی وەك (گالیلۆو، لوسەرو، ڕۆسۆو، داروین، مارکس، فرۆید، ئەنیشتاین) دەکات و فەلسەفەکانیان شی دەکاتەوەو تیشکی خستۆتە سەر هەندێکیان.

١٣- چەندین ووتاری لەسەر چەمکی سیاسی وەك دیموکراسی و کۆمۆنیزم و فاشیزم و سۆسیالیزم و سەربەستی و ڕەگەزەکانی ئادەمیزادو سیاسەت نووسیوە.

١٤- زانیاری دەربارەی وولاتی ژاپۆن و فنلەندەو چین و تورکستان و ئوزبەکستان و ئەلبانیا و بەلقان و ژیانی دونیا و جەژنی کرێکارانی جیهان و پیاوی ڕەش پێست و کێشەی کۆمەڵایەتی و ئابوری و نەداری و هەژاری و باری تەندروستی نووسیوە.

١٥- بەکورتی و بەکرمانجی نووسینەکانی برایم ئەحمەد بەشیعرو چیرۆك و ووتارەکانی یەوە قوتابخانەیەکی فیکری زۆر فراوانەو لەسەردەمی خۆی ڕێنیشاندەر بووە بۆ کۆمەڵانی خەڵك لەباری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و زانیاری گشتی یەوە.

# (چەند وێنەیەك لەشیعری جیهانی[١٣١])

## (دڵی تەنیایی)

برایم ئەحمەد کردویە بەکوردی.

دیارە برایم ئەحمەد تەنها چیرۆکی چیرۆك نووس و ووتاری ووتار نووسەکانی وەرنەگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی. بەڵکو دەبینین چەندین شیعری شاعیرە گەورەکانی جیهانی وەرگێڕاوەو بڵاویکردونەتەوە بەم شێوەیە دەبینین زیاتر لە ٢٥ پارچە شیعری جیهانی کردووە بەکوردی لەوانە:

١- (دڵ بەندیەک)[١٣٢]:

پارچەیەکی شاعیری ئیتاڵی (جرازیا دیلیدا)یە پاداشتی نۆبڵی هەیە...

*ئەم دوودڵی و بێئارامیە چیە واگرتوومیە ناو*

*ئەم بێبڕواییە چیە هەموو گیانی پڕکردووم*

*ئەم شێتیە چیە بیروهۆشی تەنیوم*

---

[١٣١] چەند وێنەیەك لەشیعری جیهانی - برایم ئەحمەد کردوویە بەکوردی ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا ١٩٩٦ز.

[١٣٢] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ٧ ساڵی ١٠، ١٩٤٩ز.

هەروەك دڕندەیەكی خوێن ڕێژ درێژ دەبێتەوە بۆ ناو جەرگ و دڵم.

تادوێنێ كامەران و دڵشاد بووم، ئەی خۆشەویستەكەم، بەلام ئەمڕۆ پەست و سەرلێشێواوترین كەسم

ئاگری بێبڕوایی لە پڕ لەمێشكما كڵپەی سەند.

وەك زەهرو شەكر لە پڕ تێكەڵ بەخوێنم بوو

مەترسییەكی پڕ لەبێئارامی و سەرسامی و دوودڵی لەناكاو تێكەڵاوی ئێسقانەكانم

بوو وەپاڵاوتەكەی هەموو مژی .........

لەكۆتاییدا بەم شێوەیە دەدوێ

ئەگینا تۆش دەكوژم و خۆشم، ئاوایە خۆشەویستی من، ئاوایە دڵداری بەندەیەكی غیرەت كوێر كردوو، بەربەرەكانی مەكە و خۆت بپارێزەو لەتۆڵەسەندن ئەی خۆشەویستەكەم بزانە كەغیرەت شێتییە، پیاوی شێتیش لەهیچ ناسڵەمێتەوە لەهیچ هۆناكاتەوە مەترسی نازانێ چییە؟.

## ٢- (دوای مردن) [١٣٣]

شاعیری ئەرمەنی گریگۆر واهانیان:

دیم لەخەوما مردبووم

بودا - ی خوای گیان گۆڕین دەرپەڕی لێم و ووتی:

لەچ وێنەیەكدا دەتەوێ زیندووت كەمەوە؟!

سەربەستی كردم لەمیانی سێ وێنەدا، ئەستێرەو فریشتە و گوڵ.

---

(١٣٣) گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٨) ساڵی نۆیەم ئابی ١٩٤٨ز ل ٤٧.

وەرامم دایەوە: من هیچ کامیانم گەرەك نیە...
لێی پاڕامەوە کەلەسەرمێزی دڵدارەکەم دانرێت چاوم لێبوو خۆشەویستەکەم

گرتمی بەدەستە ناسکەکانییەوە، بەڵام داخی بەجەرگم هەربردمی بۆدەمیو
نەیبردم ڕۆژانی جارا نمانی کەوتــەوەبیر کــەوا پێکــەوە بــەم پیاڵەیــە ئــەمان
خواردەوە

گڕی یادگاری بڵێسەی سەند پیاڵەکەی بەرزکردەوەو بەتوند دایبەزەویدا
پیاڵەکە ووردوخاش بوو تۆزقاڵێکی لێهەڵبەزییەوە کەوتە ژێر پێی
خۆشەویستەکەم ئەو تۆزقاڵە بچوکە دڵم بوو... ...!.

### ٣- بەفری (دیسەمبەر)[١٣٤]:

سێر ئەرسەر کونان دویل (١٨٥٩ - ١٩٣٠ز)

دیسانەوە گوڵ گەیشتەوە (دیسەمبەر)
خونچەی کەستانە سەرلەنوێ گەشایەوە.
بەڵام گیانە هەموو بەهارەکانی بەسەرچوون،
ئیتر من و تۆ هەرچلەی زستانمانە،
لەوەوە ئێمە گوڵی ژیانمان چنیوە.
لەبەفری دیسەمبەر زیاتر هیچمان بۆنەماوەتەوە.

---

[١٣٤] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٣) ساڵی حەوتەم مارتی ١٩٤٦ز.

بەڵام زستانیش خۆش و شیرینی خۆی هەیە
خۆشی یەکی لەسەرخۆتر، تەنیاو دەنگ

باکڵۆی بەفر بدا لەسەرمان،
هەرگیز گیانەکەم،
ئاگاتە دڵمان،
خۆش و دڵگیر بوون
بەهارانی گەلێ لەمەوبەر،
بەڵام لەوانیش دڵگیرترو خۆشتر
بەفری (دیسەمبەر)

بەڵێ بەهارانی زۆر لەمەوبەر
ئەگەرچی لای من
وەکو دوێنێ بووبێت وایە.....

.......................................تادوایی

٤- (کەهەر چار نەبێت بمرین) [١٣٥]:

(کلۆد ماکی) لەئینگلیزیەوە.
کەچارنەبی هەربمرین .
با ئاگامان لەخۆمان بێت وەکو بەراز نەمرین.

[١٣٥] گەلاوێژ ژمارە (٤) ساڵی حەوتەم نیسانی ١٩٤٦ز.

ڕادوو نەترێینە شوێنێکی ساکاری پێدەشتەوە،
سەگی هاریش گەمارۆمان بدات

گاڵتەی بەو چارەنوسە پیسەمان بێت
کەچار نەبێت هەربمرین بامەردانە بمرین.
... ... ... ... ... ... ... تادوایی

٥- (دڵداری ناکەم)[١٤٢]:
هۆشی شاعیر ناوداری چین.
ئیتر دڵداری ناکەم،
چونکە دڵداری بێهێزی وپلحی و تەومزلی یە.
بەبەهار خۆم ناکوژم وەبە پایزیش خەم ناخۆم،
باگوڵ هەربۆخۆی بگەشێتەوە یاهەڵوەرێت،
دەبا ڕۆژ گربگرێت، یابکوژێتەوە یاهەر ئاوا بێت،

من چ بەتەنگەوەم؟
دڵدار هەمیشە ستایشی ئاسمان دەکاو
بەڕەنگی ڕوونیا هەڵدەدا
بەڵام من ئەمەوێ سەری کەوم،

---

[١٤٢] گەلاوێژ ژمارە (١١- ١٢) ساڵی ١ تشرینی یەکەم و دووەم، ١٩٤٠ ل١٧.

بۆکاری خۆم بیهێنمە ژێر بارو
لەوێوە سەیری عالەم بکەم.
بۆچی بۆکلۆلی خۆم بلاوێمەوەو
وەك کۆیلە هەر لە پاڵەوە بگریم.

... ... ..تاداویی.

٦- (بۆ لۆکاسنا لەسەرچوونە شەڕ) [١٤٣]:

(کۆلۆنێل لەڤلیس) لەئینگلیزیەوە.
نەگیانە، پێم مەڵی دلڕەق،
کەلەباوەشی گەرم و گورپ سنگی نەرم و ڕوو پڕ دڵنیایی تووە.
باڵ ئەگرم بۆچەك و ئەفرم، ڕووەو شەڕ
ڕاستە من ئێستا دوای یارێکی تازە دەکەوم، کەئەویش یەکەم

دوشمنە کەلەمەیدانا دێتە ڕێم.
بەباوەڕو هێزێکی زۆر تریشەوە ئەگەم بەشێرێك و ئەسپێك و

قەڵغانێکا. بەلام بێوەفایی یە
لەوانەیە کەتۆش پێوەی بنازیت و بی پارێزی
چونکە من هەرگیز نەمتوانی تۆم ئەوەندە خۆش بوێت
شەرەفم خۆشتر نەویستایە...

[١٤٣] گەلاوێژ ژمارە (٩) ساڵی ١ ئابی ١٩٤٠ز ل ٢٣.

## ٧- (فەلسەفەی دڵداری) [١٤٤]:

شاعیری ئینگلیزی (پێرس پێرس شیلی).

*سەرچاوە لەگەڵ زێ تێکەڵ ئەبن*

*زێش ئەرژێتە ناو دەریای گەورەوە*

*بای ئاسمانی هەمیشە تێکەڵ*

*عاتیفەیەکی بەرزو خۆش ئەبێ*

*هیچ نی‌یە، تەنیا، لەم گەردونەدا*

*هەموو شت بە پێی دەستورێکی ئاسمانی*

*لەگیانێکدا یەك دەگرن و تێکەڵ ئەبن*

*من بۆ لەگەڵ تۆ نەبم؟!*

*بڕوانە کێوان ئاسمان ماچ ئەکەن*

*شە پۆل یەکتری ئەگرنە باوەش*

*کوڕ لەخوشکی خۆی هەرگیز نابورێت*

*هاتوو بەچاوی سووك تەماشای براکەی کرد*

*هەتاو دێ ئەرز دەگرێتە باوەش و*

*تریفەی مانگەشەو دەریا ماچ ئەکا*

*ئەم هەموو ئیشە خۆشانە چی‌دەهێنێت*

*ئەگەر تۆش من ماچ نەکەی؟!*

---

[١٤٤] گەلاوێژ مارە (٣) ساڵی ١ شوباتی ١٩٤٠ز ل ٢٢.

٨- (**پیاو ئەبێت، ئەچەوسێتەوە، ئەمرێت**) [١٤٥]:

*کەچرا ئەکوژێتەوە،*

*دنیا لەتاریکیدا مەلە ئەکا،*

*وەلەهەڵچووەکانی تەنیشتیەوە*

*ئەچێتەوە باوەشی خاکە دڵسۆزەکەی،*

*وەختێ هەور ئەڕەوێتەوە لەڕووی ئاسمان*

*هەروەکو بەردی بەقیمەت*

*کەڕەونەقی نامێنێ و*

*ەقەوزوقەزەحیش لەکەناری ئاسمان نامێنێ،*

*تۆفیش هەڵئەکا....*

*وەختێ کەنای دەشکێ*

*نەغمەی لەسەر لێو ئەمرێ*

*دڵیش نەغمەکانی لەبیرئەچێتەوە،*

*بەتەنها دەمێنێتەوە،*

*فرمێسك تەڕی دەکا، بەڵام*

*من وەختێ کەچرا کوژایەوە*

*وەهەموو ڕەوییەوە*

*نای شکاو لێوبێدەنگ بوو.*

*من هەر بۆتۆم ئەی خۆشەویستەکەم و*

*دڵم لەمیحرابی دڵداریتا نوێژ ئەکا....*

... ... ... ... ... ... ... ... ... ... ..تادوایی.

---

[١٤٥] گەلاوێژ ژمارە (٥) ساڵی ١ ١٩٤٨ز.

٩- (ئەدەبیاتی قولە ڕەش) [١٤٦]:

وەرگێڕانی برایم ئەحمەد لەئینگلیزیەوە.

لانگستۆن هیوز، شاعیری قولە ڕەشەکانی ئەمەریکا لەشیعرەکانیا نەك ئازارو هیوای هەر قولە ڕەشەکان بگرە هی هەموو ژێر دەستان و داماوانی بەرەو ڕووناکی ڕۆی و وێنە ئەگرێت:

*فرمێسك پێکەنینمە، پێکەنینیش ئازارم*
*بگرین بۆ ئەم پێکەنینە پووچەم*
*ئەگەر ویستتان پێشبکەنن بەلێشاوی پەژارەم*
*منم قەشمەری ڕەش لیبۆکی بێدەنگی دونیا*
*گۆرانی‌یەکی نوێ*
*من بەناوی ملیۆنان قولە ڕەشەوە قسە دەکەم*
*کەوا هەموو ڕا پەڕیون بۆ ئیش کردن*
*ئەوانی تر باتۆزێك بێدەنگ بن*
*قسەیەکم لایە دەیکەم*
*شتێکم لایە ئەیبێژم*
*گۆرانی‌یەکم هەیە دەیڵێم.*

١٠- (بەردەباز) [١٤٧]:

(راج داندریج)

شاعیری بەناوبانگی قولەڕەشی ئەمەریکایی وەرگێڕانی برایم ئەحمەد لەئینگلیزیەوە.

*(( ڕۆڵە ئەزانی سەر سوودی چی‌یە؟*

---

[١٤٦] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (٥) ساڵی ١٩٤٨ز.

[١٤٧] گەلاوێژ ژمارە (٩-١٠) ساڵی ٨ ١٩٤٧ز.

***بۆ دەربازی ڕێی ئازادییە. شاعیرێکی کورد ))***

***ئەی کاکەی ڕەش، وادیارە ژیانت لاشیرین بووەو***
***ئەتەوێ بەهەموو نرخێك بژیت***
***ئایا تەنیا ژیانی ڕووت ئەم هەموو***
***فیداکارییە گەورانە ئەهێنێ کەتۆ ئەیکەیت؟***
***یان لەگۆڕ ئەترسیت وارِەزا بویت؟***
***بەدیلی بژیت و بەدیلی بمریت.***

... ... ..تاداویی.

**١١- ( خەونی عەبدێک )[١٤٨]:**

لۆنگفیلو (١٨٠٧ - ١٨٨٢ن)

لەنزیك مەرزە نەدۆڕاوەکەوە عەبدەکە لەسەر گازی پشت پاڵکەوتبوو داسەکەی بەدەستەوە بوو ئەم دیوو ئەودیوی ئەکردو بیری لەکوێرەوەری و دیلی ئەکردەوە تاخەو بەلایا خست، پێی خاوس بوو سنگی ڕووتی بەدەرەوە بوو... ... .

***نیشتمانەکەی خۆی هاتە پێش چاو،***
***ئینجا ئاسۆی خەوی زیاتر فراوان بوو***
***قژە سەری وەك لبادی لەگەڵ چەقی بوو***
***پەلە هەورێ بەبەر چاویا تێپەڕی لە پاشا ڕەوی یەوە***
***خۆی لەناو خێڵ و عەشرەتەکەیا دی***
***لەبن درەختێکا ڕاوەستابوو.***

---

(١٤٨) گەلاوێژ ژمارە (٢) ساڵی ٧ شوباتی ١٩٤٦ز.

تاجی پاشایی لەسەرنا
گوێی لەبۆڕەی ووشترو زەڕەی کاروانەکە ئەگرت
کەبەبناری شاخەکەدا ئەهاتنە خوارەوە.

... ..تادوایی.

## ١٢- (خۆشەویستی نەمر)

(شکسپیر)

ئەری خۆشەویستەکەم
ئەشێ من هاوتایت بکەم
لەگەڵ ڕۆژێك لەڕۆژانی هاوین؟!
بەڕاستی تۆ شیرینتر،
هێمنترو نەرمی.
لەوڕۆژانەدا بای سەخت
خونچەی گوڵان دێنێ و دەبا.
ڕۆژ گەلێ جار لەزەوی نزیك ئەکەوێتەوەو
زۆر جار خۆی ئەشارێتەوە... .
هەندێ جار گوڵ سیس ئەبێ و
بای دەشتەکی
لێی ئەداو ئەیبات
بەڵام هاوینی تۆ
ئەی خۆشەویستەکەم
گوڵ سیس نابێ.
هەرچەندە دوریش بخایەنێ

*جگە لەوە مردن هەر ناتوانێ*

*شانازی بەوە بکاو*

*بلێ تۆ بەژێر سێبەریا ڕۆیشتوی...*

... ... ... ... ... ... . تادوایی.

١٣- **(هاوڕێینە)**[١٤٩]:

شیعری شاعیری بەرزی ئینگیزی (پێرس پێرس شیللی‌یە) لەئەسڵەکەیدا نووسراوە بۆ کرێکارانی سەدەی نۆزدەهەم بەڵام کەدەیخوێنیتەوە وادەزانیت ئەمڕۆ نوسراوە.

*هاوڕێینە !*

*بۆچی زەوی ئەکێڵن،*

*بۆ ئەو ئاغایانەی کەوا نزمتان ئەکەنەوە؟*

*بۆچی‌وابەئەرك و لەسەرخۆ،*

*جلی دەوڵەکەندەکان ئەچنن*

*ئەوهەڵمەتە کاسیانەی بەسەرتانەوە ئەلەوەڕێن،*

*بۆچی ئەخۆن،*

*ئە پۆشن،*

*پاشەکەوت ئەکەن*

*هەرلەلانکەوە تاگۆڕ*

*ئەو تەوەزلانە*

*لەبەری ڕەنجی خەڵکی خۆرە سپلانە،*

[١٤٩] گەلاویژ ژمارە (١٢) ساڵی ٧ ١٩٤٦ز.

ئارەقتان لەبەر ئەبڕن،
نەءخوێنتان ئەمژن.
لەبەرچی وەك نەهەنگ هەوڵ ئەدەن؟
گەلێ چەك و زنجیرو قەمچی دروست ئەکەن؟
کەوا ئەم تەومزەلە زەروانە،
بەری ڕەنجی بەزۆر هێنراوە
بەرهەمتان لێداگیرئەکەن...      ...

... ... ... ... ... .. تادوایی.

١٤- (یادگار)[١٥٠]:

شاعیری ئینگلیزی (ت. مور).
گەلێ جار لەبێدەنگی شەوا،
پێش ئەوەی زنجیرەی خەمم تێئاڵێ
یادگاری خۆش خۆشی بەڕۆشنایی ڕۆژانی ڕابردوو
دڵم ئەکاتەوە.
بەزەردەخەنەو فرمێسکی دەمی منالی،
بەوتەی دڵداریانەی ئەوسا ووتراون.
بەو چاوە جوانانەی
ئەوسا پرشنگی ژیانیان لێ هەڵئەقوڵا
ئێستا لێڵاییان داهاتووەو نەماون.

---

[١٥٠] گەلاوێژ ژمارە ١٢ ساڵی ٧ ١٩٤٦ز.

بەو دڵانەی جاران پڕ لەشادی بوون و
ئێستا شکاون
بەم جۆرە هەروا لەبێدەنگی شەوا

... ... ... تادوایی.

١٥- (ژیانی دڵداری)[١٥١]:

پەخشانی جبران خەلیل جبران/ وەرگێڕانی برایم ئەحمەد.

هەستە خۆشەویستەکەم
وەرە بابگەڕێین
بەکێو و کەژدا
بەفر تواوەتەوە
ژیان لەخەو هەستاوە،
بەلە نجەولار،
بەدۆڵ و دەرا دێت و ئەچێ
وەرە بەشوێنما
باشوێن پێی بەهار هەڵگرین
لەو زەوی وزارە دورانەدا
کەبەئاستەم دیارن.
وەرە باسەرکەوینە سەر
لوتکەی شاخ و
بڕوانینە لەرەی
گژوگیا و سەمای گوڵ و
چۆڵی دەشت و دەری دەوروپشتی.

... ... ... ... تادوایی

(١٥١) گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ١ ساڵی ١ ك ١ ١٩٣٩ز.

١٦- (**شینی ساڵ**) [١٥٢]:

لەشیللی‌یەوە وەرگێڕراوە ... برایم ئەحمەد

*ساتە بێبارانەکان، ساڵ مرد*

*وەرن و هەنسك هەڵدەن، وەرن بگرین!*

*ساتە دڵخۆشەکان، ئێوە لەباتی ئێمە پێبکەنن*

*چونکە ساڵ هەرنوستووە، نەمردووە*

*بڕوانن لەخەودا زەردەخەنە ئەیگرێ*

*هەروەکو گاڵتە بەم گریانە ناوەختەی ئێوە بکا*

... ... ... ... ... ... ... تادوایی.

١٧- (**پیری و جوانی**) [١٥٣]:

شاعیری بەناوبانگی ئینگلیزی شکسپیر ١٥٦٤ - ١٦١٦ز.

*پیری و جوانی خوێنە خوێن*

*ناتوانن بژین پێکەوە*

*جوانی پڕە لەخۆشی*

*پیری پڕە لەتاڵی*

*جوانی وەك بەیانی هاوینە*

*پیری وەك بای ساردی زستانە*

*جوانی وەك هاوین ئازیەتە*

---

[١٥٢] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ٢ ساڵی ١ ك٢ ١٩٤٠ز.

[١٥٣] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ١ ساڵی ٧ ك٢ ١٩٤٦ز.

***پیری وەك زستان ڕوتە***

***جوانی پڕ لەیاریو گەمە***

***پیری هەناسەی تەنگو کەمە***

**... ... ... ... ..تادوایی**

## ١٨- (تۆ خوایە گوڵ)

لەیۆنانییەوە وەرگێڕاوە.

***کەبۆ شەونم پێ ئەکەنیو بەشەماڵا بۆنی خۆش ئەنێری***

***چاوەکانی لێك بنێ تاخۆی خۆش ببینێ. . .***

***بەئەستێرە بڵێ:***

***کەشەو تابەیانی جریوەی دێو ئێشکمان***

***ئەگری، هەرگیز ئاوانەبێو نەکوژێتەوە***

***بەهەورە زەردباوە ئاڵتونیەکان بڵێ***

***کەسێبەریان بۆکردین. . .***

***لێك جوێ نەبنەوەو لەسێبەرە کانیان بێبەشمان نەکەن***

***ژیان خۆشە، بەڵام داخەکەم هەموو هیوایەکی تیا نایەتەدی.***

## ١٩- (لەمیانی دوو دالدارڈا)

رابەند رانات تاگور شاعیری بەناوبانگی هیندستان

وەرگێڕ/ برایم ئەحمەد

***بەئەسپایی ووتی: چاو هەڵبڕە خۆشەویستەکەم***

***منیش لێی تووڕەبووم و پێم ووت بڕۆ!***

***کەچی هیچ نەبزووت!***

ڕووبەڕووم وەستاو دەستمی لەناو دەستیا هێشتەوەو ووتم!
وازم لێبێنە! بەڵام نەڕۆیشت!
ڕووی لەڕووم نزیك كردەوە منیش تەماشایەكم كرد ووتم:
چ شوورەییەكە! بەڵام نەجوڵا!
لێوی كەوت بەڕوومە تمدا لەرزیم ووتم: زۆرت لێهەڵبڕی
كەچی هیچ تەریق نەبوومەوە! گوڵێكی كرد بەقژمەوە ووتم:
بێسوود خۆت ماندوو دەكەیت! كەچی هیچ تێكنەچوو!
ملوانكە گەڵەكەی لەمل داكەندم و بردی و ڕۆی. منیش ئەگریم و لەدڵم ئە پرسم:
كوا بۆ ناگەڕێتەوە؟

۲۰- (من و ئەو)[۱٥٤]:

(ڕابەندرا نات تاگور)

ڕوانینە پشێویەكەت خەمگینە،
ئەیەوێ بیرم بزانێ هەروەها
مانگیش ئەیەوێ
بەقووڵایی دەریادا بچێتە خوارەوە!
تۆ هەمو ژیانم ئاگاداری،
هیچم لێت نەشاردۆتەوە،
بۆیە هیچم لێ نازانیت!
ئەگەر ژیانم گەوهەرێ بوایە
ئەمكرد بەسەد پارچەوەو

---

[۱٥٤] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ۳،٤، ساڵی ۲، مارت و نیسانی ۱۹٤۱، ل۸.

ئەم پارچانەم ئەهۆنیەوە

بەگەردانە بۆ ملت!

ئەگەر ژیانم گوڵێکی جوانی بچووك بوایە

بەلقەوە ئەمکردەوە

تابیدەم لەقژت!

بەڵام ژیانم دڵە،

گیانەکەم

ئینجا سنووری دڵ کامەتا؟

تۆ خۆت مەلیکی ئەم مەملەکەتەی و

سنوری نازانی

ئەگەر دڵم هەرخۆشی بوایە

ئەمدی لەبزەیەکی بەختیاری دا

ئەگەشایەوەو ئەوسا

بەچاو تروکاندنی

ڕازی شاراوەییم بۆدەرئەکەوت...

مەگەر هەر ئازار بوایە

ئەتوایەوە

ئەبوە فرمێسکێ،

نهێنی خۆی تیا دەردەکەوت،

بەڵام دڵم

دڵداری بەخۆشەویستەکەم

... .. تادوایی

## ٢١- (وێنەیەک لەژیان)

وەرگێڕاوە.

*بەهێزی قارەمانانە ئەو فرمێسکەی لەدڵەوە قوڵپی ئەدا لە چاوە هەنگوینەکانیانی قەتیس هێشتەوەو نیشانەی خەمو پەژارەیی ڕوی کرد بەژێر زەردەخەنەیەکی شیرینەوە. بەبێ دەنگ تفەنگەکەی دایە دەست مێردەکەی کەهەمووی دەرۆژ بەسەر ژن ومێردیانا تێنە پەڕی بوو. ئەویش بێ دەنگ لەدەستی وەرگت و کردیە شانی*

لەسەری دەڕوات و لەکۆتاییدا دەڵێت:

*لەدوای قسەکانی شەوێك بەتەواوی گۆڕام و هەرچی ترس تۆ بڵێیت لەدڵما نەماوە ئێستەش تەنیا بۆ ئەوە ئەگریام کەبێبەشم لەم بەهرەیەی خوا بە پیاوی داوە لەڕێی ڕزگارکردنی وولات و سەرخستنی هەتا ئەکوژران ئیتر برۆ بەخوام سپاردن.*

## ٢٢- (دڵداری پیرێک)[155]:

(فرانك رالف) خاوەنی ئەم قەسیدەیە ئەدیبێکی بەناوبانگی هەنگاری‌یە.

*ئیتر هیوای هیچم پێی نەماوە !*

*هۆشم هاتۆتەوە بەرخۆم. فێربووم چۆن خۆم بەهەڵگرتنی باری*

*گرانی ڕۆژگار ڕابهێنم!*

*من بەساڵاچووم و ئەو هێشتا کچۆڵەیە!*

*من پیرێکی ڕەنگ زەردی دەموچاو چرچ و لۆچ تێکەوتووی بێهێزو بێگوڕو پەك کەوتەم ئەویش؟*

---

[155] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ٣، ٤ ساڵی ٢ مارت و نیسانی ١٩٤١ز ل١.

***سەرچاوەیەکی ژیانە ، قوڵپ ئەدات، هەموو شتێ ئەداتە پێش خۆی هیچ نیە لەرێیا بوەستێ!***

***ئەو شە پۆلێکی شادیە ، کلپەیەکی ئارەزوو، شۆرشێکی خوێنی ئاگراوی گێژەڵوکەی دڵداری شێتی سەرکەشە !***

***لەگەڵ ئەمەشدا خۆشیویستم. چەند ڕۆژێك نەچەند هەفتەیەك. نەچەند مانگێك خۆشیویستم***

***دڵنێ خۆشیویستم کەچی ئەمڕۆ لە پڕ ڕووی لێ وەرگێڕام !***

***دەسەڵاتی ئەوەم نیە تۆڵەی لێبستێنم***

***ناتوانم پەنجەیەکی تێوە بدەم چونکە چاکەیەکی وای لەگەڵ کردووم کەشایەنی نەبم !***

***عومری درێژکردمەوە، لەدوا هەواری ژیانما قووڵترین و تێرپڕترین خۆشی پێگەیاندووم بۆیە پێویستە لەسەرم بیپارێزم نەك لەعنەتی لێبکەم.***

... ... ... ..تادوایی.

## ٢٣- (دڵداری گوڵێکە)

ئەم گۆرانیە ژاپۆنیە هی شاعیرێکی بێناوە گوایە لەدوای سەدەی (١٨ هەژدەیەم) ژیاوە.

***دڵداری گوڵێکە***

***لەو وەختەدا من ژیانم بێهوودە بەسەربرد***

***داخم ناچێ ئەم گوڵە سیس بوو***

***سیس بوو لەوەپاش هەڵوەری و ئینجا مرد پێش ئەوەی بۆنی بکەم.***

## ٢٤- (چاو)

جبران خەلیل جبران

*ڕۆژێك چاو بەهاوڕێكانی ووت.*

*ئەری من لەودیوی ئەم دۆڵانەوە*

*كێوێك ئەبینم،*

*ئەم ناوەی دا پۆشیوە،*

*ئای چ كێوێكی جوانە!*

*گوێ، لە دوای ئەختێ گوێ لێگرتن پێی ووت!*

*كەواتە ئەو شاخەی تۆ ئەیبینیت ؟*

*من هیچ دەنگی نابیستم!*

*ئینجا دەست هەڵیدایە و ووتی*

*منیش هەرچەند ئەكەم و ئەكۆشم*

*هەستی پێ ناكەم*

*بێگومان چ چیایەك لەناواندا نییە!*

*ئینجا لووت پێی ووت*

*من ناتوانم لەمە بگەم*

*چۆن ئەبێ شاخ هەبێ و من بۆنی نەكەم،*

*شتیوا هەرنەبووە و ناشبێ.*

.. ... ... تادوایی.

## ٢٥- (ژیان)

شاعیری ئینگلیزی (ا. ل. باربولد) وەرگێڕانی برایم ئەحمەد

ژیان ! من نازانم تۆ چیت

بەڵام ئەوەندە ئەزانم كەمن و تۆ

ئەبی لەیەك جویێ ببینەوە
ئینجا کەی یا چۆن،
یالەکوێ پێك ئەگەینەوە؟
ئەمانە هێشتا هەمووی لای من شاراوەن.
ژیان! ئێمە سەردەمێکی زۆر پێکەوە بووین.
لەوەختی خۆشی و شادی و
لەگەردەلولی ناخۆشیدا.
ئینجا خۆت دەزانیت
لێکبڕانی هاوڕێیانی خۆشەویست
چەند ستەمە.
بێ هەناسە هەڵکێشان،
یا بێ فرمێسك ڕشتن نابێت.
بۆیە زوو خۆتم لێبدەرەوە،
زۆر ئاگادارم مەکە
خۆت سەربەست بە لەکاتی وەختی
هەڵبژاردنا بەلام هەرچۆنێك بێ
پێم مەڵێ شەوباش.
لەوەختی ڕووناك ترا
بەیانی باشێکم لێبکە.

# نەخشەی شیعرە وەرگێڕاوەکان

| | |
|---|---|
| ١- سێر ئەرسەر کۆنان رۆیلْ<br>٢-کلۆد ماکی<br>٣-پێریس شیللی (٣ شیعر)<br>٤-شکسپیر (٢شیعر)<br>٥-تامور<br>٦- ئال باربۆلْد<br>٧- لۆنگڤیللۆ | ئینگلیزی |
| جوبران خەلیل جوبران | عەرەبی |
| ١- لانگستۆن هیۆز<br>٢-ڕاج داندرێج | ئەمەریکی |
| ڕابەند رانات تاگور | هیندی |
| فرانك ڕاڵف | هەنگاری |
| گریگۆر واهانیان | ئەرمەنی |
| جرازیا دیلید | ئیتالی |
| هۆش | چینی |

هەروەها شیعرێکی ژاپۆنی و شیعرێکی یۆنانی وەرگێڕاوە بەبێ ئەوەی ناوی شاعیرەکانی نوسیبێ.

دیارە زۆربەی ئەو شیعرانە شیعری ڕۆمانسین، چونکە شاعیر بۆ خۆی ئارەزووی لەوجۆرە شیعرانە بووە.

برایم ئەحمەد لەمەیدانی وەرگێڕاندا بەکەڵە پیاوی ئەدەبی کوردی دادەنرێت

بەلەبەرچاوگرتنی بارودۆخی تایبەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی ناوبراو.

چونکە ئەم نوسەرە کاری سیاسی گەورەو گرانی لەسەرشان بووە.

ڕابەرێکی سیاسی و سەرکردەیەکی شۆڕشی ڕزگاری بووە.ئینجا لەدەرفەتەکانیا توانیویەتی لە خوێندنەوەی ئەدەبی گەلان سوود وەربگرێت و ئەزمون پەیدابکاو لە خزمەتی ئەدەبی کوردیدا بەکاریان بهێنێ.

لەوماوە کەمانەی بوارو دەرفەتی بووە ، بیست وچوارکورتە چیرۆکی جیهانی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی ، کەزۆربەی ئەو چیرۆکانە لەگەڵ واقیعی کۆمەڵی کوردەواری دەگونجێن و لەگەڵ باری کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردەواریدا نزیکن. لەودەرفەتەدا دەربارەی کێشەو ململانێی پیاوە سیاسی و ئەدەبیەکانی جیهانی زیاتر لە پەنجا ووتاری وەرگێڕاوەتە سەرزمانی کوردی، بۆئەوەی خوێندەواری کورد بۆمەرامی دوارۆژی خۆی، شارەزای باری ئاڵۆزو ڕوداوی جیهانی بێتو لاوی کورد دەرس و پەندی لێوە وەربگرێت.

هەر لەودەرفەتانە دەراوو دەرەتانانەدا توانیویەتی بیست‌وپێنج شاکاری شعری شاعیرە بەرزو ناودارەکانی جیهانی وەرگێڕێتە سەرزمانی دەلالـو شیرینی کوردی. بەڵام لێرەدا هەست بە جیاوازییەك دەكرێ لەنێوان ئەو چیرۆك‌و ووتارانەی هەڵی بژاردوون بۆ وەرگێران لەگەڵ ئەو شیعرانەی وەری‌گێڕاون :-

لەچیرۆك‌و ووتارەکاندا پترکێشەو قەیرانی سیاسی‌و نیشتمانی‌و پێشکەوتن خوازی‌و فیداکاری‌و خۆبەخت کردنی پێوە دیارن‌و زەق بەر چاومان دەکەون.

هەروەها گەشبینی‌و ئامانجی ڕوون‌و حەتمیەتی سەرکەوتنی گەلانی مەبەست بووە.کەچی لەهەڵبژاردنی شاکاری شعری شاعیرەکاندا زۆر بە دوای ئەوەدا نەگەراوە، بەڵکو هەوڵی ئەوەی‌داوە شیعری شاعیرە هەرە ناودارو ناسراوەکانی جیهانی وەرگێڕێتە سەر زمانی کوردی.

شیعرەکانیش زیاتر لەناوەڕۆکدا دەربڕی باری کۆمەڵایەتی‌و سروشتی‌و جوانی‌و خۆشەویستی‌و دڵدارین‌و کەمتر لە سیاسەت دەدوێن، تەنیا چەند شیعرێکیان نەبێت وەك

(ئەدەبیاتی قولە ڕەش، کەهەرچارنەبێت بمرین، بەردەباز، هاوڕێ ینە، وێنەیەك لەژیان) دیارە وەرگێڕ لێرەدا وویستویەتی خوێندەواری کورد بەو شاعیرەبە هرەمەندانە ئاشنابکات، کە لەدونیای ئەدەبدا شاسواری مەیدان‌و خۆشەویستی ئەدیب‌و نووسەران بوون.

لەسەردەمی (گەلاوێژ)و لەماوەی ١٠ ساڵدا زیاتر لە ١٠٠ دەقی ئەدەبی لە شیعرو چیرۆك و وتاری لەزمانی ئینگلیزییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و بەم کارەی خزمەتێکی فرەو گەورەی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی کردووە.

# ڕۆژنامەگەری و زمانەوانی

لەبواری ڕۆژنامەگەریدا برایم ئەحمەد یاراو بەهرەو کەیف و مەیل و سەلیقەی باشی هەبووە. هەر لەسەرەتاوە، کە چووەتە زانستگا بەو نیازە چووە ببێتە خاوەن ڕۆژنامەو گۆڤارو لەو دەراو بوارەدا ئەسپی خۆی تاو بداو ناوبانگ دەربکاو ڕاژەو خزمەت بەنەتەوەکەی بکا.. بۆیە دەبینین لەماوەی ژیانیدا چەندین ڕۆژنامەو گۆڤاری بەزمانی کوردیی و عەرەبی دەرکردووەو لەوانە:

گۆڤاری (گەلاوێژ) لە ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٩ز.

ڕۆژنامەی (خەبات) لە ساڵی ١٩٥٩-١٩٦١ز.

ڕۆژنامەی (کوردستان) لە ساڵی ١٩٦١ز.

گۆڤاری (چریکەی کوردستان) لە ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٥ز.

گۆڤاری (صرخە کردستان) لە ساڵی ١٩٨١-١٩٨٦ز.

# (١٤)

# گۆڤاری گەلاوێژ

برایم ئەحمەد یەكێك بووە لەو سوارچاك و شۆڕەسوارە گوردو چاپوكانەی ئەدەبی كوردی، كە ڕۆڵێكی دیارو بەرچاوی هەبووە لە ڕۆژنامەگەری كوردیدا، بەدان پێنانی[١٥٦] خۆی، بۆیە چووەتە كۆلێجی یاسا بۆ خوێندن تاوەكو بتوانێ دوای تەواوكردنی كۆلێج ڕێگای پێ بدرێ ڕۆژنامە یان گۆڤارێكی مانگانە بەزمانی كوردی دەربكات..

وەك ئاشكرایە لەو سەردەمانەدا هەركەسێك پارێزەر نەبووایە، مافی ئەوەی نەبوو ڕۆژنامە یان گۆڤار دەربكات. جا ئەمیش چونكە تامەزرۆو شەیدای ئەو ئاوات و ئامانجە بووە، چۆتە كۆلێجی یاسا. لە ساڵی ١٩٣٧ز كە لەكۆلێجی ماف دەرچووەو بووەتە پارێزەر لە سلێمانی هەوڵی ئەوەی داوە ڕێگای پێ بدرێت ئەو ئەركە بەجێ بهێنێت. بۆ ئەو ویست و مەبەستە زۆر ئەركی كێشاوەو لەو پێناوەدا زۆر كەس هاریكاری كردووە، لەوانە: (محەمەد باشقە) كە كوردێكی فەیلی بووەو كاربەدەست بووە لە وەزارەتی ناوخۆ، كەچی گەلێك كەسیش لە كاربەدەستانی میری هەوڵیان داوە كۆسپ و تەگەرە بهێننە ڕێگای. عەبدولڕەزاق بیمار لە كتێبی (پەخشانی كوردی)دا[١٥٧] دەڵێت:

---

[١٥٦] فاكسی تایبەتی بۆ نووسەری ئەو كتێبە ناردووە لەو بارەیەوە لە ١٩٩٩/١١/٢٥

[١٥٧] پەخشانی كوردی- عەبدولڕەزاق بیمار، دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوكردنەوە، ژ ٣١٤،ل٨٢،٨٣.

((بەهۆی هەڵگیرسانی شەڕی دووەمی جیهانییەوە ماوە ی سەرهەڵدانی چاکتر بۆ ڕۆژنامەنووسی کوردی هەڵکەوت و ڕوناکبیرو نیشتمان پەروەرانی کورد لەو مەیدانەدا چالاکی باشیان نواندو نموونەی هەرە گەشی ڕۆژنامەنووسی پاش شەڕەکە گۆڤاری (گەلاوێژ)ە کە لەساڵی ١٩٣٩-١٩٤٩ ژیاوەو (١١٦) ژمارەی لێ دەرچووە، جگە لە کۆششی ئەم گۆڤارە لەبواری ئەدەبیات و ڕۆشنبیریدا نوێنەرێکی دانای بزووتنەوەی کوردییش بووە)).

لە ئەنجامدا لە کانوونی یەکەمی ١٩٣٩ بەهاوکاری چەند ڕۆشنبیرو شاعیرێک و بەتایبەتی گۆران داوای ڕێگەپێدانی کرد بۆ دەرکردنی گۆڤارێك بەناوی (گەلاوێژ)ەوە، ئەوەبوو ڕێگای پێدرا.

دوای هەوڵێکی زۆر توانی ژمارە یەکی گۆڤاری (گەلاوێژ) دەربکات و بڵاوی بکاتەوە.

لەو ژمارەیەدا کەبە پێنووسی خۆی (بلە) نووسراوە، ئامانجی گۆڤارەکەی لە دوو خاڵی سەرەکیدا دیاری کردووە:

١- مەبەست لەدەرچوونی گۆڤاری گەلاوێژ پێشکەوتنی زمانی کوردییە.

٢- ئاواتی گۆڤارەکە پێشکەوتنی ئەدەبی کوردی و ژیانەوەی کەلەپوورو فۆلکلۆری ئەدەبی کوردییە[158].

(158) گۆڤاری گەلاوێژ ژ١، ل١، ساڵی ١٩٣٩.

جا گۆڤارێك ئەو ئامانجە پیرۆزانە ئاوات و بەرنامەی كاری ڕۆژانەی بێت، كە هەر ئەوانەش ئامانجی سەرپاكی مرۆڤێكی نیشتمانپەروەرو نەتەوە پەرست و ئینسان دۆستان بن، دیارە بەرو بەرهەمێكی بە بەرەكەتی دەبێ.

لاوێكی كورد لە بنەماڵەیەكی هەژار لەتەمەنی بیست و چوار ساڵیدا دەست بداتە ئەو پرۆژە گەورەو خزمەتگوزارییە بەتایبەت لەكات و سات و سەردەمێكدا كە دنیا تووشی ئاڵۆزیو شەڕو شیوەنێكی زۆر هاتبوو، دیارە كارێكی بەرزو پیرۆزە.

لەو سەردەمەدا لاوان و خوێندكارو قوتابیان و ڕۆشنبیرانی كورد دەستیان كردبوو بە جموجۆڵی سیاسی و چاپكردن و بلاوكردنەوەی كتێب و نا میلكە بەزمانی كوردی. لە ۱۹۳۰/۵/۳۰ لەلایەن دەستەیەك لەكوردە ڕۆشنبیرەكانی بەغداوە (یانەی سەركەوتنی كوردی) دامەزرا.[۱۵۹]

دوای هەڵبژاردن ئەركی یانەكەیان گرتە ئەستۆ، لەوانە (ئیبراهیم حەیدەری، ئەمین زەكی بەگ، مەحموود جەودەت، عەبدوڵا لوتفی، ئەحمەد ئاغای كەركوكی و پارێزەر عارف پشدەری).[۱۶۰] [۱۶۱] [۱۶۲]

هەر لەو سەردەمەدا دامەزراندنی ئەحزابی سیاسی كوردی وەك (پێشكەوتن)و دواتر حزبی (هیوا) كە بنكە سەرەكیەكەی لە هەولێر بوو.[۱۶۳]

هەروەها بارودۆخی سیاسی عێراق بەگشتی و سەرهەڵدانی بیروباوەڕی سۆشیالیستی لە عێراقدا لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی دووەمی جیهانیدا..

---

[۱۵۹] گۆڤاری ڕەنگین، ژ۹، تەمووزی ۱۹۸۸، ل٦، چاوپێكەوتن لەگەڵ قادر قەزاز.

[۱۶۰] ڕۆژنامەی ژیان،ژ۲٤۱، ۲۹/مایس/۱۹۳۰، ل۲.

[۱۶۱] ڕۆژنامەی ژیان،ژ۲٤۳، ٥/حوزەیران/۱۹۳۰، ل۱.

[۱۶۲] غەفووری میرزا كەریم (یادگاری لاوان و دیاری لاوان)، چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد- بەغدا- ۱۹۷۸، ل۱۰.

[۱۶۳] جعفر عباس حمیدی (التطورات السیاسیة في العراق)- رسالة ماجستیر من جامعة بغداد، ۱۹۷٦.

هەموو ئەمانە كاریان كردبووە سەر لاوان و ڕۆشنبیران بۆ خۆڕێكخستن و كۆڕو كۆبوونەوە بەستن لەگەڵ یەكتردا.

ئینجا دەرچوونی ڕۆژنامەی (ژیان) لەسلێمانی لەلایەن پیرەمێردەوە..

ئەو فاكتەرانە بەگشتی هاندەرێكی باش بوون بۆ برایم ئەحمەدو هاوكارەكانی بۆ دەرهێنانی گۆڤاری گەلاوێژ بەهەر نرخێك بێت.

هەرچەندە ناوبراو باری ماڵی زۆر خراپ بوو، پارەو پولی نەبوو، ژمارەكانی سەرەتای بەقەرزو قۆڵەو یارمەتی چەند دەوڵەمەندێكی كورد لەبەغدا دەركرد.

لە ژمارە یەكی گۆڤاری گەلاوێژدا، لەسەروتارەكەیدا بەپێنووسی برایم ئەحمەد نووسراوە: ((هیچ گومان نابەم كە هەمووتان وەكو من سەرشۆڕ ئەكەن، وەشەرمەزار ئەبن كە بەڕێكەوت یا بە پرسیاری بێگانەیەك دێتەوە بیرتان كە لەسەردەمی ڕوناكی و خوێندن و زانیندا، لەم پلە بەرزەدا كە شارستانیەتی گەیشتۆتیٚ لە ڕووی زەمیندا گۆڤارێكی كوردی نییە)).[١٦٤]

هەروەها لەو ژمارەیەدا دەنووسێت: (نەكەس لەپڕیٚ ئەبیٚ بەكوڕیٚ و نە ئێمەش بەگەورەیی و پۆشتەیی و خوێندەواری لەدایك بووین، هەموو شتیٚ لەسەرەتادا كەم و زۆر ناتەواوی و كەم و كورتی تیا ئەبیٚ، بۆیە نابیٚ كتوپڕ لە گەلاوێژ زویر بن و فڕێی دەنە لاوە).

دیارە بۆ دەركردنی گۆڤاری گەلاوێژ برایم ئەحمەد پەیوەندی بە ڕۆشنبیرو شاعیرو نووسەرانی كوردەوە كردووە، كە هاوكاری بكەن، لەوانە:

محەمەد ئەمین زەكی بەگ، تۆفیق وەهبی، بابا عەلی، عەلی كەمال، ڕەشید نەجیب، حامید فەرەج و عەبدوڵا گۆرانی شاعیر..

---

[١٦٤] سەروتاری ژمارە١، گۆڤاری گەلاوێژ، ك٢ ی ١٩٣٩، ل١.

ئەوانیش بەڵێنیان داوە هاوکاری بکەن و بەرهەمە ڕەنگینەکانیان بۆ گۆڤارەکە بنێرن.

کەواتە لەسەروتاری یەکەم ژمارەی گۆڤارەکەوە، ئامانج و ڕێڕەوی خۆی دیاری و دەستنیشان کردووە. لەلایەن بەرپرسیارو سەرپەرشتی گۆڤارەکەوە، بەرنامەی خۆی دارشتووە، ئەویش خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیریی و فۆلکلۆری کوردی و بەرزکردنەوەی ئاستی نەتەوایەتی و بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە بووە.

لەگەڵ دەرچوونی یەکەم ژمارەی گۆڤارەکە، شەڕی دووەمی جیهانی بەرپا بوو. لە (٥)ی ئەیلولی ١٩٣٩ز عێراق پەیوەندی دیپلۆماسی خۆی لەگەڵ ئەڵمانیا پچڕاند، دوای ئەوە (ئیعلانی ئەحکامی عورفی کرد) و گەلی عێراق تووشی نەهامەتی و نەبوونی و هەژاری و نەداری هات.

عێراق کە لایەنگری هاوپەیمانان (الحلفاء) بوو، خۆی کرد بەلایەنگر لەو شەڕە ماڵ وێرانکەرەدا.

لەلایەکی ترەوە ژیان و گوزەرانی خەڵك تا دەهات زیاتر بەرەو خراپی و قات و قڕی دەچوو.

باری سیاسی وڵات ئاڵۆزی تێکەوت، کاربەدەستانی دەوڵەتی عێراق بەبڕوبیانووی شەڕەوە هەموو ئازادییەکیان لەخەڵك قەدەغە کرد.

لە ڕۆژانی شەڕدا بانگەوازی ناڕەزایی لەدژی فاشیزم لەلایەن لایەنگرانی هێزە ئازادیخوازو دیموکراتخوازەکان لە هەموو کون و قوژبنێکی عێراقەوە بەرز بووە.

خەڵکی عێراق چاویان کرایەوەو ئاستی سیاسییان بەرز بووەو هەستی نەتەوایەتی گەشەی کردو بیرو باوەڕی سیاسی پێشکەتنخواز زیاتر دزەی کردو چووە ناو ڕیزەکانی میللەتەوە.

گۆڤاری گەلاوێژ لەو مەیدانەدا ڕۆڵی گرنگی گێڕا، دەنگ و باسی شەڕو ئامانجی کۆمەڵانی خەڵك لە ئازادیی و دیموکراتیی و خۆشگوزەرانی زیاتر بەرەو پێشەوە تەکانی دا. ڕیسواکردنی بەرەی فاشیزم و سەرکەوتنی بەرەی گەل و دیموکراتی پتر لەناو کۆمەڵانی خەڵکدا جێگای خۆی کردەوە. دڕی بەتاریکی شەوەزەنگی فاشیزم داو جێگای پێ چۆڵ کرد..

گۆڤاری گەلاوێژ توانی خۆی بکا بەزمانحاڵی خەڵکی کوردستان لە دەربڕینی هەست و هۆشی ئەوان و خستنە ڕووی داخوازییە ڕەواکانی خەڵکی کوردستان.

لەمانگی مایسی ١٩٤١ز دا لە گەرمەی شەڕی جیهانیدا، بزوتنەوەی شۆڕشگێڕی لەعێراقدا گڕو کڵپەی سەند دژ بە ئینگلیزەکان.[١٦٥]

ئەم بزوتنەوە شۆڕشگێڕییە لەدژی داگیرکەری بەریتانی لە هەل و مەرجێکی زۆر ئاڵۆزو نالەباردا بەرپا بوو، حکومەتی بەریتانی عوزما ئەم بزوتنەوەیەی قۆستەوە، لە ٢ی مایسی هەمان ساڵدا سوپای ئینگلیز پەلاماری سوپای عێراقی داو شەڕ لەنێوان هەردوو لادا هەڵگیرسا، میللەتی عێراق لەهەموو لایەکەوە پشتگیری لەسوپاکەی خۆی کرد بەسەرۆکایەتی ڕەشید عالی گەیلانی لەدژی داگیرکەری ئینگلیز. کۆمەڵانی خەڵك لە کوردستانی خۆمان بەپیاوانی ئایینی و خوێندکارو لاوان و ژن و چینەجیاجیاکانەوە پشتگیری و پشتیوانی خۆیان دەربڕی بۆ بەرگری لە سوپای عێراق لەدژی داگیرکەری ئینگلیز.[١٦٦]

---

(١٦٥) السيد عبدالرزاق الحسيني، الاسرار الخفية في حوادث سنة ١٩٤١م التحررية، مطبعة العرفان، صيدا، ١٩٨٥م، ص١٢٣.

(١٦٦) دکتۆر کەمال مەزهەر ئەحمەد، لاپەڕەیەکی ون لەمێژووی خەباتی شێخ مەحمود دەربارەی هەڵوێستی کورد بەرامبەر ڕاپەڕینی ١٩٤١ز، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٢١، ئازاری ١٩٨٩ز، ل١٦٢.

بەڵام ڕاپەڕینەکە لەبەر چەندین هۆی جیاجیا نەیتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنێ..

گۆڤاری گەلاوێژ تروسکەی ڕۆشنبیری خۆی لێکرابوو بە پوختەی هەڵبژاردەی ڕاو بۆچوونی شارەزا و پسپۆڕانی بێگانە سەبارەت بەچاکەو خراپەی شەڕ بەنسبەت کوردەوە لەسەر لاپەڕەکانیدا..

بۆ ئەوەی خوێندەواری کورد ئاگاداری بیروبۆچوونی زانایانی ئەو سەردەمە بن لەبارەی شەڕی دووەمی جیهانییەوە.[١٦٧]

گەلاوێژ هەوڵی زۆرداوە خوێندەواری کورد هانبدا بۆ ئەوەی ڕێگای ئازادیو سەربەستی خاكو نیشتمان بگرنەبەر.. هەر لەبارەی سەربەستییەوە:

((ئەی سەربەستی دەوەرە ڕزگارمان کە..!! لە ئەزەلەوە تا ئێستا هەر لەشەوداین، نازانین کەی ڕۆژ ئەبێتەوە..تاد))

هەر لەوەسفی سەربەستیدا ئەم شیعرەی دڵزاری بڵاوکردووەتەوە:

*لەناو باغی ژیان هەردەم گوڵێکی سوورە سەربەستی*

*لەناو گشت کۆمەڵی عالەم بڵێسەی دوورە سەربەستی*

*لەئاسمانی سەعادەتدا لەشەوق و ڕەنگ و پرشنگا*

*گەلاوێژی پڕ ئاوازی شەوی دەیجوورە سەربەستی*

دیارە ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان هەردەم ڕۆڵی سەرەکییان بینیوە لەڕێگای ڕۆشنکردنەوەی ڕێپیشاندانی میللەتەکەماندا، لەڕۆژانی

---

[١٦٧] گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧-٨، تەمموزو ئابی ١٩٤٢، ل٣٦

وەیشوومەو کارەساتەکانداو پێنووسی ڕوناکبیرو چاونەترسەکانی هەردەم لەبرەودا بووە بۆ خۆڕاگری و چاونەترسی کۆمەڵانی خەڵك بەرامبەر مەرگەسات و ئاشووبەدا. گۆڤاری گەلاوێژ بەڕاستی ڕابەرو مامۆستایەکی شارەزاو هوشیارو کارامە بوو لەمەیدانی ڕێنەوینی جەماوەردا بەرەو ئاسۆی ڕزگاری و سەربەستی و بنبڕکردنی هەژاری و نەخۆشی و نەخوێندەواری و چارەسەری دەردەکوشندەکانی کۆمەڵایەتی.

نووسەرو شاعیرە شۆڕشگێڕو چاونەترسەکانمان لەسەر لاپەڕەکانی گەلاوێژدا، بازووی ئازایەتی و چاونەترسیان لێ هەڵکردبوو بە شیعرە ئاگرینەکانیان، بەنووسینە بەهێزو بەپێزەکانیان، بەهاندانە سیاسییەکان، بۆ ئەوەی گۆڤاری گەلاوێژ وەکو ئەستێرەی گەلاوێژ لە ئاسمانی کوردەواریدا بدرەوشێتەوە.

ئەو ئەرکە پیرۆزەی گەلاوێژ لە مەیدانی ئەدەب و ڕۆشنبیریداو شەن و کەو کردن و هەڵسەنگاندن و بژارکردنی زمانەکەمان و توێژینەوەو ڕۆچوون، چ لە زمانداو، چ لەو چەند لا پەڕەیەی بۆ دیوانی گەلاوێژ تەرخان کرابوو.

شیعرە نایابەکانی شاعیرە کۆن و تازەکانی سەردەمی خۆی تیا بڵاودەکرانەوە، وەك شیعرەکانی مەلای جەزیری و ئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆیی و سەیدایی هەورامی و مەولەوی و بێسارانی و نالی و کوردی و سالم و گۆران و سەلام و دڵزارو بێکەس و شوکری فەزلی و..تاد.

هەروەها گۆشەکانی (لەهەر باخێك گوڵێك) و (قسەی نەستەق) و وتارەکانی زمانەوانی و مێژوویی و فیکری و ڕەخنەئامێز.. تاد..

ئەو گۆشانەی گەلاوێژو ئەو بابەتانەی تیا بڵاودەکرانەوە لەگەڵ ئەو بارودۆخ و ڕووداوانەی لەدنیای سیاسەت و جەنگ و ململانێی دژە یەکەکاندا ڕوویدا، لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی و تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابووری کە ڕوویاندا لە د ونیادا، لەگەڵ ئەو هەستە نەتەوایەتی و نیشتمانییەی لە کوردستاندا گەشەی کرد بەهۆی ئەو ڕووداوانەی سەرەوە کەباس کران، هەموو ئەمانە وەکو ئەڵقەیەکی گرێدراوو زنجیرێکی بەیەکەوە بەستراو، بوو بوون بەهەوێنی جۆشدان و درەوشانەوەو سەوزبوونی چەکەرەی بڕواو هەستی بوون و سەربەستی.

ئاشکرایە کۆمەڵگا هەڵگری هەگبەی ئاڵوگۆڕی هەڵچوون و داچوونە بەپێی گروپەکانی ناو ئەو پێکهاتەیە، کۆمەڵی کوردەواریش لەو لۆژیکە بەدەر نییە. لە کوردستاندا ڕۆژ بەڕۆژ زیاتر خەڵکی ڕۆشنبیرو نووسەر لەدەوری گەلاوێژ کۆدەبوونەوەو زیاتر دەوڵەمەندیان دەکرد. بە فیکرو بیروباوەڕی خۆیان تا گەیشتنە ئەو ڕادەیەی حکومەتی داگیرکەری بەغدا خاوەن ئیمتیازی گۆڤاری گەلاوێژ بگرێت و حوکمی زیندانی دوو ساڵی بەسەردا بسەپێنێ بەبیانووی کۆمۆنیستی و گۆڤاری گەلاوێژیش دابخات.

# سەردەمی سەرهەڵدانی گۆڤاری گەلاوێژ

((لە ساڵی ١٩٣٩ هەروەك ساڵی لەدایك بوونی گۆڤاری گەلاوێژ بوو، هەروەها ساڵی پڕ ڕووداوو کارەساتی گەورەو گران بوو لەسەر ئاستی کوردستان و عێراق و دونیا، ئەم ڕووداوانە کاریگەریان هەبوو لەسەر ڕێڕەوی کاروانی گۆڤارەکە لەڕۆژانی دواییدا، بەڵگەش بابەتەکانی ناوەڕۆکی گۆڤارەکەن. هەر لەو ساڵەدا حیزبی هیوا لەکوردستانی عێراق دامەزرا)).
(١٦٨)

دواتر گەشەی کردو پەلی هاویشت بۆ هەموو شارەکانی کوردستان تا ساڵی ١٩٤٤ لە خەباتدا بەردەوام بوو. شەڕی دووەمی جیهانی هەر لەو ساڵەدا بەرپا بوو. هەزاران شارو دێهات کاول بوو، دەیان کێڵگەو کارگەو ڤابریقە خاپوور کران، بەهرەو توانای هەزاران لاو بەفیڕۆ چوو، ئەو شەڕە زیاتر لە شەش ساڵی خایاندو لەبەر ئەوەی عێراق پاشکۆی ئیمپریالیزمی ئینگلیز بوو، کە ئینگلیز وەك دەوڵەتێکی شەڕکەر چووە مەیدانی شەڕەوە لە ئەیلوولی ١٩٣٩دا لەدژی ئەڵمانیا ڕاوەستا، حکومەتی عێراق پەیوەندی سیاسی لەگەڵ ئەڵمانیا بڕی و پشتگیری و ئامادەبوونی بۆ ئینگلیز ئاشکرا کرد. ڕۆژانی شەڕ مایەی نیگەرانی و بێزاری و ناخۆشی بوون بۆ گەلی عێراق، چونکە سەربەستی و دیموکراتی قەدەغە کران و حوکمی عورفی دانرا.

---

(١٦٨) بڕوانە: جعفر عباس حميدي- التطورات السياسية في العراق، ١٩٤١-١٩٥٢، رسالة ماجستير في جامعة بغداد، مطبعة نعمان- النجف الاشرف ١٩٧٦، ص٢١٨-٢١٩.

گرانی و نەهامەتی دەستی پێکرد، هەموو شتێك بوو بە بیتاقە، قاتی و قڕی باڵی بەسەر وڵاتدا گرت.

لەو سەردەمی شەڕەدا ناڕەزایی لەدژی فاشیزم و بانگەوازی دیموکراسی هەستی خەڵکیان بزواند. گۆڤاری گەلاوێژ توانی سوود لەو ڕووداوانە وەربگرێ، بەسەرهات و کێشەکانی ڕۆژانە بگەیەنێتە خەڵك، دەواری کورد و خەڵك بەئاگا بێنێ و هوشیاریان بکاتەوەو ناڕاستەوخۆ ئامۆژگاریان بکات بەبیروباوەڕی نەتەوایەتی و دیموکراسی و شۆڕشگێڕی و پێشکەوتنخوازی و دەنگ‌وباسی چین و ژاپۆن و سۆڤیەت و هیندستان و ئینگلیستان و ئەمەریکا، ململانێ و ناکۆکییەکان، بیروباوەڕە دژ بەیەکەکانی هەمووی وەك بێلایەنێك بڵاوی دەکردەوە، چونکە گۆڤارێکی سیاسی نەبوو.

ڕاستەوخۆ بێ لایەنی پیشان دەدا.[١٦٩] بەڵام لەڕاستیدا ئەو نووسینانە کاریگەری یەکجار زۆریان هەبوو لەسەر بیرو هەستی ڕۆشنبیری کورد و بوون بەلایەنگری بەرەی سۆشیالیستی و ئازادی گەلان و بەتەواوی گەلی کوردیان وریا کردەوە[١٧٠].

گەلی عێراق و سوپای عێراق لە ئینگلیز زۆر بەداخ بوون چونکە ئیمپراتۆریەتی ئینگلیزیان بەهۆی نەهامەتی و کوێرەوەری و بەدبەختی خۆیان دەزانی و لە دەرفەتێك دەگەڕان عێراق لەژێر ڕکێفی ئینگلیز دەربهێنن.

شەڕی دووەمی جیهانی و کارەسات و مەرگەساتەکانی ئەو شەڕە نەگریسە بووە هۆی هەوێنی شیعری نوێی کوردی و پەخشان و وتاری خۆماڵی و وەرگێڕان..

لە ژمارەکانی گەلاوێژدا بڵاودەکرانەوە، بۆ نموونە شیعرە بەناوبانگەکەی گۆرانی لوتکە کەدەڵێت:

---

[١٦٩] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ٢، ساڵی ١، ك١ ١٩٤٠، ل٦٠.

[١٧٠] گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە ١، ساڵی ١، ك١ ١٩٣٩، ل٤٩.

*دیاری خوای شەڕ ڕەنجەو ئازار*
*مەرگی لەشکر وێرانی شار*
*بۆ دایك تـاقـانە کوشتن*
*بۆ کۆرپەی ناز هەتیو خستن* [(١٧١)]

ئەم شیعرە سەرەتای بەرەو ڕیالیزم چوونی گۆرانە.

هەر لەنووسین و بابەتەکانی گەلاوێژدا باسی سەربەستی و دیموکراسی زۆری لەسەر نووسراوە بەراوردی ئەو بیروباوەڕانە کراوە کە لەشەڕەکەدا بەشدار بوون و لەگەڵ ژیانی سەرکردەکانیاندا.[(١٧٢)]

هەر لەباسی سەربەستی و ئازادیدا، گۆڤاری گەلاوێژ لەباسی سەربەستیدا دەیان شیعرو وتاری بڵاوکردووەتەوە، لەڕۆژانی شەڕو ئاشووبەدا، لەو کات و زەمانانەدا دەوری پێشڕەوانەی بینیوەو بووەتە چاوساغی میللەتەکەمان.

بیرو هەستی ڕوناکبیرانی خرۆشاندووە بۆ ئەوەی دەرمانی دەردی دواکەوتوویی کۆمەڵی کوردەواری بدۆزنەوە، بۆیە دەپرسێ:

((ئەگەر قەومێك شڵەژاو ئاوارەو پەرت و بڵاو بووە، چی ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئەو قەومە لەژێر ئەو بارە گرانەدا ڕزگاریان بێت؟))[(١٧٣)].

((شەڕی جیهانی لە مایسی ١٩٤٥ بەشکاندنی ئەڵمانیای نازی و سەرکەوتنی بەرەی دژ بە فاشیزم کۆتایی هات، شکاندنەوەی شەڕ بەم بارەدا گۆڕانێکی تازەی خستە جیهانەوە. زۆر لەوڵاتانی ڕۆژهەڵات وەك ئەندەنوسیاو هندستان سەربەخۆییان بەدەست هێنا، سەرکەوتنی شۆڕشی

---

[(١٧١)] دیاری خوای شەڕ، گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٧-٨، ساڵی ٣، تەمووزو ئابی ١٩٤٢، ل٤٨.

[(١٧٢)] ئەو باوەڕانەی لەشەڕدان، گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە ٧-٨، ساڵی ٢، تەمووزو ئابی ١٩٤١،ل٦٤.

[(١٧٣)] گۆڤاری گەلاوێژ لەگەشەسەندن و پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا، نامەی ماجستێر (محمد دلێر محمد ئەمین)، ئابی ١٩٨٩، ل٢٤.

چین و درووستبوونی کۆمەڵگای سۆشیالستی جیهانی بوونە پاڵپشتی بزووتنەوەی دیموکراسی لە عێراقدا.))[١٧٤]

((دوای شەڕ کاربەدەستان ناچار بوون مل بۆ داخوازییە دیموکراتییەکانی گەل کەچ بکەن و لەهەموو لایەکەوە دەنگی ئازادی بەرز بووەو نەتەوەکان چاوەڕوانی ڕۆژی ئازادی بوون)).

گۆڤاری دەنگی (گێتی تازە) کە باڵیۆزخانەی بەریتانی لەبەغدا دەری دەکرد لەژمارەیەکی دوای شەڕدا نووسیبوی:

((جەنگ بڕایەوە، حکومەتی سەرکێشی خوێن خوار کەوت و مرد، چەرخی ستەمکار وەرگەڕاوە، جارێکی تر ناسوڕێتەوە، کاتی ئەمە هات کە هەموو نەتەوەیەك بەئازادی بژین... ))[١٧٥]

ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکانیش هەرچەندە بەژمارە کەم و بەڕوخسار ئەدەبی بوون، لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی دیاری خۆیان لەو قۆناغە مێژووییەدا گرتبوو...

حسێن عارف سەبارەت بە دەوری گەلاوێژ لەو ڕۆژانەدا دەڵێت:

((شان بەشانی بزووتنەوەی نیشتمانی و بەلام ئەم بە وشەی پاك و شەرەفمەند دەجەنگاو لەڕێگەی شیعرو چیرۆك و وتاری ڕەخنەگری و لێکۆڵینەوەو نووسینی کۆمەڵایەتی و زانستییەوە چاوی خەڵکی کردەوە...))[١٧٦]

[١٧٤] د. عزەدین مستەفا ڕەسوڵ، الواقعیة في الأدب الكردي، دار المكتبة العصرية.

[١٧٥] د. کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لەمێژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، ل٢٠٤.

[١٧٦] حسێن عارف، چیرۆکی هونەری کوردی، ١٩٢٥-١٩٦٠، دار الحریة للطباعة، بغداد، ١٩٧٧، ل٥٦.

# هەڵسەنگاندنی گەلاوێژ لەلایەن نووسەرانی کوردو بێگانەوە

بۆ هەڵسەنگاندنی گۆڤاری گەلاوێژ، سوودمان لەنامەی (ماجستێری محەمەد دلێر محەمەد ئەمین) وەرگرتووە.[177] بەسەرچاوەیەکی باوەڕپێکراومان زانیوە.

١- بەپێی سەرنجی نووسەرانی بێگانە (سی. جی. ئە. ئەدمۆنس) کە ژمارەکانی بەرایی گەلاوێژی هەڵسەنگاندووە، گۆڤارەکە دوو عەیبی گەورەی هەبووە، یەکەمیان: نەبوونی لیستی ناوی بابەتەکانە لە لاپەڕەی ناوەوەی گۆڤارەکەدا. دووەمیان: ئاشکرا نەکردنی ناوی زۆر لەو نووسەرو شاعیرانەی کە بەرهەمیان تێدا بڵاوکردووەتەوە.

((گەلاوێژ ئەستێرەی هەرە گەشی ئاسمانە، میسرییە کۆنەکان بڕوایان وابوو کە مزگێنی دەری خێرو بەرەکەتە.. سروشتی ئەم سێ ژمارەیەی نوخشەیە، هیوای ئەوە ئەدا بەپیاو لە گۆڤاری گەلاوێژ ناوەکەی خۆی پێ بشێ)).[178]

٢- پیرەمێرد لەساڵی پێنجەمی گۆڤارەکەوە تاوەکو ساڵی نۆیەمی هەموو ساڵێك بە شیعرو پەخشان ستایشی گەلاوێژی کردووە.[179]

---

[177] ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ لەگەشە سەندنو پێشخستنی ئەدەبی کوردیدا، نامەی ماجستێر ماموستا (محەمەد دلێر محەمەد ئەمین)، ئابی ١٩٨٩، ل٢-٢٠.

[178] گەلاوێژ بەچاوی بێگانە، گەلاوێژ، ژمارە ٨ی ساڵی١، تەمووزی ١٩٤٠، ل(١-٤).

[179] ژمارەی گەلاوێژ لەو ساڵانەدا.

٣- (م. لۆرانس) وتارێك لەبارەی مێژووی گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردیەوە، باسی گەلاوێژ بەم شێوەیە دەکات:

((لە ساڵی ١٩٣٩ چەند گەنجێکی کورد لەبەغدا بەناوی گەلاوێژەوە گۆڤارێکیان دەرکرد کە ئێستا لەبەرزترین گۆڤارە ئەدەبییەکانی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەژمێردرێ))[١٨٠]

٤- عەلادین سەجادی وەك بەڕێوەبەرو بەخێوکەری گەلاوێژ دەنووسێت:

((پێی وایە لەهەموو گۆڤارو ڕۆژنامەکانی ئەو ڕۆژانەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بەگەورەتری بزانێ))[١٨١]

وە هەر عەلادین سەجادی لەچاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەییدا بەزمانی عەرەبی:

((پێی وایە ئەگەر جارێکی تر ژمارەکانی گەلاوێژ لەچاپ بدرێنەوە، کەڵك و سوودی خۆیان دەگەیەنن بەنەوەی نوێ))[١٨٢]

٥- لەگۆڤاری (شەفەق)دا کەبەزمانی کوردیو عەرەبی لەشاری کەرکوك دەردەچوو وتارێك بەزمانی عەرەبی نووسراوە بەناوی (پێشڕەوایەتی ئەدەبی نوێی کوردی)یەوە لەوێدا ڕۆڵی ئەدەبی گۆڤاری گەلاوێژ لەشەش خاڵی چڕوپڕدا باسکراوە زۆر بەکورتی ئەو بابەتە

---

[١٨٠] ★ ڕۆژنامەی ژین، ژمارە ٧٧٨، لە ١٥ ئازاری ١٩٤٥، ل٣.

★★ گۆڤاری گەلاوێژ، ژمارە ٤، ساڵی ٦، نیسانی ١٩٤٥،ل٢٤.\

[١٨١] بڕوانە گۆڤاری نزار، ژ٦، ساڵی١، لە ١٥ی حوزەیرانی ١٩٤٨، ل٢٢.

[١٨٢] جريدة التآخي، في لقاء مع السجادي، العدد ١٤٤٩، تشرين الأول ١٩١، ص١-٧.

ئەدەبی و ڕۆشنبیریانە ژمێراون کەگۆڤارەکە پەلی بۆ هاویشتوون لەوانە، زمان، وەرگێڕان، وتار، کورتە چیرۆك، شیعری کۆن و نوێ[١٨٣].

٦- گۆڤاری (ڕۆژی نوێ) کەلەڕیزی گۆڤارە دەوڵەمەندەکانی کورد دانراوە لەووتارێکدا بەناوی (گەلاوێژ)ەوە ستایشی دەوری گۆڤاری گەلاوێژ دەکات و بەسەرچاوەی مێژوو ئەدەبی کوردی دادەنێ...[١٨٤] (عبدالجبار محمد جباری) یەکێکە لەو نوسەرانەی بایەخیان بەباس و ڕۆژنامەنووسی کوردی داوەو لەو مەیدانەدا دوو بەرهەمی بەچاپ گەیاندووە تیایاندا (گۆڤاری گەلاوێژ)ی بەبەرزترین گۆڤاری زانیاری و کۆمەلایەتی و ئەدەبی کوردی لەقەڵەم داوە[١٨٥].

بڕوانە عبدالجبار محمد جباری - مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی چاپخانەی ژین لەسلێمانی.

٧- پرۆفیسۆر عیزالدین مستەفا ڕەسوڵ (گۆڤاری گەلاوێژ)ی بەدیارترین گۆڤاری ئەدەبی کوردی دادەنێ، چونکە توانیویەتی بەرەیەکی فراوان لەنووسەرانی کورد وێڕای جیاوازی بیروباوەڕیش لەلاپەڕەکانیدا کۆبکاتەوە[١٨٦].

٨- نەوشیروان مستەفا ئەمین لەبارەی گۆڤاری گەلاوێژەوە دەڵێت:

---

[١٨٣] بڕوانە حەمەدۆك (طلائع النهضة الحديثة في الأدب الكوردي مجلة الشفق العدد ٨ آب ١٩٥٨ م، ص ١٧.

[١٨٤] بڕوانە گۆڤاری ڕۆژی نوێ سلێمانی ژمارە ٥ ئابی ١٩٦٠ز ل١٣.

[١٨٥] بڕوانە عبدالجبار محمد جباری- مێژووی ڕۆژنامەگەری کوردی، سلێمانی.

[١٨٦] د. عزالدين مصطفى رسول - حول الصحافى الكردية مطبعة دار الجاحظ بغداد ١٩٧٣ ص ١١.

(گەلاوێژ قوتابخانەیەکی تایبەت بەخۆی لەڕۆژنامەوانی کوردیدا دامەزراند کەهەتا ئێستاش کاریگەری ماوە[187].

٩- عومەر مەعروف بەرزنجی لەبارەی گۆڤاری گەلاوێژەوە دەنووسێت: ((گەلاوێژ گۆڤارێکی مانگانەی کوردیە بایەخێکی زۆر بەزمان و ئەدەب و سامانی نەتەوایەتی داوە، چیرۆکی وەرگێڕاویان لەسەرچاوەی عەرەبی و ئینگلیزییەوە بڵاودەکردەوە، ڕۆشنبیرەکانی بریتیبوون لە.

(بلە، عوسمان مستەفا، عومەر ساڵح خەفاف، حامید فەرەج، محمد توفیق عزیز، فایەق هوشیار، یوسف ئەمین، جەمال خفاف... [188]).

١٠- د.کمال مەزهەر ئەحمەد لەوەسفی گەلاوێژدا دەڵێت:

(یەکێکە لەگۆڤارە بەرزەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی سەردەمی خۆی[189])

١١- (عبدالرزاق بیمار)یش دەڵێت:

(... جگە لەکۆشش ئەم گۆڤارە لەبواری ئەدەبیات و ڕۆشنبیریدا نوێنەرێکی دانای بزوتنەوەی کوردیش بووە[190].

---

(١٨٧) نەوشیروان مستەفا ئەمین ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ - ژمارە ٢١٥٠ لە ٢٠/٥/٢٠٠٠ ل٩.

(١٨٨) لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥ –١٩٦٩ز عومەر مەعروف بەرزنجی چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد بەغدا ١٩٧٨ ل ٤٣.

(١٨٩) د. کەمال مەزهەر -تێگەیشتنی ڕاستیو شوێنی لەڕۆژنامەنووسی کوردیدا ل ٢٣٦.

(١٩٠) پەخشانی کوردی عبدالرزاق بیمار دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوە زنجیرە ژمارە ٣١٤ ل ٨٢-٨٣ ساڵی ٢٠٠٠ز.

# (٢)

# ڕۆژنامەی (خەبات) [١٩١]

تاشۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ساڵی ١٩٥٨ز لەعێراق ڕێگە نەدەدرا بەکورد پارتی سیاسی و یاسایی تایبەت بەخۆی هەبێت، هەروەها ڕێگەش نەدرابوو ڕۆژنامەی سیاسی ڕۆژانە یان هەفتانەی هەبێت... بەڵام ڕێگا درابوو لەسلێمانی ڕۆژنامەی ئەدەبی دەربچێت لەلایەن پیرەمێردو نەوەکانیەوە، جاروبار لێرەولەوێ هەندێ گۆڤارو کتێب و نامیلکە بەکوردی دەردەچوون، بەڵام بڵاوکراوەی سیاسی بۆ کورد قەدەغە بوو ڕێگای پێ نەدەدرا... .

لەدوای شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ ئازادی بەشێوەیەکی بەربڵاو هاتەکایەوە، برایم ئەحمەد وەك سکرتێری پارتی دیموکراتی کوردستان داوای لەمیری کرد مۆڵەتی پێ بدرێ ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانە بەزمانی کوردی و عەرەبی دەربکات بەناوی (ڕۆژنامەی خەبات) و بەعەرەبی (جریدة

---

[١٩١] ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ -ژمارە (٢١٥١) یەك شەممە ٢٠٠٠/٥/٢١ ل٩ نەوشیروان مستەفا.

النضال) مۆڵەتی پێدراو ڕۆژنامەکە دواتر بوو بەزمان حاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان[192].

یەکەم ژمارەی ڕۆژنامەی خەبات، کەبرایم ئەحمەد خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەری بوو لەڕۆژی شەممە ١٩٥٩/٤/٤ز لەبەغدا دەرچوو بەزمانی کوردی ژمارە (٦، ٧) بەعەرەبی و ژمارە (٨، ٩) بەکوردی و ژمارەکانی (١٠، ١١، ١٢) بەعەرەبی و لەژمارە (١٣) تا ژمارە (٢٤) بەزمانی کوردی یەو بەو شێوەیە بەکوردی و عەرەبی بەردەوام بوو تادەگاتە ژمارە (١١٢).
لەوە بەدوا تاژمارە (٤٦٢) کەدوای ئەوە داخراوە هەربەزمانی عەرەبی دەرچووە[193].

دیارە ڕۆژنامەی خەبات هەموو ڕۆژێك دەرنەچووە لەبەربێ توانایی مادی و چاپەمەنی، تەنیا ڕۆژانی شەممان و سێشەممان دەرچووە، دواتر بەبەردەوامی دەرچووە تاله ١٩٦١/٣/٢٨ز ئەوجا لەلایەن حکومەتی عبدالکریم قاسمەوە داخراوەو فەرمانی زیندانی کردنی خاوەن ئیمتیازو سەرنوسەرەکەی (برایم ئەحمەد) دەرچووە لەلایەن حاکمی عەسکەری گشتیەوە –ئەحمەد ساڵح ئەلعەبدی... .. لەمێژووی ڕۆژنامەگەری کوردیدا زۆرجار ڕۆژنامەی تێکەڵاو لەزمانی کوردی عەرەبی یاتورکی و یافارسی دەرچووە، واتە چەند لاپەڕەیەك بەکوردی و چەند لاپەڕەیەکی تری بەزمانی ئەو دەوڵەتەی لێی دەرچووە، بەڵام ڕۆژنامەی خەبات هات و ئەو ڕێچکەیەی شکاندو ژمارەی تەواوی یان بەزمانی کوردی و یان بەزمانی عەرەبی دەردەکرد.. برایم ئەحمەد کەئیمتیازی ڕۆژنامەی کوردستانی بەکوردی بۆ دەرچوو، ئیتر خەبات هەربەزمانی عەرەبی دەردەچوو.. نەوشیروان مستەفا ئەمین دەڵێت:

---

[192] ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ١ شەممە ٤ نیسانی ١٩٥٩ز ل ١.

[193] مامۆستا برایم ئەحمەد ڕۆژنامەی خەبات، نەوزاد عەلی ئەحمەد ل١٢.

(خەبات کێلێکی بەرزو دیارە لەسەر ڕێی کاروانی ڕۆژنامەوانی کوردیدا بەزمانی عەرەبی لەپایتەختی عێراق دا، خاوەنی سەروەرییەکی گەورەیە لە مەیدانی داکۆکی کردنی یاساییدا لە مافە نەتەوەییەکانی کوردو لە مەیدانی داکۆکی کردنی یاساییدا لەمافە دیموکراتییەکانی گەلی عێراق)).[١٩٤]

خەبات ڕۆژنامەیەکی سیاسیو ڕۆژانە بوو، خاوەنو سەرنووسەرەکەی پارێزەر بوو، لە ژمارە یەکی خەبات کە بەکوردی دەرچووە، لاپەڕەیەکی سەروتاری بلاّ وکردۆتەوە لەژێر سەرناوی (لەئامانجەکانمان)[١٩٥]

تیایدا هاتووە:

((خەبات لەم ڕۆژەدا دەردەچێت بۆ ئەوەی سیاسەتی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان دەربڕێت، ئەو پارتییەمان کە خەباتی کۆمەلاّنی گەل لە کوردستانی عێراقدا ئەبات بەڕێوە، دژی ئیمپریالیزمو کۆنەپەرستیو دەرەبەگی، وەلە پێناو دیموکراسیو سەربەخۆیی نەتەوایەتی بۆ نەتەوەی کورد، ئەو نەتەوەیەی ئێستاش لەژێر باری زۆرو چەوساندنەوەدایە لە تورکیاو ئێرانو سوریا..

ڕاپەڕینی سەرتاپای کۆمەلاّنی گەلی کورد بەسەرکردەیی پارتیمان بۆ پشتیوانی کردنی شۆڕشی چواردەی تەمووزی نەمر، ئیمپریا لیزمو کۆنەپەرستی لەهەموو شوێنێکدا گێژ کرد... تاد)).

هەر لەهەمان لاپەڕەدا، وێنەیەکی عەبدولکەریم قاسم لێدراوەو بەمانشێت نووسراوە (سلاّوی خەبات بۆ خۆشەویستی گەل).

---

[١٩٤] ڕۆژنامەی کوردستانی نویێ، ژ٢١٥١، یەك شەممە، ٢٠٠٠/٥/٢١،ل٩، نەوشیروان مستەفا.

[١٩٥] ڕۆژنامەی خەبات، ژ١، سالّی ١، شممە-١٩٥٩/٤/٤، ل١.

لەهەمان لاپەڕەدا بەخەتێکی گەورە نووسراوە (کشانەوە لەپەیمانی بەغدا، ئاواتێکی گەورەی کوردی هێنایە دی).

لەلاپەڕەی (٢)دا ئەم سەرناوانە دەخوێنیتەوە:

١- بەسەرهاتی پیلانە گوناهکارانەکەی ناسر- شەواف لە موسڵ، ڕیپۆرتاژی کاك خەسرەو تۆفیق..

٢- پەیمانی هاوکاری تەنیا بەدڵی ئیمپریالیزم و نۆکەرانی نییە..

٣- لاوانی دیموکراتی کوردستانی عێراق جەژنە پیرۆزە لەسەرۆکی قارەمان دەکەن..

هەرچی لاپەڕە ٣ یە بەیەك بابەتی گرنگ پڕ کراوەتەوە لەژێر سەرناوی (دەنگێکی ناساز، ئەبێ کپ بکرێت). لە نووسینی حەمە کەریم فەتحوڵایە.

ئەم وتارە دوورو درێژە دەربارەی پڕوپاگەندەی ناحەزانی کۆماری عێراقە لەدژی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ کە دەڵێت:

((جمهوریەت چی بۆ کورد کردووە؟))..

دیارە بەپێی بۆچوونی نووسەری وتارەکە ئەوانەی ئەو پڕوپاگەندانە دەکەن دوو گروپ یان دوو لایەنی دژ بەکۆماری عێراقن، لایەنێکیان خەڵکی سادەو ساویلکەی کوردی و دڵسۆزو بێ ئاگان، لایەنی دووەم خەڵکی بەکرێ گیراوو نۆکەری ئیمپریالیزم و دەرەبەگەکانن کە شۆڕشی تەمووز لەبەرژەوەندی داون..

لاپەڕەی ٤ وتارێکی دوورو درێژەو هەموو لاپەڕەکەی گرتووەتەوەو تەواو نەبووەو لە لاپەڕی (٧)دا تەواو کراوە، کە بەپێنووسی برایم ئەحمەد خۆیەتی و لەژێر سەرناوی (بەبۆنەی بیرەوەری ١٢ ساڵەی هەڵواسینی قازی محەمەدی شەهیدەوە)، هەر لەهەمان لاپەڕەدا شیعرە بەناوبانگەکەی برایم ئەحمەد (شینی پێشەوا) بڵاوکراوەتەوە.

ئەم لاپەڕەیە تایبەتە بەشەهیدی سەرکردە قازی محەمەدەوە.

دیارە لەیەکەم ژمارەی ڕۆژنامەکەوە گرنگی تەواوی داوە بەخەباتی نەتەوایەتی لەهەموو پارچەکانی کوردستانداو ڕێڕەوی خۆی دیاری کردووە لە ڕێبازی کوردایەتی پێشکەوتنخوازەو بەرگری کردنە لەمافەکانی گەلی کورد لەهەر چوار پارچەی کوردستاندا.

لەلاپەڕ (٥)دا بەخەتێکی گەورە نووسراوە: ((مەلا مستەفای بارزانی پیرۆزبایی لەسەرۆك دەکات)). وێنەی قاسم و مەلا مستەفای بەیەکەوە لێدراوە، لەژێر وێنەیەکیان نووسراوە: (خەباتکەری نەبەزی کورد مەلا مستەفای بارزانی، بەکشانەوەمان لەپەیمانی بەغدا پیرۆزبایی لەپێشەوای وڵات ئەکات).

هەر لەلاپەرە (٥)دا نووسراوە. (شەهیدەکانی گاورباغی لەبیر نەچوونەوە، گوناهکارانی کوشتاری گاورباغی کەلە ١٢ تەمووزی ١٩٤٦ز قەوما، سەرلەنوێ لەسەر داخوازی کرێکارانی نەوتی کەرکوك دادگایی دەکرێنەوە، باوەڕی تەواومان هەیە کە خوێنڕێژانی گەل ئەم جارە بەسزای عادیلانەی خۆیان دەگەن)، هەر لەو لاپەڕەیەدا کە لاپەڕەی لاوانە بەمانشێت نووسراوە: (ئیجازەدانی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانی عێراق، یەکێکە لەداخوازییەکانمان).

لاپەرە (٦) دیسان بەمانشێتی گەورە نووسراوە: (گەلی کورد پێشمەرگەیە بۆ پاراستنی جمهوریەتی عێراق). ئەمە نامەیەکە کۆمەڵەی قوتابییە کوردەکان لەئەوروپا بڵاویان کردووەتەوە.

هەر لەلاپەرە (٦) نووسراوە: (خەبات ڕۆژنامەیەکی سیاسی ڕۆژانەیە، خاوەن ئیمتیازو سەرۆك نووسین: ئیبراهیم ئەحمەدی محامی...

ناونیشان: شەقامی المتنبی.

ئابوونە لە هەموو شوێنێکی عێراق ٣٠٠٠ دینارە.

ئابوونە لەدەرەوەی عێراق ٣٥٠٠ دینارە.

دانەی بە (٢٠) فلسە.

لەچاپخانەی (النجاح) چاپکراوە.

لاپەڕە (٧) پاشماوەی لاپەڕەکانی پێشووی تیا بلاوکراوەتەوە.

لاپەڕە (٨)یش بەتەواوی پاشماوەی سەروتارو پاشماوەی وتاری (کشانەوەی لەپەیمانی بەغدا..).

ئەگەر سەرنجی لاپەڕەکانی ژمارە (١)ی ڕۆژنامەی خەبات بدەین، چەند ڕاستییەکمان بۆ دەردەکەوێت، لەوانە:

سەروتارەکەی ئامانجی ڕۆژنامەکەی دیاری کردووە، ڕێبازی خۆی دەرخستووە کە ڕێبازی پارتی دیموکراتی کوردستانە لەو سەردەمەدا.

دیارە ڕێبازەکە پاراستنی کۆماری عێراقەو پتەوکردنی برایەتی کوردو عەرەبەو، چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوایەتی کوردو گەشەکردنو چەسپاندنی دیموکراتیەتە لە عێراقداو داوای بەڕەسمی ناسینی ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کوردستانە، بەتایبەتی یەکێتی لاوانی دیموکراتی کوردستانو یەکێتی قوتابیانی کوردستانو جێبەجێکردنی مادده ٣ی دەستووری کاتی عێراقە کە دان بەهاوبەشی کوردو عەرەبدا دەنێت لە عێراقدا، هەروەها چارەسەری کێشەی زەوی و زارو زۆرانبازی بەرامبەر پیلانەکانی ئیمپریالیزمو نۆکەرەکانیانو پشتگیری خەباتو تێکۆشانی خەڵکی کوردستانە لە تورکیاو ئێرانو سوریا ...

لە خوێندنەوەی ژمارە یەکی خەباتدا هەمان ئامانجو ڕێباز بەرچاو دەکەون، کە ڕێبازی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستانە لەو سەردەمەدا. ئەمە لەڕووی ناوەڕۆکەوە، بەلام لەڕووی ڕوخسارەوە دەبینین

هەندێك لەژمارەكانی ٨ لاپەڕەیەو هەندێكی تریان (١٠ لاپەڕەیەو بەشێكیان ١٢ لاپەڕەیە).

بۆ نموونە ژمارە (٢،٥)ی خەبات ١٠ لاپەڕەیە.

ڕۆژنامەكە گرنگییەكی زۆری داوە بە ئەدەبی كوردیو لەزۆربەی ژمارەكانیدا چالاكی ئەدەبی بڵاوكردووەتەوە لەگەڵ شیعری شاعیرەكاندا. لە ژمارە ٥٠ بەدواوە لاپەڕەی تایبەتی تەرخان كردووە بۆ ئەدەب، بەتایبەت ئەدەبی واقعیو سیاسی كوردی.

هەروەها ڕۆژنامەكە گرنگی داوە بەهەواڵو دەنگوباسی دەرەوەو ناوخۆ.

هەواڵەكانی دەرەوەی لە لاپەڕە یەكدا بڵاوكردووەتەوەو هەواڵەكانی ناوخۆی لەلاپەڕەكانی ناوەوە داناوە، ئەمەش خۆی لەخۆیدا دیاردەی شارەزاییو ئەزمونگەری ڕۆژنامەوانی ڕۆژنامەكە بووە...

# ڕۆژنامەی خەبات و هەواڵ و دەنگوباس و ئاگاداری

ئەو هەواڵو دەنگوباسانەی کە لەپلەی یەکەمدا دێن، بەناونیشانی دیارو هەندێ جاریش بەوێنە ڕوونکراونەتەوە. بۆ کێرڤی دابەزینی هەواڵو دەنگوباس هەست دەکرێت ژمارە دوای ژمارە بەرەو پێشەوە چووبێتو زیاتر گرنگی بە دەنگوباسی سیاسیو کۆمەڵایەتی دابێت..

بۆ گرنگی دان بەبڵاوکردنەوەی هەواڵ چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:

١- هەڵکردنی ئالای تازەی جەمهوری عێراق لەسەر بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان لەلاپەڕە یەکدا.

٢- تەلەگرافێك لە نوێنەرایەتی گشتی گۆماری عێراقەوە ئەڵێ: کە لە ١٤ی تەممووزی نەمردا لەسەر بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکان ئالای تازەی کۆماری عێراق هەڵکرا.[١٩٦]

٣- گفتوگۆی (ماوتسی تۆنگ)و (خرۆشۆف). پێرێ ماوتسی تۆنگ سەرۆکی کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمۆنیستی چین، گفتوگۆیەکی دۆستانەی دوورو درێژی لەگەڵ نیکیتا خرۆشۆف سکرتێری یەکەمی حزبی کۆمۆنیستی سۆڤێتی کرد.[١٩٧]

---

[١٩٦] ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٢٣، هەینی تەمووزی ١٩٥٩، ل١

[١٩٧] ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٧١، یەك شەممە، ٤ تشرینی یەکەمی ١٩٥٩، ل١.

٤- سێ زەماله بۆ خوێندنی كوردی لەو زەمالانەی كە یەكێتی سۆڤیەت بەخشیویە بۆ قوتابیانی عێراق تەرخان كرا لەلایەن وەزارەتی زانیارییەوە بۆ خوێندنی مێژووی كوردو ئەدەبیاتی..

ئەم زەمالانەش دەدرێن بەوانەی كە كوللیەیان تەواو كردبێت‌و دیارە كە لە شاری لینینگراد بخوێنن لە مەعهەدی دراساتی ڕۆژهەلاتی، چونكە بەشێكی تایبەتی تیایە بۆ خوێندەواری كوردی... (١٩٨)

ئەو نموونانەی سەرەوە مشتێك بوون لە خەروارێك دەربارەی گرنگی دانی خەبات بە هەواڵ‌و دەنگوباسی دەرەوە.

(١٩٨) ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە ٩٤، سێ شەممە، ١٠ ت٢ ١٩٥٩، ل١

ماموستا برایم ئەحمەد، ڕۆژنامەی خەبات، نەوزاد عەلی، ل٢١.

# ڕۆژنامەی خەبات و ڕێبازی کوردستانییەت

دیـاره خـەبات وەك ڕۆژنامەیـەکی نەتەوایـەتی و نیشـتمانی هەڵپـەی کـردووەو بەتـەواوی کوردسـتانیەتی خـۆی سـاغ کردۆتـەوەو پـەیامی نیشتمانی و کوردستانیەتی خۆی وەك ئەرکی پیرۆز بەرز ڕاگرتووە.

لەلاپەڕەیـەکی ژمـارە (١٤)ی ڕۆژی ٦ی تـەممووزدا بـە مانشـێتی گـەورە نووسـراوە (نـەمری بـۆ شـەهیدانی کوردسـتان) و وێنـەو دوا نامـەی چـوار شـەهیدە قارەمانەکەی (١٩)ی حوزەیرانـی سـاڵی ١٩٤٧ بڵاوکردووەتـەوە بـە وتـارێکی بەپێزو پڕ مانـاش لەسەر ژیان و خـەبات و تێکۆشـانی هـەر چـوار ئەفسەرە قارەمانەکەی نووسیوەو بەتووندی هێرشی کردووەتە سەر ڕژێمـی پاشـایەتی ڕووخـاوی نۆکـەری ئیمپریـالیزمی ئینگلـیزی کـە ئـەو چـوار ئەفسەرەی لەسێدارە داوە.[١٩٩]

نامـەی شـەهیدەکان بۆ گـەلی کـورد، دوای حوکمـی لەسـێدارە دان بەیـەك سەعات نووسراوە.

لە نامەکـەدا هـاتووە: (برایـان دوژمنـی جەهالـەت بن بەهـەموو تواناتـان، شەڕی جەهالەت بکەن و دوای جەهالـەت مەکەون.. تاد). وە لـەژێرەوە نـاو و ئیمزای هەر چوار ئەفسەرەکە بە تەسەلسلی پلەو پایە نووسراوە...

عزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، محەمەد قودسی ئیمزایان کردووە.

---

[١٩٩] ڕۆژنامەی خەبات، ژمارە ١٤، ٦تەمووز ١٩٥٩، ساڵی١، ل١.

بڵاوکردنەوەی وێنەو نامەی ئەو چوار ئەفسەرە شەهیدە لەگەڵ وتاری خەبات دەربارەی تێکۆشانی ئەو چوار ئەفسەرە کە بەشداری شۆڕشی بارزان و دواتر لە کۆماری مەهاباد بەشدارییان کردووەو ڕۆڵی باش و بەرچاویان هەبووە لەڕۆژهەڵاتی کوردستان.

هەروەها لە ژمارە یەکی خەبات دەربارەی یادی شەهید بوون و لەسێدارەدانی قازی محەمەدو بڵاوکردنەوەی ئەو شیعرەی بۆ لە سێدارەدانی پێشەوا نووسرابوو لەکاتی خۆی و لە گەلاوێژدا بڵاوکرابووە...

دیسان بڵاوکردنەوەی دەیان وتاری تر دەربارەی شۆڕشەکانی شێخ مەحموودو سمکۆو شێخ سەعیدو دەرسیم و ئاگری داغ و لەسەر کێشەی کورد لە پارچەکانی تری کوردستانداو وەك کێشەیەکی گشتی سیاسی سەیری کردووە. گەڵێ جار ئەو بابەتانەی کە پەیوەندییان بەکێشەی کوردەوە هەبووە، لەژێر ناونیشانی خەباتی کوردستاندا بڵاوکردووەتەوە[٢٠٠].

هەر بۆ ئەو مەبەستە، ئەگەر سەیری ژمارە ٢١ی خەبات بکەین، دەبینین نووسراوە: (خەباتی کوردستان بووژاندنەوەی بزووتنەوەی کوردایەتی لە کوردستانی داگیرکراوی بەزۆر بەتورکیاوە بەستراو))[٢٠١]، لە ژمارە ٢٣ دا نووسراوە: ((خەباتی کوردستان- دەربارەی کوردستانی بەسووریاوە بەستراو)) وتارێکی دوورو درێژی نووسیوە.

---

(٢٠٠) مامۆستا برایم ئەحمەد، ڕۆژنامەی خەبات، نەوزاد عەلی، ل٢٣.

(٢٠١) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٨٤،ساڵی١، چوارشەممە- ت١- ١٩٥٩، ل١.

لەلاپەڕ ٢ی ژمارە ٤٣شدا هاتووە: ((خەباتی کوردستان وێنەیەك لە خەباتی کورد لە کوردستانی بەزۆر بەستراو بەئێرانەوە))[٢٠٢]

لەم ژمارانەی خوارەوەشدا ئەو بابەتانەی دادێ بڵاو کردووەتەوە:

- کاربەدەستانی تاران مەدرەسەی دینیو مزگەوتێکی سووری مەهابادیان تێکدا[٢٠٣].
- ڕاوو ڕووتی کاربەدەستانی تاران بۆ خەبات هانمان دەدات.[٢٠٤]
- هەواڵی کوردستانی بەئێرانەوە بەستراو، حکومەتی تاران سەبارەت بەسەر بەستراوی بە ئیمپریالیزمەوە وڵاتی کوردستانی کردووە بەچەکخانە بۆ شەڕو شۆڕ.[٢٠٥]
- سەروتاری خەبات- کاربەدەستانی ئێران دوشمنی سەرسەختی جەمهوریەتەکەمانن.[٢٠٦]
- یارمەتیدانی کوردە پەنابەرەکانی ئەو دیوو پێویستییەکی نیشتمانییە.[٢٠٧]

بەڵێ بەکورتی ڕۆژنامەی خەبات بەتەواوی کورد پەرستیو کوردستان ویستی خۆی سەپاندبوو بەسەر خوێندەواری ڕۆژنامەکەدا..

(٢٠٢) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٨٦، ساڵی١، هەینی-٣٠- ت١ -١٩٥٩، ل.

(٢٠٣) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٢١، ساڵی١، سێ شەممە-٢٨- تەمووز- ١٩٥٩، ل٢.

(٢٠٤) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٢٣، ساڵی١، هەینی-٣١-تەمموز- ١٩٥٩، ل٢.

(٢٠٥) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٤٣، ساڵی١، یەك شەممە-٢٩- ئاب- ١٩٥٩، ل٢.

(٢٠٦) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ١٠٧، ساڵی١، هەینی-٢٧- ت٢- ١٩٥٩، ل١.

(٢٠٧) ڕۆژنامەی خەبات ، ژمارە ٧١، ساڵی١، یەك شەممە-٤- ت١- ١٩٥٩، ل٢.

# ڕۆژنامەی خەبات و یەکێتی ڕیزەکانی بەرەی گەل

لەڕاستیدا ڕۆژنامەی خەبات و پارتی دیموکراتی کوردستان و کەسی برایم ئەحمەد لەسەردەمی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژدا هەوڵێکی بێ وچانیان دا بۆ ئەوەی هێزە نیشتمانی و نەتەوەییەکان لەبەر یەك نەترازێن و ململانێی یەکتری نەکەن، تا ئەو ڕادەیەی بگاتە ئاستی خوێن ڕشتن و یەکتری کوشتن و پیلان گێڕان لەدژی یەکتر.

دیارە هەر لەسەرەتای سەرکەوتنی شۆڕش، دوو بۆچوون لەناو پارتەکانی کۆمەڵانی خەڵك هاتە کایەوە.

***یەکێکیان:***

بۆچوونی حزبی شیوعی و دۆستەکانی، کە خۆیان بەخاوەنی شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ دەزانی بەهۆی پشتگیری هەندێك لەئەفسەرە ئازاو ئازادیخوازەکانی شۆڕش، وەك وەسفی تاهرو فازل عەباس مەهداوی و ماجد محەمەد ئەمین..تاد.

ئەمانە لەخودی سەرهەنگ عەبدولکەریم قاسم زۆر نزیك بوون.

***لایەنی دووەم:***

عەرەبە نەتەوە پەرستەکانی ناو سەرکردایەتی شۆڕش، وەك: عەبدولسەلام عارف و عەبدولوەهاب شەواف و ڕەفعەت حاجی سرِی و ئەحمەد سالّح عەبدی و ئەفسەرە تکریتییەکانی تر، کەسەر بەحزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی و بزووتنەوەی سۆشیالیستی ناسری بوون.

لەئەنجامی ناکۆکی دژە یەکەکان چەندین پیلان لەدژی ڕابەری شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ سازدرا.

لەسەرتادا عەبدولسەلام عارف ویستی قاسم بکوژێ، بەڵام سەری نەگرت، ئینجا بەعسەکان هەوڵی تیرۆرکردنی قاسمیان داو بریندارییان کرد، ئەویش سەرکەوتوو نەبوو. پیلانی عەبدولوەهاب شەواف لە موسڵ بەهاوکاری میسرو سوریا، هەڵگەڕانەوەی سوپا، ئەویش سەری نەگرت. شیوعییەکان و هاوپەیمانەکانیان ئەم ڕووداوانەیان قۆستەوەو بەهەلیان زانی، کەوتنە گیانی نەیارەکانیان لە موسڵ و کەرکوك و سەدان کەسیان لێ کوشتن و لەشەقامەکان ڕایان دەکێشان. کارەساتی دڵتەزێنی وا ڕووی دا لەمێژوودا وێنەی کەم بێت. قاسم کەوتە پاشەکشەو پاشگەزبوونەوە لە پەیمان و بەڵێنەکان کە بەکۆمەڵانی خەڵکی دابوو.

لەژێرەوە دەستی خستە ناو حزبەکانەوە هانی پارچە پارچە بوون و لێکترازاندنی دەداو لەیەکتر تیژی دەکردن، بۆ خۆشی زیاتر بەرەو دەسەڵاتی تاکڕەوی و دیکتاتۆریەت دەڕۆیشت.(٢٠٨)

ڕۆژنامەی خەبات هەر زوو هەستی بەو مەترسیانەی سەر کۆمارە ساواکەو میللەتە هەژارەکە دەکرد، بۆیە چەندین وتاری هوشیار کەرەوەی لەو بارەیەوە بڵاوکردەوەو داوای لەپارتە سیاسییەکان کرد لەسەر بەرنامەیەکی نیشتمانی هەمەلایەن، هەموو لایەنەکان ڕێك بکەون و ڕێگا لەپیلانی دوژمنان بگرن. بۆ ئەو مەبەستە ڕۆژنامەی خەبات چەند

(٢٠٨) پرۆفیسۆر عزەدین مستەفا دەڵێت: ((کارەساتەکانی موسڵ و کەرکوك تەنیا شیوعیەکان و پارتییەکان نەبوون، بەڵکو خەڵکی تریش دەستی تیا هەبوو.

دروشمێکی داڕشت و بڵاوی کردەوە تاوەکو هەموو پارتە سیاسییەکان پەسەندی بکەن و لەسەری ڕێك بکەون لەژێر سەرناوی:

((لەپێناو بەستنی پەیمانێکی نیشتمانیداو ئەو قۆرتانەی دێنە ڕێی یەکێتی هێزە نیشتمانییەکان).[209]

١- پاراستنی کۆمارە خۆشەویستەکەمان.

٢- لەسەر ڕۆیشتنی شەقامی دیموکراسی.

٣- گەشەپێدان و کەڵك لێوەرگرتنی سەرکەوتنەکانی شۆڕشە نیشتمانییە دیموکراتییەکەمان.

٤- ناچاری بەئاشتی پێکەوە ژیانی بیرو باوەڕە جیاجیاکان.

٥- پێویستی پارێزگاری ئاسایش و ئاشتی و دڵنیایی لەسەرانسەری کۆمارەکەمان.

٦- بەرگرتن و لەناوبردنی دوژمنەکانی دەرەوەو ژوورەوەی کۆمارەکەمان.

٧- بڕانەوەی دەمی گوا ستنەوە (فترة الانتقال) بەبەستنی پەیمانێکی نیشتمانی.

ئەم دروشمانە لە وتارێکی سێ ئەڵقەیی خەباتدا بڵاوکرانەوە. لە ژمارەکانی ٥٩، ٦٠، ٦٥دا.

جگە لەو هەڵوێستە نیشتمانی و هەست کردن بە لێپرسراوێتی مێژوویی بەرامبەر بەگەل و نیشتمان، دەبینین ڕۆژنامەی خەبات لەپێشی پێشەوەی

---

[209] ١- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٥٩) ساڵی (١)، ٢٠ئەیلولی ١٩٥٩ز ل١.

٢- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٦٠) ساڵی (١)، ٢١ ئەیلولی ١٩٥٩ز ل١.

٣- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٦٥) ساڵی (١)، ٢٧ی ئەیلولی ١٩٥٩ز ل١.

ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی تری عێراقە، کە ڕەخنەی توندی لە ئاکارو کردەوەکانی دەسەڵاتداران گرتووەو بەرگریو داکۆکی لە ئازادییە دیموکراتییەکانو مافی مرۆڤ کردووە.

لە مانگی ئابی ١٩٦٠، دوای ئەوەی حاکمی عەسکەری عێراق.[٢١٠] کۆمەڵێك کۆتو بەندی خستە سەر ڕۆژنامەگەری لە عێراقداو هەندێ لە ڕۆژنامەکانی داخست.

ڕۆژنامەی خەبات هەر زوو هاتە دەنگو ئەم کارەی بە پێشێلی ئازادی ڕۆژنامەنووسی دایە قەڵەمو داوای کرد ئەو کۆتو زنجیرو سانسۆرانە هەڵبگیرێو ئازادی ڕا دەربڕین دابین بکرێ بۆ هەموو لایەك.

دوای ڕۆژنامەی خەبات ئینجا ڕۆژنامەکانی تری عێراقی هاتنە وەڵامو ئەوانیش هەڵوێستی خۆیان لەوبارەیەوە دەربڕی.

ڕۆژنامەی خەبات ڕۆڵی بەرچاوی گێڕاوە لەدا مەزراندنی یەکەم سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لە عێراقداو لە یەکەم کۆبوونەوەی دەستەی دامەزرێنەری کە لەمانگی ئایاری ١٩٥٩ بەسترا.

(هەمزە عەبدوڵا) وەك نوێنەری ڕۆژنامەی خەبات ئامادەی کۆبوونەوەکە بوو، ناونیشانی لە لیستی دەستەی دا مەزرێنەری یەکەم سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی عێراقدا هاتووە. کۆنگرەی یەکەمی دا مەزراندنی سەندیکا لە ١٩٥٩/٩/٧ لەهۆڵی گەلی بەغدا بەڕێوەچوو وە شاعیری گەورەی عەرەب (محەمەد مەهدی ئەلجەواهیری) بوو بەسەرۆکی ئەو سەندیکایە.

---

[٢١٠] نامیلکەی مامۆستا برایم ئەحمەدو ڕۆژنامەی خەبات نەوزاد عەلی ل ٢٤.

هەروەها ڕۆژنامەی خەبات گۆشەو ستوونی تایبەتی هەبووە بۆ هەندێك بابەتی گرنگ، وەك گۆشەی:

(خەباتی کوردستان)، (لەکۆڕی خەباتی شۆڕشگێڕیدا)، (گۆشەی ژنان)، (گۆشەی لاوان)، (گۆشەی قوتابیان)، (کرێکاران)...

ئەم گۆشانە ناوبەناو بەپێی تواناو گونجانی بارودۆخ وتاری ڕێکوپێکی تیا بڵاودەکرایەوەو لەنووسەرە هەمیشەییو دیارەکانی ڕۆژنامەی خەبات کە ناوی خۆیان نەدەنووسی جگە لە برایم ئەحمەد، جەلال تالەبانی، حیلمی عەلی شەریف، عەبدولڕەحمان زەبیحی، سەید عەزیزی شەمزینی، جەرجیس فەتحولا، ساڵح یوسفیو چەند کەسێکی تر بوون..

# زمانی نووسین لە رۆژنامەی خەبات

زمان لەرۆژنامەدا جیاوازە لە زمانی قسەکردن و رێزمان و زمانی ئەدەبی، زمانی رۆژنامە هونەرێکی تایبەتی گەرەکەو جیاوازە لە زمانی شیعرو چیرۆك و پەخشان، (بۆیە هەر لەکۆنەوە جیاوازی کراوە لەنێوان ئەو دوو شێوە زمانە، چونکە زمانی رۆژنامە هەواڵە، هەواڵیش بریتییە لە گواستنەوەی رووداوەکان بۆ ئەوەی زۆرترینی خەڵك لەو رووداوە ئاگادار بێت و زانیاری سەبارەت بەو رووداوانە هەبێت. کەواتە ئەو زمانەی رووداوەکانی پێ دەنووسرێتەوە پێویستە بەشێوەیەکی سادەو ساناو بێ گرێ و گۆڵ بێت، بۆ ئەوەی زۆربەی خەڵك بیخوێنێتەوەو تێی بگات).[٢١١]

ئەوەی جێگای سەرنج و تێڕامانە، رۆژنامەی خەبات و خاوەن ئیمتیازو سەرنووسەرەکەی پیاوێکی ئەدیب بووەو نەیتوانیوە دەستبەرداری زمانی ئەدەبی بێت، دیارە زۆربەی سەروتارو بابەتە گرنگەکانی ناو رۆژنامەکە برایم ئەحمەد خۆی نووسیویەتی و شەقڵی دەستی ئەوی پێوە دیارەو شێوەی نووسینەکان ئەو شایەتییەی بۆ دەدەن. بۆیە دەبینین رۆژنا مەکە لەزمانی ئەدەبی رزگاری نەبووەو زمانی رۆژنامەیی بەکارنەهێناوە.

بۆ سەلماندنی ئەو راستییە، دەتوانین چاو بەلاپەرەکانی رۆژنامەکەدا بخشێنین دەربارەی جەژنی دامەزراندنی لەشکری رزگاری هێنەری چین[٢١٢]،

---

(٢١١) مامۆستا برایم ئەحمەدو رۆژنامەی خەبات نەوزاد علی سلێمانی ل٣٢.

(٢١٢) رۆژنامەی خەبات ژمارە (٢٤) یەك شەممە ٣/ئابی/ ١٩٥٩ ل١.

هەروەها هەواڵی ئەنجومەنی خەتکێشان- پلان دانان[٢١٣]- (مجلس التخطيط) لە کۆبوونەوەی دواییدا دەربارەی زیان و ئەرکی گواستنەوەی خاووخێزانی دێهاتەکانی (گۆمی دوکان) لەپارێزگای سلێمانی، دیارە بەبەراورد لەگەڵ ڕۆژنامەو گۆڤارە کوردییەکان و عێراقییەکانی ئەو سەردەمە، دەبینین ڕۆژنامەی خەبات هەنگاوی باشی بەرەو پێشەوە ناوە لە مەیدانی زمانی ڕۆژنامەوانی و ڕێنووسدا، ئەو زمان و ڕێنووسەی لە ڕۆژنامەی خەبات بەکار هێنراوە جۆرێک لە پێشخستن و ڕێکخستنی ڕێنووسی پێوە دیارە، هەوڵیش دراوە هەموو ڕۆژنامەکە بەیەک ڕێنووس بنووسرێت کە ئەمە کارێکی زۆر ئیجابی بووە، چونکە تا ئێستاش ڕۆژنامە هەیە ناتوانێت لەلاپەڕە یەکەوە تادوا لاپەڕە پەیڕەوی یەک ڕێنووسی تایبەت بەخۆی بەکار بهێنێت.

---

[٢١٣] ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٣٣) سێ شەممە ١/ئابی/ ١٩٥٩ ساڵی (١) ل٦

# ڕۆژنامەی خەبات و بوختانی جیابوونەوەی کورد

لەژێر سەردێڕی (جیابوونەوە درۆیەکی ئیمپریالیستییە) ڕۆژنامەی خەبات چەند وتاری نووسیوە، بەرپەرچی ئەو تۆمەتانەی داوەتەوە کە دراوەتە پاڵ میللەتی کورد کەگوایە میللەتێکی جودا خوازەو دەیەوێت لە عێراق جیا بێتەوە.[٢١٤]

لە خەباتی ژمارە ٩٦، سەروتارێك نووسراوە بەم شێوەیە (چەسپاندنی یەکێتی عێراق[٢١٥]): بۆیە پێشڕەوە دیموکراتییەکەی خەڵکی کوردستانی عێراق و هەموو دڵسۆزانی جەمهوریەتە دیموکراتیەکەمان و یەکێتی عێراق و برایەتی کوردو عەرەب بانگ ئەکات بۆ بەربەستکردنی هەموو جۆرە پڕوپاگەندەو بیروباوەڕێکی (تواندنەوەو تێکلاوکردن) و ڕیسواکردنی بلوێر ژەنەکانی ئەم بیروباوەڕە ڕەشە پیسە پڕ لە زەرەرانە بۆ دەسکەوتنی کوردو عەرەب و دواڕۆژی پێکەوە ژیانیان)).

خەبات داوا لەسیادەتی تاکە پێشەوا دەکات، کە هێزە نیشتمانییەکان لەدەوری پەیمانێکی نیشتمانی کۆبکاتەوە، ئەمە سەروتاری ڕۆژنامەی خەباتە ژمارە (١١١).

(٢١٤) ١- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ٧١ ساڵی ١ یەك شەممە ٤/تشرینی یەکەم/ ١٩٥٩ ل١.
٢- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ٨٠ ساڵی ١ دووشەممە ١٩/تشرینی یەکەم/ ١٩٥٩ ل١.
٣- ڕۆژنامەی خەبات ژمارە ٨٤ ساڵی ١ چوار شەممە /تشرینی یەکەم/ ١٩٥٩ ل١.

(٢١٥) ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (٩٦) ساڵی (١) پێنج شەممە ١٢/تشرینی دووەم/١٩٥٩ ل١.
تێبینی: ڕۆژنامەی خەبات ژمارە (١١١) ساڵی (١) چوارشەممە ٢/کانونی یەکەم/١٩٥٩ ل١.

# خەبات

# النضال

جريدة يومية سياسية

عدد ١٠٢ — الجمعة ٣٠ تشرين الثاني ١٩٥٩ — الثمن ١٦ فلسا

بمناسبة مؤتمر طهـــران

## منظمة المعاهدة المركزية تواصل سياستها المعادية للعراق والسلام العالمي

عقد قبل ايام مؤتمر لرؤساء الحكومات الاسيوية الاعضاء في منظمة [illegible] المركزية — حلف بغداد المنهار — في العاصمة الايرانية ، تلــــك [illegible] التي تحلو لاقطابها تسميتها بالاسلامية ، وهي التي تمادى الاسلام [illegible] باضطهاد شعوبها الاسلامية والتآمر على غيرها من الشعوب الاسلامية [illegible] جميع الاعمال المنافية لمبادئ الدين الاسلامي ، فضلا عن اتفاقها [illegible] الاوروبية استعمارية — غير اسلامية طبعا — ضد شعوب اسلامية في [illegible] او الاتحاد السوفياتي .

من كتاب « الحركة القومية التحررية

## للشعب الكردي وقضيته »

بقلم الدكتور : س ٠ ع شمزيني

تابع المقدمــــة

٣ — مؤلفات روسيا فيما قبل الثورة — والمؤلفات السوفياتية عن الاكراد .

كذلك فاننا نجد روسيا قبل ثورة اكتوبر العظمى ، كانت مهتمـــة اهتماما كبيرا جدا بالاكراد ، حيث طبعت ونشرت في روسيا حينذاك ، مجموعة كبيرة من المقالات والكتب عن الاكراد ، جميعها تحمل شيئا من طابع علمي وحربي . ويمكن ان تنسب الى مثل هذه المؤلفات ، الاثر الــــذي تركه — ف ٠ خانيكوف سياحة في كردستان ايران — اي ٠ د ٠ ك ٠ و — ١٨٥٢ ومؤلف مجلة السياحة للجنرال ميرزكوف مصنف رقم ٥٩٥٣٠ عام ١٨٤٩ الذي يبحث عن العلاقات الاجتماعية بين الاكراد في مقاطعة — خان ماكو وسلدوز وصاوج بلاق — وكذلك مؤلف اخبار ورحلات ، الجوزات كراف ، لمؤلفه اريفانسكي اي ٠ كي ٠ ف اي ٠ ا مصنف رقم ٤٦٤٦٦ عام ١٨٥٨ وعدا هذه المؤلفات ، توجد اخباريات ومقالات كثيرة عن حالة كردستان ايران في النصف الاول من القرن التاسع عشر ، كما وتوجد كثير من المقالات لكل من كامساراكان ، وفاسيليو ٠ و ٠ بالتوحوف ٠٠ الخ ، منشورة فـــي نشرات ، الجمعية الجغرافية الروسية ، وخصوصا في مذكرات ، فرعها زافكاز اي ٠ ر ٠ كي ٠ و في قفقاسيا ، من بينها مؤلفات كارتسف ، البزاروف ، باتموخوف ، ن ٠ مار ، سمرنوف ، وفي الفترة الاخيرة ، واسيليف اراكيليان ، وغيرهم .

ولا ضرورة لبيان خلاصة جميع المؤلفات المطبوعة باللغة الروسية كما ولاحاجة لذكر اسمائها جميعا .

وهناك بعض المقالات لها اهمية نظرا لما ورد فيها من وثائق واقعية حول العلاقات بين الاكراد ، ومن هذه المقالات ، مقالة كي ٠ ب ٠ كامساراكان و كارتسيف وكالوباكين وغيرهم المنشورة في مجموعة وثائق عن اسيا .

# (خەبات)ی عەرەبی

ڕۆژنامەی خەبات تا ژمارە ١١٢ زۆربەی زۆری بەکوردی دەرچووە، لەو ژمارەیە بەدواوە تا ژمارە ٤٦٢ بەعەرەبی دەرچووە.

ژمارە عەرەبییەکان هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ژمارە کوردییەکان نییە..

دیارە خەبات ڕەواجی باشی هەبووە لەناو کۆمەڵانی خەڵکاو بەپەرۆشەوە خوێندەوارانی کوردو عەرەب تا مەزرۆی خوێندنەوەی خەبات بوون و هەمیشە لایان لێ کردووەتەوەو بازاڕی گەرم بووەو لە هەموو ڕۆژنامەکانی تر زیاتر فرۆشراوە.

خەڵك بەتاسەو ئارەزووەوە هەموو ڕۆژێ چاوەڕێی خوێندنەوەی سەروتارەکانی ڕۆژانەی بوون و، هەر ڕۆژە بابەتێکی سیاسی نووسیوە کەبەلای خەڵکەوە زۆر گرنگ بووە. چونکە ئەو سەروتارانە تەعبیریان لەبیروبۆچوونی نەتەوەی کوردو پارتی دیموکراتی کوردستان کردووە.

دیارە کوردیش لەهاوکێشەکەدا لایەنێکی سەرەکی بووەو هەموو لایەنەکانی تر بەبایەخەوە لەو لایەنەیان ڕوانیوە، بەتایبەتی لەو کات و دەمەدا کە عێراق لەباری (حاڵەتی) هەڵچوون و داچووندا بووە.

هەموو دنیا بەتایبەتی وڵاتە عەرەب و دراوسێکان و ئەورووپاو ئەمەریکاو بەرەی شورەوی زۆر گرنگییان بەباری عێراق داوەو بەوردی چاودێری کێشەکان و دژە یەکەکانیان کردووە.

هەر لایەك بۆ مەبەست و بەرژەوەندی تایبەتی خۆی و هەرکەسە بەیاری خۆیدا گوتووە.

شورەوی دەیویست شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژ تووشی شکست نەبێت و کۆماری عێراق گەشە بکات و پایەو بنکەی ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانیان لەڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەندریٚ و جارێکی تر خۆیان نەگرنەوە.

ڕۆژئاوا بەپێچەوانەوە دەیویست شۆڕشەکە شکست بێنێت و سەرکردەکانی ببنە پەندی زەمانە، بۆ ئەوەی پڕیشك بۆ دەوروپشتی نەهاویٚ.

ئوردون و ئێران و تورکیا زیاتر تووشی نوشوستی و ئاژاوەو ململانیٚ و کێشەی ناوخۆ نەبن و گڕو کڵپەی شۆڕشی عێراق نەگاتە لایان (ئاگرە سوورە لەخۆم دوورە)و ڕژێمەکانیان تێك وپێك نەچێت.

گەلی عێراقیش لەناوخۆیدا تووشی لەبەریەك هەڵوەشاندنەوە هاتبوو، ئاژاوەو دووبەرەکی و ناتفاقی لەوپەڕیدا بوو.

گەلی عێراق بوو بوون بە دوو بەرە بەرامبەر بەیەك لە دژی یەکتر.

بەرەی نەتەوەپەرستەکان و بەرەی دیموکراتخوازەکان.

کوردیش لەنێوان ئەو دوو بەرەیەدا سەربەخۆیی خۆی پاراستبوو و بەرگری لەمافی چارەنووسی دەکردو بەتووندی بەرپەرچی پڕوپاگەندەو بڕوبیانووی شۆڤێنییەکانی دەدایەوە، کەداوای تواندنەوەی کوردیان دەکرد لەبۆدەقەی عەرەبیدا.

ئالێرەدا ڕۆژنامەی خەبات ڕۆڵی بەرچاوی خۆی بینی، وەك زمانحاڵی نەتەوەیەکی زۆرلێکراوو بەشخوراو لەژێر هەڕەشەی توانەوەو چەقۆ لەسەر مل، بەوتارە بەپێزو هوشیار ئامێزو زانستیانەی خۆی، وەك زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان و ڕابەری کوردایەتی، زۆر بەوریایی و ژیرانە بەرامبەر بە پیلانەکانی دژ بەگەلی کورد وەك شورای چین وەستابووو بەرگری لەخاکی کوردستان و نەتەوەی کورد دەکرد.

ژمارە عەرەبییەکانی ڕۆژنامەی خەبات بەتایبەتی لەسەرەتای ساڵی ١٩٦١ـەوە لە ژمارە ١١٢ بەدواوە زیاتر لەبارەی مۆڵەت وەرگرتنی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقەوە نووسیویەتی و پەیڕەوو پرۆگرامی پارتی شی کردووەتەوەو ئامانجەکان و ڕێبازەکەی بەخوێنەدەوارانی خۆی ئاشنا کردووە.

گۆشەیەکی بەردەوامی تایبەتی تەرخان کردبوو بۆ وەرگێڕانی (نامەی دکتۆرا)ی سەید عەزیز شەمزێنی بەناوی (بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی خەڵکی کوردستان) کەلە زانکۆی لینینگراد بڕوانامەی دکتۆرای پێ وەرگرتبوو.

دەتوانین لێرەدا چەند سەروتارێك بەنموونە بهێنینەوە کەلە خەباتی عەرەبیدا نووسرابوو:[٢١٦]

((هەنگاوێکی دیموکراتی نوێ)) ژمارە ١٣٦ لە ١٩٦٠/١٢/٣

---

[٢١٦] مامۆستا برایم ئەحمەدو ڕۆژنامەی خەبات نەوزاد علیی سلێمانی ساڵی ٢٠٠٠ ل٥٦-٥٧.

((ڕۆڵی مێژوویی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق و کاریگەری گەورەی لەبەهێز کردنی کۆماری دیموکراتی و برایەتی کوردو عەرەبدا)) خەباتی ژمارە ١٣٨ لە ١٩٦٠/١٢/٥.[٢١٧]

((ڕۆڵی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق لە سەرکردایەتی کردنی جەماوەری زەحمەتکێشی کوردستاندا)) ژمارە ١٤٤ لە ١٩٦٠/١٢/١٣.[٢١٨]

((دیموکراتیەتی ڕووبەڕوو بوونەوە لە پەیڕەوی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراقدا))، ژمارە ١٥١.[٢١٩]

((سڵاو بۆ چینی کرێکاران))، ژمارە ١٦٦ لە ١٩٦١/٢/٩.[٢٢٠]

لەبەر ئەوەی ڕۆژنامەکە بەمانی عەرەبی چاپ کراوە، واتە زیاتر بۆ عەرەب و عەرەب زانەکان بووە، بۆیە دەبینین سنگی لاپەڕەکانی بۆ هەواڵە عەرەبییەکان تەرخان کراوە. هەواڵەکانی کوردی کەوتووەتە لاپەڕەکانی ناوەوە، بەڵام هەواڵی زۆر گرنگ و دیاری کوردی لەلاپەڕە یەك بڵاوکراوەتەوە.

بۆ نموونە:

---

[٢١٧] خەبات (النضال) العدد ١٣٦ في ٣/ كانون الأول ١٩٦٠ ص١.

[٢١٨] خەبات (النضال) العدد ١٣٨ في ٥/ كانون الأول ١٩٦٠ ص١.

[٢١٩] خەبات (النضال) العدد ١٤٤ في ١٣/ كانون الأول ١٩٦٠ ص١.

[٢٢٠] خەبات (النضال) العدد ١٥١ في ٢٢/ كانون الأول ١٩٦٠ ص١.

((کوردەکانی فەیلی بروسکەیەك بۆ زەعیم دەنێرن بەبۆنەی بەخشینی جنسیەی عێراقی پێیان))، ژمارە ١٤٤.[٢٢١]

((هەڵبژاردنی دەستەی کارگێڕی کۆمەڵەی گورانی کوردی))[٢٢٢].

((دەستکاری کردنی یاسای نەقابەی کارمەندانی تەندروستی)) ژمارە ١٦٢[٢٢٣].

((سەرکەوتنی مانگرتنی کرێکارانی ڕۆن لە کۆڵۆمبیا)) ژمارە ١٦٦[٢٢٤].

بەگشتی ڕۆژنامەی خەبات لە ژمارە عەرەبییەکاندا لەلاپەڕەیەك زیاتر هەواڵەکانی سەرەك وەزیرانی عێراق، عەبدولکەریم قاسم و زۆر جاریش وێنەی قاسمی بڵاوکردووەتەوە، دوای ئەوە هەواڵەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، دواتریش هەواڵە جیها نییەکانی بڵاوکردووەتەوە..

[٢٢١] خەبات (النضال) العدد ١٤٤ الأربعاء في ١٣/ كانون الثاني ١٩٦٠ ص٥.
[٢٢٢] خەبات (النضال) العدد ١٥٧ الجمعة في ٢٢/ كانون الثاني ١٩٦٠ ص٥.
[٢٢٣] خەبات (النضال) العدد ١٦٢ الخميس في ٢/ شباط/ ١٩٦١ ص٤.
[٢٢٤] خەبات (النضال) العدد ١٦٦ الثلاثاء في ٩/ شباط ١٩٦١ ص١.

# ڕۆژنامەی خەبات و وەرگێڕان

ڕۆژنامەی خەبات هەر لەسەرەتاوە گرنگی بەوەرگێڕان داوە بەتایبەتی ئەو بابەتانەی پەیوەندی بەکێشەی کوردەووە هەبووە، لە عێراق و ئێران و تورکیاو سوریا، یان پەیوەندیان بە کۆماری عێراق و شۆڕشی ١٤ی گەلاوێژەوە هەبووە، یان بابەتەکە پەیوەندی بەبزووتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلانەوە هەبووە، وەرگێڕان بۆ ژمارە کوردییەکان لە ئینگلیزی و عەرەبییەوە زۆربەی لەلایەن برایم ئەحمەدەوە کراوە کە بۆخۆی شارەزای ئەو دوو زمانە بووەو لە کوردییشدا پاراو بووە، لە فارسیەوە بۆ کوردی عەبدولڕەحمان زەبیحی ڕۆڵی بینیوە، لەڕوسییەوە بۆ کوردی دکتۆر سەید عەزیز شەمزینی دەستێکی بالای بووە، بەڵام وەرگێڕان بۆ ژمارە عەرەبییەکان زیاتر برایم ئەحمەدو حیلمی عەلی شەریف و جەلال تالەبانی و سەید عەزیز دەستیان هەبووە.

ئەگەر سەیری ئەو نموونانەی خوارەوە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە سەرچاوەی وەرگێڕان لەکوێوە وەرگیراوە، بەڵام ناوی وەرگێر نەنووسراوە، تەنیا نووسراوە تەرجەمە: خەبات، (دەستەی نەتەوە یەکگرتووەکان و ئاشتی) نووسینی(ئەساتۆن) وەرگێڕانی خەبات ژمارە ١٤٦ هەینی ١٩٦٠/١/١٥ ل٧، وەزۆر جار لەڕۆژنامەی (ریاتازە) و (کوردستان) بابەتی لەزمانی کوردییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی، خەبات ژمارە ١٣٥، هەینی ١٩٦٠/١/١ لا پەڕە ٣، تەرجەمە (خەبات) عن جریدە کردستان، العدد ١٥٠، چوار شەممە ١٩٦٠/١/٢٠، لاپەڕە ٣.

((ڕووداوەکانی بۆن قسەکانی ئەدیناوەر بەدرۆ دەخەنەوە) نووسینی (هەرمان)، وەرگێڕانی خەبات، ژمارە ١٦٣، لاپەڕە ٣٢.

((ئابووری ئیسپانیا لەژێر حوکمی فرانکۆدا)) لە وتارێکی (جۆز ماریا کالان)، وەرگێڕانی خەبات، لە (الشؤون الدولية)[٢٢٥].

بەڵگەنامەی سەرەکی ئاشتی: غولیق، سەرچاوەی وەرگێڕانەکانی کوردیو عەرەبی لە ڕۆژنامەکانی وڵاتانی سۆسیالیستییەوە بووە.

بەو شێوەیە دەبینین خەباتی عەرەبی وەك خەباتی کوردی گرنگی بەوەرگێڕان داوە، هەواڵی دەنگوباسی لە سەرچاوەی بێگانە وەرگرتووەو وەریگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی، یان عەرەبی، هەروەها خەبات بەکوردیو بەعەرببیەکەوە بایەخی زۆری داوە بەکێشەو داخوازییەکانی خەڵکی کوردستان بەتایبەتیو خەڵکی عێراق بەگشتیو پێویستیو داخوازییە هەنوکەییەکانی خەڵکی ئەو کاتەی لەبەرچاو گرتووەو پێویستییەکانیانی بۆ بڵاوکردوونەتەوەو داوای لەبەرپرسانی حکومەت کردووە بەدەنگ خەڵکەوە بچن.

تا ژمارە ٤٦٢ بەو شێوەیە بەردەوام بووەو لە (١٩٦١/٣/٢٨) خەبات داخراوە.

دوای ئەوە گوایە (١١) ژمارەی تری بە نهێنی لەشاخ دەرچووە.

کەواتە ژمارەکانی خەبات تا ساڵی ١٩٦٤ گەیشتووەتە ٤٧٣ ژمارە.

بەڵام بەداخەوە لەو (١١) ژمارەیە، کەبە نهێنی دەرچووە هیچمان دەست نەکەوت، ڕەنگە لەسەردەمی نهێنیدا برایم ئەحمەد ئەو پەیوەندییەی بە ڕۆژنامەکەوە نەبووبێت، کە باسکردنی بۆ ئەم کتێبەی ئێمە سوودی هەبێت.

(٢٢٥) مامۆستا برایم ئەحمەدو ڕۆژنامەی خەبات نوزاد علی سلێمانی ساڵی ٢٠٠٠.

# ڕۆژنامەی خەبات بەنهێنی

لە ١٠/٢/١٩٦٤ز سەرۆکی شۆڕشی کورد مەلا مستەفای بارزانی لەگەڵ حکومەتی عێراق ڕێکەوتن و بەیاننامەیەکیان دەرکرد بۆ ئاشتی.

بارزانی داوای لە هێزی پێشمەرگە کرد کە بڵاوەی لێبکەن، چونکە حکومەت نیەتی باشەو چیتر شەڕ نابێت.

بەهەر حاڵ ڕۆژنامەی خەبات لە تشرینی دووەمی ١٩٦٤ـەوە تا ئەیلولی ساڵی ١٩٦٨ی زایینی لەلایەن بارەگای بارزانی و مەکتەبی سیاسی سەر بەبارزانی جاروبار بەنهێنی لەشاخەکانی کوردستان دەردەچوو.

لەسەر هەمان ڕیزبەند (التسلسل) دادەبەزی- واتە لە ژمارە ٤٧٤ـەوە دەست پێدەکات تا دەگاتە ژمارە ٥٠٥ .

کەواتە لایەنی بارزانی لەو ماوەیەدا (٣٢) ژمارەیان لە (خەبات) دەرکردووە.

ئەو ٣٢ ژمارە یەی ڕۆژنامەی خەبات پەیوەندی بەم باسەی ئێمەوە نییە، چونکە باسەکەی ئێمە لەسەر ڕۆژنامەگەرییە لای برایم ئەحمەدو لەو (٣٢) ژمارەیەدا برایم ئەحمەد نەدەستی هەبووەو نەئاگاشی لێی بووە، بەڵام ڕەنگە لەو ژمارانەی خەبات زۆر جنێو بە برایم ئەحمەد گوترابێ و سوکایەتی پێ کرابێ، چونکە سەردەمی دووبەرەکی هەردوو باڵەکەی پارتی بووە.

# (ڕۆژنامەی خەبات) باڵی مەکتەبی سیاسی

وتمان لە ئازاری ١٩٦١ز وە تا حوزەیران ١٩٦٤ز ١١ ژمارە لە ڕۆژنامەی خەبات لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە کە برایم ئەحمەد سکرتێری بوو دەرچووە، کەواتە ژمارەکانی خەبات بەئاشکراو نهێنییەوە تا دووبەرەکیەکەی ساڵی ١٩٦٤ز دەگاتە ٤٧٣ ژمارە کەڕاستەوخۆ لەلایەن برایم ئەحمەدو هاوکارەکانیەوە دەرچووە.

لە ساڵی ١٩٦٤ تا ساڵی ١٩٦٦ برایم ئەحمەدو مەکتەبی سیاسی لە ئێران بوون، خەبات لەلایەن ئەوانەوە دەرنەچووە.

لەمانگی شوباتی ١٩٦٦ ژمارە ٤٧٤ی خەباتیان دەرکرد، هەر لەوساڵەدا ژمارەکانی ٤٧٥، ٤٧٦، ٤٧٧ دەرکران، لەساڵی ١٩٦٧ (٥) ژمارەی تری خەباتیان بەنهێنی دەرکردو لە ساڵی ١٩٦٨ لەمانگی ئازارو حوزەیران دوو ژمارەی تری خەباتیان دەرکردووە، واتە ژمارەکانی ٤٨٣، ٤٨٤ی ڕۆژنامەی خەبات دەرچووە، بۆیە دەکرێ پێ لەسەر ئەوە داگرین کە ٤٨٤ ژمارە لە ڕۆژنامەی خەبات لەلایەن برایم ئەحمەدەوە دەرچووە.

ڕۆژنامەی خەباتی کوردستان- باڵی مەکتەبی سیاسی بەکوردی (خەباتی کوردستان) ڕۆژنامەیەکی کوردی بوو، بەنهێنی لەلایەن مەکتەبی سیاسییەوە دەردەچوو، لە شەستەکانی ڕابردوو ٧ ژمارەی لێ دەرچووە بەم شێوەیەی خوارەوە:

ژمارە (١) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، مارتی ١٩٦٦.

ژمارە (٣) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم ١٩٦٦.

ژمارە (٤) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، ئابی ١٩٦٧.

ژمارە (٥) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، ئەیلولی ١٩٦٧.
ژمارە (٦) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، تشرینی دووەم، ١٩٦٧.
ژمارە (٧) خولی دووەم، ساڵی یەکەم، شوباتی ١٩٦٨.

بەداخەوە ژمارە ٢ی خەباتی کوردستانمان دەست نەکەوت..

ڕۆژنامەکە زیاتر لەبارەی دووبەرەکی و نا کۆکی نێوان باڵی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکی شۆڕی کورد مەلا مستەفای بارزانی دەدویٚ و هێرشی زۆری تێدایە بۆ سەر شەخسی بارزانی و تاوانبارکردنی بەجۆرەها تۆمەت، بۆیە بەپێویستمان نەزانی لێرەدا چەند نموونەیەکی لیٚ وەرگرین، چونکە بیٚ سوودە بۆ ئەم باسەی ئێمە، کە باسێکی زانستییە، ئەمە جگە لەوەش ڕۆژنامەکە بەناوی برایم ئەحمەدەوە نییە. هەرچەندە ڕەنگە ناوبراو دەستی هەبووبێت لە دەرچواندنیدا..

ئیمپریالیزم عەرەبە بە خەباتی

گەلی کورد ئەترسێ

کوردستان

ژمارە (١) سالی ١ — شەممە ١٩٦١/٢/٤ ز — ١٧ رەمەزان ١٣٨٠ ك

بەبونەی دەرچونی رۆژنامەی کوردستانەوە

## جەژنمان سی جەژنــــە

خوشی خوشی لە یارانە — رابەرە بو کــورد پەرستـان
خەم لە نەنقــەرە و تارانە — ناوبشمان لێنا « کوردستـان »
چەپلەوڕێزانە و پیکەنـــین — کوردستان : ناوی لەسەروی
بو کورەی تازە و تازەنـــین — ناوانە نازداری باوانە بێ‌بیلــەی
ناوکـــی برا بە دلشــادی — چاوانە ناوانی لاوانە گــولزاری
لەســـەر نیازی ئازادی — باوانــــە شایانی پیاوانــــە
لەنەبەزین فرچـــك درا — نەخوێندنەوەی ناوانە .
لە شیری شیران تێر کــرا — سوپاس بو خوا .
بەلکەبە بو بەخت و هاتمـــان — لە خەبات کــردن نەسرەوتــین
هاوری‌بە دەگەل خــەباتمـــان — باشیادەی لە لایەوی ٨

# ڕۆژنامەی کوردستان

برایم ئەحمەد شانبەشانی ڕۆژنامەی (خەبات) ئیمتیازی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی وەرگرت بەزمانی کوردیو (خەبات)یش بەزمانی عەرەبی. (جەلال تاڵەبانی) سەرنوسەری ڕۆژنامەی کوردستان بوو. ئەم ڕۆژنامەیە تەنها (٥) پێنج ژمارەی لێ دەرچوو دوای ئەوە لەلایەن ڕژێمی عێراقەوە داخراو فەرمانی گرتنی برایم ئەحمەدو جەلال تاڵەبانی دەرچوو. ژمارە یەکی(١) ساڵی یەکی ڕۆژنامەی (کوردستان) لەڕۆژی شەممە ١٩٦١/٣/٤ز دەرچوو.

سەروتاری (کوردستان) برایم ئەحمەد نووسیویەتی لەژێر سەردێڕی: (ئامانجی کوردستان) دایە، کەبەم شێوەیەی خوارەوە دەدوێ:

((خوێندەواری بەڕێز، خۆم زۆر بەبەختیار ئەزانم کەوا ڕۆژنامەی کوردستان پێشکەش ئەکەین، هیوامان هەیە بەیارمەتی ئێوەو پشتیوانی خوا بتوانێت هەتاماوە دەربڕی داخوازی کۆمەڵانی خەڵك و نیشاندەری ڕووی ڕاستەقینەی خەباتی نەتەوەکەمان و مایەی پێشخستن و هاندانی گەشەکردنی نیشتمانەکەمان بێت، لەبارەی ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتی و خوێندەوارییەوە.

دەرچوونی (کوردستان) لەم کاتە ناسکەدا کەکۆمارەکەمانی پیا تێدەپەڕێت گرنگی یەکی زۆری هەیە بەتایبەتی کەوا لەسەرێکەوەوە وڵاتەکەمان خەریکی خۆئامادەکردنە بۆ بەپیرەوەچوونی دەستورێکی

هەمیشەیی کەپەیوەندی گەل و حکومەت دەردەخات و دەسەڵاتی حکومەت و پارچەکانی پیشان بداو مافە نەتەوایەتی‌یەکانی کورد دیاری و پاسەوانی بکات.. وەلەسەرێکی کەشەوە دوژمنانی ڕژێمە دیموکراسیەکەمان، ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و نۆکەرەکانیان بەهەزارو یەك فێڵ و جۆر خەریکی ئەوەن کەئەو شوێنانەی لەدەستیان چووبوو تازووە داگیری‌بکەنەوە و گەلەکەمان لەبەری شۆڕشە پیرۆزەکەی بێبەش بکەن. کەمافە دیموکراتیەکانی گەل و مافەکانی نەتەوایەتی کورد نۆبەرەو شابەری بوون. جابەهیواین کە(کوردستان) بتوانێت شانبەشانی (خەبات)ی هەڤاڵی نازداری و پێبەپێی ڕۆژنامە دیموکراتی‌یە کوردستانی‌یەکانی تر لەخەباتی سەخت و مەردانەی گەلەکەماندا دژی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و بۆ چەسپاندن و گەشەپێکردنی دەسکەوتەکانی شۆڕشە دیموکراتی‌یە ئازادی خوازەکەمان پێشڕەوی خۆی سەربەرزانەو جوامێرانە بەجێبهێنێت.. تائیتر دەست لەدەست و هێز لەگەل و پشتیوانی لەخوا))[١٢١]

مانشێتی ژمارە یەکی ڕۆژنامەی (کوردستان) بەخەتێکی درشت نووسراوە:

(ئیمپریالیزم عەرەب بەخەباتی گەلی کورد ئەترسێنێ).

لەسووچی لای چەپی لاپەڕەیەکی هەمان ژمارەدا بەبۆنەی دەرچوونی ڕۆژنامەی (کوردستان)ەوە، ئەم شیعرەی خوارەوە نووسراوە.

*جەژنمان سێ جەژنە*

*خۆشی خۆشی لەیارانە*

*خەم لەئەنقەرەو تارانە*

---

[١٢١] کوردستان ژمارە (١)- ١٩٦١/٣/٤ز، لاپەڕە (١).

*چەپڵە ڕێزانەو پێکەنین*

*بۆکۆرپەی تازەو نازەنین*

*ئاوکی برا بەدڵشادی*

*لەسەر نیازی ئازادی*

*لەنەبەزین فرچك درا*

*لەشیری شێران تێرکرا*

*بەڵگەیە بۆ بەخت و هاتمان*

*هاوڕێیە دەگەڵ (خەباتمان)*

*ڕابەرە بۆکورد پەرستان*

*ناویشمان لێنا کوردستان.*

تاد......................

ژمارەی دووی (کوردستان) ڕۆژی شەممە ١٩٦١/٣/١١ز دەرچووەو بەم مانشێتە ڕازاوەتەوە[١٢٢].

((لابردنی حوکمی عورفی پێویستی‌یەکی نیشتمانی‌یە)).

ژمارە (٣)ی (کوردستان) ڕۆژی شەممە ١٩٦١/٣/١٨ز دەرچووەو بەمانشێتی: (پارێزگاری هەقە نەتەوایەتی‌یەکانی گەلی کورد یەکێتی نیشتمانی بەهێز ئەکا[١٢٣]).

---

[١٢٢] کوردستان ژمارە (٢)- ١٩٦١/٣/١١ز، لاپەڕە (١).

[١٢٣] ڕۆژنامەی کوردستان ژمارە (٣)، شەممە ١٩٦١/٣/١٨ز، لاپەڕە (١).

لەسەر ووتارەکەیدا هاتووە: ((پارتی دیموکراتی کوردستان پەچە دائەماڵێ لەڕووی ڕەشی پیلانە گڵاوەکەی ئیمپریالیزم و دەرەبەگە خائینەکانی زۆڵە کورد))

ژمارە (٤) ی کوردستان (١٩٦١/٣/٢٥ن) دەرچووەو ئەم مانشێتەی خوارەوەی بۆدانراوە[١٢٤]:

(کوردە پیرۆز بێت جەژنی نەورۆزت- نەبەزی لەرێی سەربەرزی هۆزت)

ژمارە (٥)ی (کوردستان) لە ١٩٦١/٤/١ز بەمانشێتی:

(کورد لەداواکردنی مافی نەتەوایەتی و ئازادی و دیموکراتی واز ناهێنێ[١٢٥] )

ئیتر دوای ئەوە ڕۆژنامەکە داخراوە لەلایەن حکومەتی قاسمەوە فەرمانی گرتنی سەرنووسەرو خاوەن ئیمتیازەکەی دەرچووە...

(١٢٤) ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە (٤)، شەممە ١٩٦١/٣/٢٥ز، لاپەڕە (١).

(١٢٥) ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە (٥)، شەممە ١٩٦١/٤/١ز، لاپەڕە (١).

چریکەی کوردستان

گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە

ژمارە (٤) کانوونی یەکەم: ١٩٨١

Svartahaf
Ankara
Tyrkland
Sovétríkin
Baku
Kaspíahaf
Miðjarðarhaf
Sýrland
Bagdad
Teheran
Jórdanía
Írak
Íran
Saudi - Arabia
Kúrdar

# ڕۆژنامەگەری

## (٣)

## گۆڤاری (چریکەی کوردستان) و (صرخة کردستان)..

### گۆڤاری (چریکەی کوردستان)

برایم ئەحمەد بە ئاوارەیی لە ئینگلستان گیرسایەوە و.. دەستی کرد بە خەباتی دبلۆماسی و سیاسی و فەرهەنگی و ڕۆژنامەگەری.. تەمەنی لە شەست و سێ ساڵی تێپەڕی بوو، ئەزموونێکی دوور و درێژی هەبوو لەگەڵ بزوتنەوەی کوردایەتی، بەڵام باری نالەباری ئەو سەردەمە و ناتفاقی ناو ماڵی کورد ئەمی کارکەنار خستبوو ئەگینا ئەگەر ڕێگای پێبدرایە و ئاستەنگیان لە پێش دانەنایە، پێم وایە ئەو هۆشمەندو دەروێشەی کوردایەتی‌یە دەیتوانی ڕێ و شوێنی گونجاو دابڕێژێ بەرامبەر پیلانی شوومی جەزائیر، بەڵام دیارە ڕێگای پێنەدراوە..؟!.

## عەلی هەژار دەڵێ...[126]

[126] شەهید عەلی عبدوڵڵا عەوێنەیی ناسراو بە (عەلی هەژار) مامۆستای سەرەتایی و لە بنەماڵەیەکی زۆر هەژار و دەسکورت بوو، ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لە دوای بەیاننامەی یازدەی ئادار کۆلێژی یاسایی لە بەغدا تەواوکرد، تێکۆشەرێکی دەسپاك و لە بیروباوەڕدا پێشکەوتن خوازبوو، هاوڕێ نزیکی نووسەری ئەم باسە بوو، دوای کارەساتی هەرەسی ١٩٧٥ئەز ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوەی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان بوو.. بۆ نووسەری ئەم باسەی گێڕایەوە و گووتی:

((دوای رێکەوتننامەی جەزائیر کە مەلا مستەفا و دکتۆر محمود لە تاران گەڕانەوە لە دوایان ناردین بە ئامادەبوونی هەموو سەرکردایەتی پارتی سەرۆك بارزانی وەزعەکەی بۆ باس کردین.. کە ئەوە پیلانێکی نێودەوڵەتی گەورەیە لە دژی میللەتی کورد ئەنجام دراوە و عێراق و ئێران رێکەوتوون و ئێمەش هیچ چارەمان نییە و دەبێ کۆتایی بە شۆڕش بێنین، ئەوەی ئارەزووی هەیە بێتە ئێران ئەوە با لەگەڵ ئێمە بێت و حکومەتی ئێران دابەشیان دەکات بەسەر شارەکاندا و ئەوەی ئارەزووی هەیە بچێتەوە عێراق ئازادە و دیارە قەدەری کورد وابووە و خوا ئەو کارەساتەی بەسەر هێناوین.)) دەڵێت لەو کاتەدا براهیم ئەحمەد و عەلی عەسکەریش هاتن، دیاربوو مەلا مستەفا لەدوای ئەوانیشی ناردبوو.. دوای کەمێك بێ دەنگی مەلا مستەفا رووی قسەی لە برایم ئەحمەد کرد و گوتی برایم چ بکەین باشە؟!. دەڵێ برایم ئەحمەد گووتی ((جەنابی مەلا مستەفا ئەگەر بە گوێی من دەکەن من ناڵێم ئەوەی ماڵی شۆڕشە و لەبەر دەستی ئێوەدایە بەڵکو دەڵێم ئەوەی خوا بە ئێوەی داوە زەکاتی شەرعی لێبدەنە ژمارەی ٥٠٠ تا ١٠٠٠ پێشمەرگە کە من دەتوانم بۆت دابین بکەم لەو شاخانە نە تەسلیم بە ئێران و نە تەسلیم بە عێراق بن شەڕی پارتیزانی بکەن و گورز لە دوژمن بوەشێنن بۆ ماوەی شەش مانگ تا ساڵێك ئەو رێکەوتنەی جەزائیر پووچەڵ دەبێتەوە و عێراقیش و ئێرانیش مەمنون دەبن ئێمە قسەیان لەگەڵ بکەین.. ئەگەر ئەو ئەنجامە باشە بوو کە من دڵنیام دەبێت ئەوە هەر خۆت رابەری بێ موونافیسی میللەتی کوردی خۆ ئەگەر ئەو چەند مەفرەزەیەش تیا چوون ئەوە جەنابتان خۆتانی لێبە خاوەن مەکەن و ئێوەش وەکو خەڵکی تر چیان پێدەڵێن بڵێن.))، دەڵێ چەند دەقیقەیەك کۆڕەکە هەموو بێدەنگ بوو کەس قسەی

دیارە دوای کارەساتی هەرەس برایم ئەحمەد بەماڵەوە چۆتە تاران و لەوێوە بەرەو ئینگلیستان رۆیشتووە.. لە ١٩٧٥/٦/١ز یەکێتی نیشتمانی‌ی کوردستان دامەزراوە، لە ١٩٧٦/٦/١ز بڕیاری شۆڕش دراوە لەلایەن یەکێتی نیشتمانی‌یەوە (قیادە موقەتەش) دەڵێن ئێمە لە ١٩٧٦/٥/٢٦ بڕیاری شۆڕشمان داوە دیارە بە قسەی ئەوان چوار رۆژ پێش یەکێتی جاڕی شۆڕشیان دابێت..

بە هەر حاڵ ئەوەی راستەو ناشاردرێتەوە و هەموو خەڵك دەیزانێ و بەڵگەنەویستە.. عەلی عەسکەری و عومەر دەبابە و سید کاکەو قادر مستەفا

---

نەکرد و مەلا مستەفا قومێ لە جگەرەکەی داداو هاتە گۆو فەرمووی ((برایم ئەوە ناکرێت ئێران لێمان قبوڵ ناکات و ئێمە خاوخێزانێکی زۆرمان بەسەرەوەیە.)).

برایم ئەحمەد گوتی ((جەناب ئێوە خۆتانی لێ بەخاوەن مەکەن و بڵێن ئێمە ئاگامان لێ‌نی‌یە.)).

مەلا مستەفا گوتی ((برایم ناکرێت و من وەعدەم بە ئێران (شاه) داوە تا یەك چەکدار لە خاکی کوردستانی عێراق بمێنێت من ناچمە دیوی ئێران و دەبێ هەموو چەکەکان لە سنوور فڕێ بدەن و ئاودیوی ئێران بن ئەگەر نا بە عێراق و بە ئێران لێمان دەدەن.)).

برایم ئەحمەد گوتی ((کەواتە مەلا مستەفا ئۆباڵی ئەم میللەتە لە ئەستۆی ئێوەدایە..)).

مەلا مستەفا گوتی ((برایم ئەوەی لە توانامدا بوو کردم و گەیشتمە ئەو ئەنجامە و هیچ مەجالی تری تێدانی‌یە.)).

بە قسەی شەهید (عەلی هەژار) دوای ئەو گفتوگۆیە بڵاوەیان لێکردووە و هەر کەسە خەریکی خۆی و ماڵ و منداڵی خۆی بووە و دەڵێت ((وەزعەکەم وەکو رۆژی قیامەت دەهاتە بەرچاو، کەس ئاگای لە کەس نەبوو، هەر کەسە غەمی خۆی بوو، رۆژی رەش و نائومێدی کوردستانی داگرتبۆوە)).. دەڵێت کە چووینە دیوی ئێران لەگەڵ عەلی عەسکەری و دکتۆر خالد و رەسول مامەندو سەید کاکەو قادر مستەفا رێکەوتین بێینەوە کوردستانی عێراق و بزوتنەوەی سۆسیالیستیمان دامەزراند..

و ڕەسول مامەند و دکتۆر خالد لە مانگی مایسی ١٩٧٦ لە خوارووی عێراقەوە بە ماڵ و منداڵەوە بەرە و کوردستان هاتن و روویان کردە شاخەکانی کوردستان بە تەنسیق لەگەل کادر و پێشمەرگەکانی یەکێتی کە لە سوریا بوون و لە ڕێگای تورکیاوە ئەوانیش گەیشتنە کوردستان و لە ١٩٧٦/٦/١ بەیانی دەسپێکردنی شۆڕشیان دەرکرد.

برایم ئەحمەد نامەی بۆ سەرکردایەتی یەکێتی ناردووە و داوای لێکردوون ڕێگای بدەن بێتەوە کوردستان و بەشداری لە شۆڕشدا بکات[١٢٧].

هەرچەندە وەڵامی سەرکردایەتی یەکێتی سەلبی بووە بە بیانووی ئەوەی جێگاو بارەگای جێگیریان نەبووە و بۆ تەمەنی ئەم پێشمەرگایەتی گەڕۆك ناگونجێ..!!

بەڵام برایم ئەحمەد لە خەبات سارد نەبۆتەوە لە هەندەران بەردەوام خەریکی کاری دیپلۆماسی و سیاسی و فەرهەنگی بووە، بیری لەوە کردۆتەوە بە چ ڕێگایەکی تر دەتوانێ ئەرکی پیرۆزی نیشتمانی و نەتەوەیی بەجێبگەیەنێ، بۆیە دەبینین لە ساڵی ١٩٧٩ز ەوە بڕیاری داوە گۆڤارێك دەربکات لە لەندەن بە ناوی (چریکەی کوردستان)ەوە بۆ ئەوەی لە ڕێگای ئەو گۆڤارەوە بە هاوکاری چەند دۆست و برادەرێکی وەك تۆفیق وەهبی بەگ و محەمەد ڕەسوڵ هاوارو دکتۆر کەمال فوئادو کەمال میراودەلی و چەند کەسێکی تر، وە بە ڕەنجی تایبەتی خۆی و لەسەر حیسابی خۆی ئەو پرۆژەیە جێبەجێبکات، ئەوە بوو یەکەم ژمارەی چریکە کە بە کوردی دەرچووە لە لەندەن لە مانگی تەمموز و ئابی ١٩٧٩ز بڵاوکراوتەوە[١٢٨].

---

[١٢٧] کوردستانی نوێ ژمارە (٢١٥٤) چوارشەممە ٢٠٠٠/٥/٢٤ز ل٩ نەوشیروان مستەفا ئەمین.

[١٢٨] گۆڤاری چریکەی کوردستان ژمارە (١) تەمموز و ئابی ١٩٧٩ز لەندەن.

لەسەر بەرگەکەی نووسراوە:

((چریکەی کوردستان))

((گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە))

نەخشەی کوردستان لەسەر بەرگەکەی کێشراوە و بە ئینگلیزی ناوی وڵات و شارەکانی دەوروبەری نووسراوە، بە قەبارەی مام ناوەندی و ژمارەی لاپەڕەکانی (١٠٥) لاپەڕەیە بە تایپ چاپکراوە، لەبارەی چۆنیەتی دەرچواندنی ئەم گۆڤارەوە گەلاوێژخانی (هاوسەری) دەڵێت:

((چریکەی کوردستان کە لە هەشتاکان لە دەربەدەری و ئاوارەیی لە لەندەن دەرئەکرا، بە دەستی خۆی تایپی ئەکردو فۆتۆکۆپی ئەکردو ڕێکی ئەخست، تەنیا بۆ بەرگ تێگرتن ئەیناردە بازاڕ، هەموو ئەم کارانە هەر خۆی ئەیکرد. چونکی پارەی نەبوو لە چاپخانەکان بۆی چاپ بکەن..))[١٢٩].

لە ژمارە یەکی گۆڤاری چریکەی کوردستان ئەم بابەتانە بڵاوکراونەتەوە:

- پێشەکی و سکاڵا، دەستەی نووسەران/ برایم ئەحمەد نووسیویەتی.
- بژارکردنی زمانی کوردی، تۆفیق وەهبی بەگ.
- کورتە چیرۆکی ناوچەی سلێمانی، ج.ك.
- شۆڕشە پیرۆزەکەی گەلانی ئێران، برزوو.
- دیوانی چریکە.
- کورد لای بێگانە.

---

محمد رسول هاوار بۆ دکتۆر عیزەدین مستەفای گێڕاوەتەوە کە برایم ئەحمەد خۆی تایپ رایتەری گۆڤارەکە بووە.

[١٢٩] کوردستانی نوێ ژمارە (٢١٥٠) شەممە ٢٠٠٠/٥/٢٥ ل٣ گەلاوێژ خانی هاوسەری برایم ئەحمەد.

- فۆنیمەکانی زمانی کوردی، د.کەمال فوئاد.
- چیرۆکی ژمارە.. ب.أ.ر.

ئەمانە و گەلێك باسی خۆشی تریش ئەخوێنیتەوە[١٣٠].

بابەتەکانی ناو گۆڤارەکە زیاتر بابەتی رۆشنبیری و سیاسی و زمانەوانی و شیعری سیاسی تێدایە. لە خوێندنەوەی سەروتارەکەی کە (پێشکەش و سکالایە) و برایم ئەحمەد نووسیویەتی ئامانج و رێبازی گۆڤارەکەی بە چاکی دیاری کردووە کە رێبازی کوردایەتی‌یە.. بۆیە بە پێویستی دەزانین چەند دێڕێك لەو پێشەکیە لێرەدا تۆمار بکەین کە تیایدا هاتووە:

((خوێندەواری خۆشەویست: گومان نابەین کە لەم رۆژەدا لەسەر رووی زەمین نەتەوەیەك ببێ لە کورد زۆرلێکراوتر، چەوسێنراوتر و ئەوەندەی ئەویش پشت گوێ خراوتر بێ ناوونیشان تر بێت))[١٣١].

دوای ئەوەی باسی خاکی کوردستان و ژمارەی دانیشتوانی دەکات بە بەراورد لەگەڵ گەلانی دونیا کە نە ژمارەیان بەقەد ژمارەی کوردە و نە رووپێوی خاکیان دەیەکی رووپێوی کوردستانە، کەچی ئازادی و سەربەخۆیی تەواویان هەیە..

لە لاپەڕە چواردا دەڵێت:

((باوەڕ ناکەین هیچ کوردێکی دڵسۆز و پاك هەبێت کە ئەم حاڵە نالەبارە پڕ ئازارەی وڵات و گەلەکەی و ئەم بێ دەنگی و بێباکی و کەمتەرخەمی‌یەی دەوڵەتان و کاربەدەستان و رێکخراوە مرۆڤانەکانی جیهان بەرامبەر بەو زوڵم و زۆرەی بە ئاشکرا و بێ شەرم و ترس لە کورد ئەکرێت دڵی هەڵنەگلۆفێت و

[١٣٠] گۆڤاری چریکەی کروسدتان ژمارە (١) تەمموز و ئابی ١٩٧٩ ز لەندەن.

[١٣١] هەمان سەرچاوە..

پەژارەی نەوروژێنێت و ویژدانی ئازار نەدات و رقی هەڵنەستێت.))[132].

لەسەر ئەو بابەتە دەڕواو ئەوە شی دەکاتەوە کە رق هەڵسان و تووڕەبوون بەبێ ئەوەی رێگا و شوێن دابنرێت بۆ رزگاری و خەباتی بۆ نەکرێ هیچ سوودێکی نابێت و داوا لە کوردەکانی هەندەران دەکات کە هەوڵ و تەقەلا بدەن بۆ پشتگیری لە خەباتی رەوای گەلەکەیان و دەڵێت:

((ئەبێ هەر یەکەمان بە پێی کاروبار و دەسەلات و غیرەتی خۆی تێبکۆشێت بۆ گۆڕینی ئەم بارە نالەبارە..))[133].

هەروەها دەنووسێت:

((نابێ خۆمان هێند بەکەم بزانین و بلێین کەوا هەوڵ و تەقەلای ئێمە هیچ دادێکی گەلەکەمان نادات، بە پێچەوانەوە بە هۆی بلاوبوونەوەمان بە گۆشە و کەناری دنیادا ئەتوانین هەندێ فرمانی وەها بۆ گەل و نیشتمانەکەمان بەجێ بهێنین کە ئەگەر نەختێك دەماخ بسوتێنین، رەنگە بە ئێمە لە هەموو کەسێکی کە چاکتر بکرێت..))[134].

لە کۆتاییشدا پێشنیازی سێ خاڵی کردووە بۆ ئەو کوردانەی لە هەندەران دەژین، خاڵەکانیش ئەوانەی خوارەوەن:

١- پەیوەندیەکی گورج و گۆڵ و توند و تۆڵ لەگەڵ هێزە خەباتکەرەکانی کوردستان و کۆمەڵانی خەڵك لە وڵات بۆ ئەوەی گۆڤارەکەمان ببێت بە سەرچاوەیەکی بەرێز و باوەڕپێکراوو قسە رەوا لەبارەی دەنگوباس و کاروبار و رووداوەکانی کوردستانەوە بە شێوەیەکی گشتی..)).

---

[132] گۆڤاری چرکیەی کرودستان ژمارە (١) تەمموز و ئابی ١٩٧٩ ز ل٣.

[133] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[134] هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٢- پەیوەندی‌یەکی هاوڕێیانە و هاوخەباتانە لەگەڵ پارتی و بەرەو ڕێکخراوە دیموکراتی و نیشتمانی و شۆڕشگێڕو ئازادیخواز و پێشکەوتنخوازەکان کە هاودوژمن و هاوڕێمانن و ئامادەیی پیشان ئەدەن بۆ هاریکاری و پشتی یەکگرتن لەسەر بناغەی یەکسانی و وەك یەکی..

٣- پەیوەندی لەگەڵ دامەزراوە ڕۆشنبیری‌یەکان لە دەرەوەی وڵات بۆ ناساندنی زمان و ئەدەب و مێژووی گەلەکەمان پێیان و ڕوونکردنەوەی باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بۆیان و سەرنج ڕاکێشانیان بۆ باری سەخت و ئاڵۆز و ناخۆشی ڕۆشنبیری و خوێندەواری لە کرودستان.. تا..

گەر بێت و بە دید و نیگای لێکۆڵینەوە سەرنجی ئەو چەند لاپەڕەیە بدەین کە بۆ پێشەکی و سکاڵای گۆڤارەکە نووسراون بە چاکی دیارە کە ڕەوتی گۆڤارەکە بە چ ئاقار و بەبارێکدا گوزەر دەکا، کە ئەویش بریتیە لە هەوڵێکی بوێرانە و بە عەزم و ئیرادەیەکی بەهێز و بڕوا بە خۆبوون لە گەیاندنی پەیامی کوردایەتی بە دنیای دەرەوەی کۆمەك و پشتیوانی پەیداکردن بۆ بزوتنەوەی کوردایەتی و یەکخستنی توانای ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد لە هەندەران و پەیوەندی کردن بە پارت و گروپە سیاسی‌یەکانی کوردستانەوە و دەنگوباس و ئیلهام وەرگرتن لە هێزە سیاسیەکان و ڕۆشنبیرەکانی ناو وڵات و گەیاندنی دەنگی ناڕەزایی خەڵکی کوردستان لە دژی داگیرکەرانی وڵاتەکەمان... هەر لەو پێشەکیەدا دەڵێت:

((چینی‌یەکان دەڵێن بۆ بڕینی دەهەزار میل بە یەك هەنگاو دەس پێدەکات.)) کەواتە بۆ گەیشتن بەو ئامانجانەی باسکران پێویستیمان بە سەبری ئینقلابی هەیە و هەنگاوی یەکەم لە بڵاوکردنەوەی گۆڤاری چریکەی کوردستانەوە لە هەندەران دەس پێدەکات و ئینجا ڕێکخستن و یەکخستنی

تواناکان لە دەرەوە و پەیوەندی کردن بە رێکخراوو گروپ و پارت و دەوڵەتەکان بۆ ناساندنی عەدالەتی مەسەلەی کورد بەوان..

لە لاپەڕە (١١)ی ژمارە یەکدا وتارێکی پڕ بایەخی زانای کورد تۆفیق وەهبی بەگ بڵاوکردۆتەوە لە ژێر سەرناوی ((بژارکردنی زمانی کوردی)) ئەم ووتارە (٨)لاپەڕەی داگیرکردووە و تیایدا هاتووە:

((لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە وەنەبێ زمانی کوردی لە مەیدانی نووسینا بێکەڵك و توانا بێت، بەڵام گومان لەوەشدا نی‌یە کە ووشەی کۆن هەمیشە دادي گشت ئەو پێویستیانە نادا کەوا پێشکەوتنی عیلم و هونەر و سەنعەت هێناویانەتە کایەوە...[١٣٥]

لاپەڕە (١٩) تایبەتە بە ((کورتە مێژوویەکی ناوچەی سلێمانی)) باس لە پاشماوەی ئەو ئادەمیزادانە دەکات کە لە ئەشکەوتەکانی هەزارمێرد و سورداش دۆزراونەتەوە وای دەرئەخەن کە لە پەنجا هەزار ساڵەوە پێش ئێستا لەم ناوچەیە ئادەمیزاد ژیاوە، ئینجا باسی سەرکەوتنی پاشای (ئەکەد) (نارم سین) دەکات بەسەر گۆتی و لولووەکاندا لە ٢٣٠٠ ساڵ پ.ز.

هەروەها دەڵێت ئەو ناوچەیەی کە ئەمڕۆ پێی ئەوترێت (پارێزگای سلێمانی) لەسەردەمی ئاشووری‌یەکاندا پێی وتراوە (زامۆئا) و بەشێك بووە لە وڵاتی ئاشوور، دواتر لەلایەن سوپای ئیسلامەوە داگیرکراوە تا ساڵی (١٦٣٩)ز لە لایەن ئێران و عوسمانیەکانیەوە دابەشکراوە و لە کۆتایی سەدەی یانزەهەمدا ئیمارەتی بابانەکان دامەزراوە، لە ساڵی ١٦٦٥ز فەقێ ئەحمەدی دارشمانە دوا بنەماڵەی بابانیەکانی دامەزراندۆتەوە، لە ساڵی ١٨٥١ز کۆتایی بە دەسەڵاتی بابانەکان هاتووە و یەکەم موتەسەرفی

---

[١٣٥] چریکەی کوردستان ژمارە (١) تەمموز و ئابی ١٩٧٩ز ل ١٤ تۆفیق وەهبی بەگ.

عوسمانیەکان بە ناوی (ئیسماعیل پاشا) ناوێك دانراوە تا ساڵی ١٩١٨ز ئینگلیزەکان هاتوون سلێمانیان داگیرکردووە. خۆشترین شت لەم باسەدا پارچە شیعرێکی (نابینایی)یەکی تیا بڵاوکراوەتەوە دەربارەی شەڕی جیهانی یەکەم و باری نالەباری شاری سلێمانیمان بۆ دەکات کە ئەفسەر و سەربازەکانی تورك کەتوونەتە تاڵان کردن و دەست بەسەراگرتنی ئازووقەو خواردەمەنی خەڵك و هەزاران لاوی کوردیان گرتووە و رەوانەی بەرەی شەڕیان کردوون بە ناوی غەزاوە..

لە شیعرەکەدا هاتووە:[١٣٦]

*دنیا پڕی ئاشووبە خەلایق بە عمومی*
*ئاسایشی لێمەنعە ئەڵێی جونبوشی ئاوە*
*وەك تەرزە ئەبارێ بە هەموو دەم ئەسەف و غەم*
*هەوری غەزەب و قەهری خودا توند و بەتاوە*
*ژەندرمە ئەسوورێتەوە وەك واشەی برسی*
*بۆ لاشەی میللەت بە فرۆفێڵی غەزاوە*
*فەوتاوە لەبەر سوغرە کەرو ئێستر و تابو*
*حوشتر سەقەت و شەل بووە گا پشتی شکاوە*
*کەر شەوقی زەڕینی نیە حەتتا لە بەهارا*
*ترسی هەیە نەك بیخەنە ژێر باری قەزاوە*
*هەر شەش جهەتی گرتووە ئاشوب و موصیبەت*
*مێشولە مەجالی نیە بفڕێ بە هەواوە..*

---

[١٣٦] لە دکۆتر عیزەدین مستەفا رەسولم بیستووە کە شیعری (مەلا حەمدون)ە نووسەر.

ئەم شیعرە جوانە کە لەو سەردەمەدا گوتراوە وێنەیەکی کوت و موتی ئەو سەردەمەی شاری سلێمانی و دەوروبەری کێشاوە کە خەڵك لە چ دۆخێکی نالەباردا ژیاون بە دەست جەندرمەی تورکەوە..

((فۆنیمەکانی زمانی کوردی)) بابەتێکی تری ناو چریکەیە لە لاپەڕە ٥٧ تا لاپەڕە ٧١ی داگیر کردووە، بابەتێکی بە پێزوو چڕوپڕی زمانەوانیە و لە فۆنیمەکانی زمانی کوردی دەدوێ.

لە کۆتایی باسەکەدا هاتووە ماویەتی و لە ژێرەوە بەم بەیتە شیعرە کۆتایی بە لاپەڕە ٧١ هاتووە:

*((نرکەی راپەڕین دڵی بزواندم*

*گڕی ئازادی جەرگی سووتاندم))*

چیرۆکی ژمارە لە ژێر سەرناوی (باوك و کوڕ) دایە لە لاپەڕە ٧٢ ەوە دەست پێدەکات تا لاپەڕەی ٨٤ی گۆڤارەکەی داگیرکردووە، وە لە پێشەکی چیرۆکەکەدا هاتووە:

((ئەم چیرۆکە، ئەو دەسکارەیە کەمەی لێدەرچێ کە نووسینەوە پێویستی کردووە، رووداوێکی راستەقینەی قارەمانیەتی تۆمار نەکراوی جەماوەری کوردستانە..)).

(ب.أ.ر) واتە بلەی ئەحە رەش نووسیویەتی

چیرۆکەکە لەوە دەدوێ لاوێکی کورد (پ.م)ی کوردستان بووە لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلول بە ناوی (حەسەن) حەسەنی لاو شەهید دەبێ و تەرمەکەی دەکەوێتە دەستی دوژمنی داگیرکەر و دەیبەنەوە شاری سلێمانی و تەرمەکەی دەخەنە دوای زیلێکی عەسکەری تا هەپرون بە هەپرون دەبێت بۆ چاو شکاندنی خەڵکی کوردستان، دوای چەند رۆژێك باوکی شەهید حەسەن کوڕە گچکەکەی کە ناوی (حوسین)ە لەگەڵ خۆی دەباتە هەمان

بنکـەی پێشـمەرگایەتی کـە حەسـەنی کـوڕی لێبـووە و لەبـەر لێپرسـراوی بنکەکـە دەپارێتـەوە حوسـینی بـۆ بکەنـە پێشـمەرگە لـەجیاتی حەسـەن و تفەنگەکەی حەسـەنی بدەنـە حوسین بۆ ئـەوەی جێگـای حەسـەنی شـەهید چۆڵ نەبێت.

چیرۆکەکـە لـە رووی هونـەرو تـەکنیکی هونەریـەوە سـەرکەوتووە لـە وێنەکێشانی دیمەنەکان و رەوانـی زمـان و جوانـی تـەعبیر و یـەکێتی بـیر و زنجـیرەی بەیەکـەوە بەسـتراوی رووداوەکـەوە.. لـە رووی ناوەڕۆکـەوە چیرۆکێکی سیاسی و نەتەوایەتی و نیشتمانیە و عەزم و ئیرادەی خـەڵکی کوردسـتان پیشـان دەدا بـۆ سـەپاندنی داخوازیـیە رەواکـانی خـەڵکی کوردستان بەسەر داگیرکەرانی کوردستاندا.

بە شێوەیەکی گشتی گۆڤاری چریکەی کوردستان گۆڤارێکی سەرکەوتوو پێشـکەوتووە و کـەلێنێکی باشـی پڕکردۆتـەوە لـە بـواری رۆژنامەگـەریی کوردیدا بۆ خزمەتی ئەدەب و زمان و مێژوو و رۆشنبیری و باری رامیاری کوردەواری، گۆڤارەکە بە هەوڵ و توانای برایم ئەحمەد خۆی و هاوکارەکانی دەرچووە و بابەتـەکانی بـە دەسـتی خـۆی تـایپی کـردووە و پـارەی خـۆی لێخەرج کردووە، وە بەسەر رۆشنبیرانی هـەندەرانی بڵاوکردۆتەوە تا ساڵی ١٩٨٥ز (٩) نـۆ ژمـارەی لێچـاپ و بڵاوکردۆتـەوە لەگـەڵ (٥) پێنـج ژمـارەی پاشکۆی عەرەبی..

## ژمارە دووی چریکەی کوردستان[137]

بەهەمان قەوارە و رەنگ و نەخشەوە لە ساڵی ۱۹۸۰ز دەرچووە و ئەم بابەتانەی تیا بڵاوکراوەتەوە:

- لەماوەی دوو چریکەدا ل۱.
- گرتنی فەرمانبەرانی سەفارەتی ئەمریکا ل۲.
- هەرای ئەفغانستان ل٦.
- سادات و بیگن ل۹۳.
- کوردستانی ئێران ل۹۷.
- کوردستانی عێراق ل۱۰۷.
- مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان ل۱۲.
- دیوانی چریکە ل۲۱.
- مافی چارەنووسی نەتەوەی کورد، دکتۆر ع. قاسملۆ ل۳۵.
- فۆنیمەکانی زمانی کوردی.
- بڕیارێکی کورت، نووسینی غەسان کەنەفانی.
- کورد لای بێگانە.
- پرسەی شەهید، چیرۆکی ژمارەیە نووسینی ب.أ.ر.
- کورد و هەرای عێراق و ئێران، نووسینی ك.ش.ل۱۱۱.

لەو ژمارەیەدا وتارێکی پڕ سوود لە ژێر سەرناوی (مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان)دا بڵاوکراوەتەوە و تیایدا هاتووە: *The right of nations to self determination*

((مافی دیاریکردنی چارەنووسی – خۆ لەلایەن نەتەوەکانەوە)) واتە مافی ئەوەی کە هەموو نەتەوەیەك بتوانێ بە سەربەستی و بەبێ هیچ دەست

[137] چریکەی کوردستان ژمارە (۲) ساڵی ۱۹۸۰ز.

تێخستنێکی بێگانە دواڕۆژی سیاسی و ئابووری خۆی دیاری بکات، هەرچەندە وەك سەرەتایەکی فەلسەفی و سیاسی ئەگەڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەرەنسە ١٧٨٩-١٧٩٩ز کەوا هەر لە هەڵگیرسانیەوە ئامادەیی خۆی دەردەبڕیٚ بۆ دەسگرتن و یارمەتی دانی ئەو گەلانەی ئەیانەوێت چارەنووسی خۆیان بگرنە دەست و ئازادی لێسەندراویان وەربگرنەوە، لەگەڵ ئەمەشدا سەرەتا (المبدأ-Principle) کە زۆرتری لە خانەی تیۆریەکی (نظرية) فەلسەفیدا مایەوە...

هەتتا لەناوەندی سەدەی نۆزدەوە ديموكراتە ئەنتەرناشناڵەكان كرديان بە يەكێ لە ئامانجەكانی خۆیان، وە لە ساڵی ١٨٩٦زدا كۆنگرەسی سۆشیال ئەنتەرناشناڵەكان لە لەندەن بڕیاریدا كەوا خەبات بكەن بۆ مافی تەواوی هەموو نەتەوەكان لە دیاریكردنی چارەنووسی خۆیاندا))[١٣٨].

بۆ جاری يەكەم لە ساڵی ١٩١٨ز (لويد جۆرج) سەرەك وەزيرانی بەريتانیای گەورە لە كۆنگرەسی يەكێتی كرێكاراندا داوای كرد ((حكومەت بە ڕەزای ئەوانەی حوكم ئەكرێن و دیاریكردنی چارەنووس لە لایەن خۆیانەوە چار بكرێت)) بە نیسبەت دواڕۆژی وڵاتانی ژێر دەستەوە...

هەروەها سەرۆكی ئەمريكا (وودرو ويلسن) لە ١٩١٨/١/٨ز دا باسی دیاریكردنی چارەنووسی نەتەوەییانەی كرد.. وە لە ئابی ١٩٤١ز دا چەرچڵ و ڕۆزفلت لە پەیمانی ئەتلانتیدا دەستەبەر بوون كە ڕێزی مافی هەموو گەلێك بگرن لە هەڵبژاردنی چەشنی ئەو حكومەتەدا كە ئەیانەوێ.

[١٣٨] چريكەی كوردستان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٨٠ز ل١٢.

لە ١٩٤٥/٦/٢٦ز ستالین و چەرچڵ و ڕۆزفلت لە کۆنفرانسی (سان فرانسیسکۆدا) ئەو بڕیارەی پەیمانی ئەتلانتی‌یان کردە بەردی بناغە بۆ پەیمانی نەتەوەیەکگرتووەکان و ئیمزایان کرد..[١٣٩]

ئەم باسە هەرچەندە دوور و درێژە و لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا زۆر پەسەندی باسی درێژناکەن، بەڵام لەبەر گرنگی باسەکەو پەیوەندیی بە گەلی کوردەوە بە ناچاری دەبوایە ئەوەندەی لێوەربگرین، ئەگەر نا باسەکەمان پچڕپچڕدەبوو مەبەستی نەدەدا بە دەستەوە.

لە نووسینەکەدا نووسەر گەڕاوەتەوە بۆ سەرچاوە مێژوویەکەی باسەکە و کێشەی نەتەوەکان لە چەرخی هەژدە و نۆزدەدا ئینجا بڕیاری کۆمەڵەی گەلان دوای شەڕی گێتی یەکەم و دواتر کۆمەڵەی نەتەوەیەکگرتووەکان دوای شەڕی گەورەی جیهانی دووەم، وە لێرەدا بە پێی یاسای نێودەوڵەتی گەلی کوردیش مافی چارەی خۆنووسینی هەیە و نووسەر دەیەوێت خوێندەواری چریکە لەو بارەیەوە ئاگاداربکاتەوە کە پێویستە لەمەودوا کورد خەبات بۆ چارەی خۆنووسین بکات لە جیاتی حوکمی زاتی، ئێمە پێمان وایە خوێندنەوەی ئەو ووتارە زەرووری بۆ هەموو سیاسی و ڕۆشنبیرێکی کورد، چونکە شارەزابوون بە یاساکانی نێونەتەوەیی فاکتەرێکی گرنگە بۆ شێوەی داخوازیەکانمان، کە وەکو بەڵگەنامە پشتی پێ‌ببەستین.

بابەتێکی تری ئەو ژمارەیە ((مافی دیاری‌کردنی چارەنووسی نەتەوەکان و مەسەلەی کورد))ە.

[١٣٩] چریکەی کوردستان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٨٠ز ل١٢.

لە کتێبی (کوردستان و کورد)ی دکتۆر عبدالرحمن قاسملۆ وەرگیراوە لە لاپەڕە ٣٥ تا لاپەڕە ٥١ گۆڤارەکەی گرتۆتەخۆ، باسێکی بە پێزە و بۆ خوێندەوارانی کورد زۆر پێویستە، دەیان بەڵگەی زانستی تێدایە و بەپەرچ دانەوەی هەندێ وشکە مارکسی‌یە کە پێیان وایە کورد ئوممە نی‌یە، بەڵگەکان لەسەرچاوەکانی مارکس و لینین و ئینگلس وەرگیراوە، ئیسباتی مافی سەربەخۆبوونی کورد دەکەن.

وە هەر لەسەر بابەتی سەربەخۆیی نەتەوەوە پارچە شیعرێکی محمد رەسوڵ هاواری بڵاوکردۆتەوە لە ژێر سەرناوی ((ئەو نەتەوەیەی)) [١٤٠+٢]:

*((ئەو نەتەوەیەی تا ئێستا وەك شێر*

*لەم ناوخاکەدا ژیابێ وەك نێر*

*بەرامبەر چەرخی چەواشەی زۆردار*

*بەرامبەر هەڵپەی دوشمنی خوێن خوار*

...تا)).

شیعرێکی نیشتمانی و نەتەوەیی‌یە، هەر چەندە لە ڕووی هونەری و تەکنیکەوە تازە نی‌یە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆکەوە باشە، باسی خۆڕاگری نەتەوەی کورد دەکات بەرامبەر سیاسەتی توانەوە و لە ناوبردن و قڕکردنی کورد و دەڵێت ئێمە خاوەنی ئەو کێوە بەرزو هەستە پاکە بین و تا ئێستا زمانەکەی خۆمان پاراستووە، بۆیە هێز نی‌یە لەسەر زەمین بتوانێ لەناومان بەرێ..

چیرۆکی ژمارە دووی چریکەی کوردستان بە عنوانی ((پرسەی شەهیدە)) لە نووسینی ب.أ.ر. واتە بلەی ئەحە ڕەش.. کە برایم ئەحمەد

---

[١٤٠] چریکەی کوردستان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٨٠ ل ٣٢.

[٢] گۆڤاری هیوا ژمارە (٩) مارتی ١٩٥٨ز.

خۆیەتی، چیرۆکێکی راستەقینەیە و رووداوەکە هەر بە ڕاستی روویداوە هەروەکو نووسەر دەڵێت:

((رووداوەکە دەربارەی شەهید بوونی دوو پێشمەرگەی ناوچەی ئاغجەلەرە لە مە نطقە ی چەمی رێزان لەنەبەردییەکی قارەمانانەی بێوێنەدا کە دوژمنی داگیرکەریان تێکوپێك شکاندووە و ئەوانیش هەردووکیان شەهید دەبن، ناوەکانیان شێخ عەزیز و شێخ عەلیە و خەڵکی گوندی (عەودالان) بوون و کوڕی شێخ فەتاح بوون و باوکیان لە پرسەکەیان دانانیشێت نەوەك پێشمەرگە بۆ پرسەکەیان و سەرەخۆشی بچن و خەریکی داب و نەریتی کۆمەڵایەتی کوردەواری بن و لە ئەرکی پێشمەرگایەتی دوابکەون و دوژمنی داگیرکەر غافڵ گیریان بکات و زەربەیان لێبدات))[١٤١].

ژمارە سێی چریکەی کوردستان:

کە تەشرینی دووەمی ١٩٨٠ز دەرچووە، ئەم بابەتانەی خوارەوەی لە خۆ گرتووە[١٤٢]:

- لەماوەی دوو چریکەدا.. شەڕی عێراق و ئێران، دیکتاتۆری عەسکەری لە تورکیا، هەڵبژاردنی سەرەك کۆماری تازەی ئەمریکا..
- مافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان.
- کورد لای بێگانە، ئەسپێکی سێ سەری (تروادە)، گرتنی لاوانی کورد لە تورکیا..
- کورد لە کۆڕی گەلە ئازاردراوەکانا..

---

[١٤١] چریکەی کوردستان ژمارە (٢) ساڵی ١٩٨٠ز ل-٩٢.

[١٤٢] چریکەی کوردستان ژمارە (٣) تشرینی دووەم ساڵی ١٩٨٠ز.

- لــــە دیوانـــــی چریکـــــەدا.. ئـــــەم شـــــیعرانە دەخوێنیتـــــەوە: ((وون بـوون، سـکالای شـاعیرێك، مـەنوو رۆڵـە، بروسـکە سـروودێکی زامدار، رەوە تفەنگ هێلانەی سەنگەر چۆڵ ناکا، ئەی وەتەن، وەفدی کوردستان..))
- بە بۆنەی پەنجاهەمین بیرەوەری رۆژی رەشی شەشی ئەیلوولەوە..
- ئەو جەنتایەی جەنتا نەبوو!
- چریکەی سەربەستی، کورد و هـەرای عـێراق و ئـێران، دوو نامـەی هۆنراوە بۆ دوو دوژمنی گیانی بە گیانی..
- رۆژنامەی کوردستان دەورەی سێیەم ١٩١٧-١٩١٨ز.
- فۆنیمی کوردی.

لـەم ژمارەیەدا بەشی دووەمی بابەتی (مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان)ی بلاوکردۆتەوە کە لە ژمارەی پێشوو تەواوی نەکردبوو، بەڵام ئەوەی پێویستە دیاری بکرێت هەر لێرەدا لە چوارچێوەی ئەم باسەدا بڕیارێکی کۆمەڵەی دەوڵەتە عەرەبەکان (جامعة الدول العربیة) لەسەر مافی چارەی خۆنووسی تیایە کە لـە ساڵی ١٩٧٥ز بڕیاریان لەسەر داوە و بۆ کۆمەڵـەی نەتـەوە یـەککگرتووەکانیان ناردووە لـە وەڵامی رەئـی -پرسـی‌یە نامەیەکی بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەککگرتووەکان لە ١٩٧٥/٩/٢٣ کـە تیایا ئەڵێ:

((.. کۆمەڵی دەوڵەتانی عەرەب هەمیشە دانی ناوە بە مافی دیاریکردنی چارەنووسی خۆ و سەربەخۆیی هەموو گەلانی تری ژێردەستی کۆلۆنیالیزم و حوکمـی بێگانـەدا، وە یارمـەتی داون، ئەنجوومـەنی کۆمەڵەکـەش زۆر بڕیاری دەرکردووە بلاوکردۆتەوە و داوای لە هەموو دەوڵەتان کردووە کـە گشت پەیوەندی‌یەك لەگەڵ حکومەتی ئەفریقای خواروو بڕن، وە یارمەتی

مادی و مەعنەوی خۆیان بۆ بزوتنەوە ئازادیخوازەکان و خەباتی نەتەوایەتی دژی جیاوازی رەگەزی و حوکمی کەمایەتی لە ئەفریقادا، زیاتر کەن...))[١٤٣].

دیارە ئەم بڕیارەی جامعەی عەرەبی بەڵگەنامەیەکی باشە بۆ گەلی کورد لە عێراق و خوارووی سوودان و ئەمازیرەکان -بەربەر- لە باکووری ئەفریقا بۆ داواکردنی ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان لە حکومەتە عەرەبیەکانی وڵاتەکانیانی داگیرکردووە، وە ئاگادار بوونی رۆشنبیری کورد لەو بڕیارە پێویستە لەم ساتەدا..

وە هەر لەم ژمارەیەدا بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە لە ژێر سەرناوی

**ئەسپێکی سێسەری ترواده:**

**A three-headed Trojan horse**

ئەم باسە بیروبۆچوونی خەڵکی بێگانەیە بەرامبەر گەلی کورد و بەم شێوەیە باسی گەلەکەمان دەکات:

((پاریس، کلۆ، بنیادەمە لە هەزمکردن -نەهاتووەکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەو نزیکەی (٩) ملیۆن کوردەیە کە ئەگەرچی خاوەنی زمان و مێژووی جیاوازی خۆشیانن، کەچی نە دەوڵەتێکی تایبەتی خۆیانیان هەیە و نە هەرگیز بووشیانە.. نوێنەری کەمایەتێکی سەرکێشی دابەشکراون لە نێوان ئێران و عێراق و تورکیادا...))[١٤٤].

نووسەر بەم شێوەیە لەسەر کورد دەڕوا باسی جووڵانەوە و شۆڕشی هەر سێ پارچەی تورکیا و ئێران و عێراق دەکات کە چەندین شۆڕشیان بەرپاکردووە و دووجار دەوڵەتیان دامەزراندووە لە عێراق و لە ئێران بەڵام لێیان تێکدان و، کورد بەردەوامە لە خەبات و قەت دەسبەرداری مافی نەتەوایەتی خۆی نابێت و ئەو سێ دەوڵەتە ناتوانن کورد هەزم بکەن و لە

---

[١٤٣] چریکەی کوردستان ژمارە (٣) ساڵی ١٩٨٠ز ل١٧.

[١٤٤] چریکەی کوردستان ژمارە (٣) ساڵی ١٩٨٠ز ل١٨-٢٣.

چوار چێوەی خۆیاندا بیان خنکێنن چونکە کورد میللەتێکی زیندوو و هۆشیارە..

لە باسێکدا (کورد لە کۆڕی گەلە ئازاردراوەکانا) ژمارە سێ ی چریکە بابەتێکی بەپێزی بڵاوکردۆتەوە بەم شێوەیەی خوارەوە:

((کۆمەڵەی Japan Buddha Sangha کە رێکخراوێکی ئاشتی خواز و مرۆڤ دۆستە رۆژی ١٩ و ٢٠/ئابی/١٩٨٠ لە هۆڵێکی دانشگای لەندەن بە ناوی (بۆ هەڵبژاردنی ژیان)ەوە چەند کۆبوونەوەیەکی بۆ دەربڕینی دژایەتی بەرامبەر بە بۆمبای ئەتۆم و هایدرۆجینی و چەك وە پشتیوانی خەبات لە پێناوی دنیایەکی بێ شەڕو بێ چەکدا پێکهێنا بەشێکی کۆبوونەوەکان بەناوی نەهێشتنی ئازارەوە (Removal of suffering) بوو نوێنەری چەند گەلێکی ئازاردراوی دنیایی وەك رەشەکانی ئەمەریکا و خەڵکی فەلەستین و نوێنەری بزوتنەوەی دژایەتی رەگەزپەرستی و زۆری تر بانگ کرابوون، لەم کۆبوونەوەیەدا یەکێ لە دەستەی نووسەرانی چریکەی کوردستان بە ناوی کەمایەتی کوردەوە ئەم قسانەی لای خوارەوەی کرد..))[١٤٥]

## خانمان و جوامێران!

بەر لە هەموو شتێك ئەمەوێ بە دڵ سپاسی رێکخەرانی ئەم کۆبوونەوەیە بکەم کە وەکو کوردێك هەلی قسەکردنیان بۆ هەڵخستووم، ئەم جۆرە هەلە بۆ ئێمە گرنگیەکی تایبەتی هەیە و زۆر شایانی هەڵسەنگاندنە، چونکە کەمجار هەڵئەکەوێ کە ماوە بدرێت دەنگی کورد لە ناو گەلە چەوساوە و

---

[١٤٥] چریکەی کوردستان ژمارە (٣) ساڵی ١٩٨٠ ل ٢٤.

زۆرلێکراوەکاندا ببیستریّ!!، کە لە راستیدا ووشەی چەوساوە و زۆرلێکراو ئەڵێی دەقە و بە باڵای کورد بڕاوە))[146]

بەم شێوەیە قسەکەر لەسەر باسی کێشەی کورد و ئەو زوڵم و زۆرداریەی لە کورد کراوە دەڕوات و هەموو بەڵگە بۆ ئامادەبووان روون دەکاتەوە و ئەو کارەساتانەی بەسەر کورد هاتووە بە نموونە بۆیان باس دەکات و داوای یارمەتی و کۆمەك دەکات لە ئامادەبووان جا هەر جۆرە یارمەتی و کۆمەکێك بێت، مادی بێت یان مەعنەوی، تەنانەت ئەگەر قسەیەکی باشیش بێت بۆ کورد و بزوتنەوەی زۆرلێکراوی نەتەوەی کورد هەر جێگای تەقدیر و سوپاسی نەتەوەی کوردە.

دیارە نوێنەری گۆڤاری چریکەی کوردستان بابەتەکەی بە شێوەیەك مەترەح کردووە کە ئامادەبووان زۆر بەدڵیان بووە و لە بڕیاری کۆتاییدا بە گشتی بڕیاری پشتگیری خۆیان بۆ خەباتی گەلی کورد لە پێناو نەهێشتنی چەوساندنەوە و زوڵم و زۆرداری داگیرکەران دەربڕیوە.. دیارە نوێنەرەکەش هەر برایم ئەحمەد خۆی بووە.

## هەر ئەو جانتایەی جانتا نەبوو

هەر لە ژمارە سیّدا بابەتی (ئەو جانتایەی جانتا نەبووWhen a Briefcase is not a Briefcase) بڵاوکردۆتەوە، لەم ووتارەدا کە لە گۆڤاری (میدل ئیسترن کەرەنتس) وەرگیراوە و باسی تەقەلای دڕندانەی بێوێنەکەی رژێمی عێراق لە بەرلینی رۆژئاوا کراوە بۆیە هیچ خستنە سەرێکی ناویّ، مەگەر ئەوە بڵێین کە ئەو خەڵکەی کەوا لە ئەنجامی ئەم

[146] چریکەی کوردستان ژمارە (٣) ساڵی ١٩٨٠ ل ٢٤.

کرداره نامرۆڤانه و بێویژدانانەیەدا ئەکوژران نەك هەر هەمووی بێتاوان بوون، تەنیا ٨ ،٩ خوێندکاری کوردستانی عێراقیان تیا بووە، ئەوانی تر خەڵکی بەشەکانی تری کوردستان بوون، ئەمە جگە لەو چەند سەد کوڕ و کچ و منالّە بێگانانەی لە میوانخانەکە دابەزی بوون، کە رەنگە کەسیان هەر ناوی صەدامیشیان نەبیستبێ، جا هەولّدان بۆ ئەم خەڵك بە کۆمەڵ و بێتاوان کوشتنە نەك هەر جەوهەری دوژمنانەی رژێمی عێراق بەرامبەر بە مرۆڤ دەردەخا و ئەو درۆیەشیان دەردەخا کە خۆیان بە دۆستی کوردی ئێران پیشان ئەدەن و لە (خۆمەینی) داوای ئۆتۆنۆمیان بۆ ئەکەن.. مەسەلەکەش ئەوەیە حکومەتی عێراق ویستی لە (هۆڵێکی) کۆبوونەوەدا لەبەرلینی رۆژئاوا نزیکەی (٣٠٠) کورد بکوژێ، وە ئەگەر بهاتایە پیلانەکەی سەری بگرتایە لە ١٩٨٠/٨/١زدا.. کۆنگرەکە لە میوانخانەیە بوو لە (ڤیدن) کە شارێکی ئەڵمانییە و کەوتۆتە بەشی فەرەنساوە، (ئەکسا) کۆمەڵەی خوێنکارانی کوردستان لە ئەوروپا خەریکی بەستنی کۆنگرە بوو، کاربەدەستانی سەفارەتی عێراق لە بەرلینی رۆژهەلات توانیبویان کوردێکی عێراقی بە ناوی (حسەین) (ابوعەلی) لە خشتە بەرن و رازی بکەن کە بۆمبایەکیان بۆ لە هۆلّی کۆبوونەکەدا دابنێ، حسەین لەپاشا بە هاوڕی قوتابییەکانی ئەڵێ کە ئەمەی بۆیە گرتۆتە ئەستۆی خۆی کەوا پیلانەکەی (بەعس) پووچەڵ بکاتەوە، چونکە ترسی ئەوەی هەبووە کە ئەگەر ئەو نارەزایی پیشان بدایە رەنگە دیبلۆماسییەکانی عێراق بتوانن یەکێکی کە بدۆزنەوە کە کارەکەیان بۆ جێبەجێبکات، حسەین بە هاوکاری خوێندکارە کوردەکان ئاگاداری پۆلیسی کرد لە تەفاسیلی پیلانەکە و لە کاتی دانراودا بە ئۆتۆمبیلێکی (دیاملەر)ی سەفارەتی عێراق لەبەرلینی رۆژهەلات سکرتێری یەکەم (خالید جابر) لەگەڵ ئەندامێکی ستافی تەکنیکی سەفارەت

(محمودی حاجی عەلی) ناو لەگەڵ حسەین ئەبو عەلی لە کاتی وەرگرتنی جانتای بە بۆمبا چێنراو دەسگیرکران.

جا لەبەر ئەوەی تاوانبارەکان ناسنامەی دیبلۆماسیان پێبوو درانە دەست حکومەتی ئەڵمانیای رۆژهەلات بۆ ئەوەی ئیجرائاتی یاسایی وەربگرن.. بەڵام سەیر لەوەدایە حکومەتی رۆژهەلاتی ئەڵمان لەجیاتی دادگاییکردن و ئیجرائاتی سیاسی لە دژی سەفارەتی عێراقی بەیانێکی دەرکرد گووتی ئەو پیلانە بە دەستی صهیونزمەکان دارێژراوە و کۆتایی هات.

<u>لە ژمارە چواری چریکەی کوردستاندا ئەم بابەتانە نووسراوە:</u>

- لە ماوەی دوو چریکەدا، شەڕی عێراق و ئێران، کوشتنی سادات، ئەمریکا و دەوڵەتەکانی عەرەب.
- کورد لای بێگانە، لە کوردستانی ژێر دەستی تورکیادا، خاکی گوم بووی کوردستان.
- چریکەی سەربەستی، خۆجێ قات نەبوو، ئەی بۆ؟، تاقیکردنەوە تاکەی، رێگایەکی پڕ مەترسی.
- کوردستان و پرۆژەکانی ئیمپریالیزم، یادی شەشی ئەیلولی ۱۹۳۰ز سلێمانی.
- بۆچی ئۆتۆنۆمی؟، مافی دیاریکردنی چارەنووس.
- دیوانی چریکە، قوربانیەکانی نەتەوە، گۆڕی سەربازی وون، چوار پارچەکەی جگەرم، من و مامەیارە، خەم دەریایە و منیش کەشتیم، لە شیعرە بڵاونەکراوەکانی سالم.
- کۆمەڵگای کورد لە دەرەوە.
- فۆنیمەکانی کوردی.

- چریکە و خوێندەوارانی.
- چەند نامەیەك، عێراقی صەدام- شیعر، کوردە هاوارە- شیعر..[147]

لەم ژمارەیەدا شتێکی ئەوتۆ نابینین کە زۆر پێویست بێت لەسەری بنووسین و شیی بکەینەوە، چونکە بابەتی تازەی کەم تیایە، هەرچەندە ئەگەر ماوە ببوایە و باسەکەمان نەبوایەتە باسێکی درێژدادڕ، دەبوایە هەندێك بابەت هەیە هەڵوەستەی لەسەر بکەین بە تایبەتی:

١- کورد لای بێگانە
٢- خۆ جێ قات نەبوو
٣-بۆچی ئۆتۆنۆمی؟
٤- فۆنیمەکانی زمانی کوردی.

بەڵام دیارە لە عنوانی باسەکان خوێندەوار دەتوانێت شتێك لە ناوەڕۆکەکان هەڵکرێنێ..

لە ژمارە پێنجی چریکەی کوردستاندا ئەم بابەتانەی تیا بڵاوبۆتەوە:

- هێرشە هیتلەرانەکەی بێگن بۆ سەر لبنان.
- عێراقی پاش صەدام.
- پێویستی ستراتیجی‌یەکی نوێ.
- دیوانی چریکە، نەورۆز، لاوکی ئازادی، سەرگوزشتەکەم، چۆن رزگار ئەبین...
- سەرنجێك لە ووتاری کۆمەڵگای کورد لە دەرەوە.
- کورد و ئۆتۆنۆمی.
- چریکەی خوێندەواران.

---

[147] چریکەی کوردستان ژمارە ٤ کانونی یەکەم ١٩٨١ز.

– ئیسلام بۆ کورد ستراتیجیەکی تازە نی‌یە.

لەم ژمارەیەدا دیاردەی تازە بەرچاو دەکەون کە لەگەڵ ژمارەکانی پێشووتری جیاوازی هەیە، لە ژمارەکانی پێشووتر لە سەر بەرگی دەرەوە نووسراوە چریکەی کوردستان گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتی‌یە و بەس، بەڵام لەم ژمارەیە بە دواوە نووسراوە گۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتی سەربەخۆیە.. واتە ووشەی سەربەخۆ خراوەتە سەر گۆڤارەکە، دیارە ئەوەش لەوەوە هاتووە بۆ ئەوەی خوێندەوارانی چریکە بە لایەنێك لە لایەنەکانی پارتەکانی کوردستان حساب نەکەن، چونکە لەو سەردەمەدا شەڕی ناوخۆی براکوژی گەرم بوو لە نێوان یەکێتی‌ی نیشتمانی و پارتی دیموکرات و حسك و حیزبی شیوعی، جا بۆ ئەوەی چریکە لەو ناکۆکیە و ململانی‌یە خۆی بە دوور بگرێ بانگی سەربەخۆیی خۆی داوە و بیروباروەڕی جیاوازەکانی بڵاوکردۆتەوە، ئەمەیان وا، لە لایەکی ترەوە لەو ژمارەیەدا گۆشەی زمانەوانی تێدانی‌یە و لێرەدا کوژاوەتەوە، هەروەها زمانی نووسین جیاوازی تێدا بەرچاو دەکەوێت لەگەڵ ژمارەکانی پێشووتری، لەم ژمارەیەدا زۆر بە توندی لە دژی ئیسرائیل و ئەمریکا نووسراوە و بە گەرمی پشتگیری لە گەلی عەرەب و فەلەستین و لوبنان کراوە.. وە هەر لەم ژمارەیەدا بابەتێکی تازە هاتۆتە ناوەخنی گۆڤارەکەوە ئەویش مەسەلەی (ئیسلامی سیاسیە لە کوردستان) و کە دەڵێن ئیسلام بۆ کورد ستراتیجیەکی تازە نی‌یە، لەو باسەدا هاتووە هەرچەندە دەوڵەتە ئیسلامیە هاودینەکانمان زمانی زگماکیان لێقەدەغەکردووین و بە ناوی ئیسلامەوە دەیان هەزار سووکایەتیان بە کورد کردووە لە سەردەمی عوسمانی و ئێرانی‌یەوە بگرە لە سەردەمی ئەمەوی و عەباسیش و ئێستاش بە عێراق و ئێران و تورکیا و سوریاوە هەرچی کارەسات و گۆبەند هەیە بەسەر کوردیان هێناوە بەڵام

کورد لە ئیسلام ساردنەبۆتەوە و بە بڕواو یەقینەوە پێڕەوی ئایینی ئیسلامی کردووە، وە لە لاپەڕە ٦٩دا ئیشارەی بە نووسینێکی صالح قەفتان کردووە لە کتێبی (مێژووی گەلی کورد)دا کە دەڵێت:

((کوردەکان لە دوای ئیسلام بوونیان.. لە پێناو شەرەفی ئەم ئایینەدا بۆ بەرزبوونەوەی خەلافەت نەچوونە ژێر سلاح بۆ بێگانە.. بەوە بینایی قەومایەتی خۆیان خستۆتە مەترسیەوە.. یەعنی خۆیان کردووە بە قەڵغانی ئیسلامەتی و کوردایەتیانی لە ڕێی ئەو نیازەدا بەختکردووە..))[١٤٨]

وە هەر لەو بارەیەوە شیعرێکی حاجی قادری کۆیی بڵاوکردۆتەوە ئەمەی خوارەوە دەقەکەیەتی:[١٤٩]

*((بێگانە لە تەرجەمەی زمانی ئەسراری کتێبی خەڵکی زانی*

*یەکسەر عولەما درشت و وردی هیچ نەی خوێندووە دوو حەرفی کوردی))*

لە خوێندنەوە و شیکردنەوەی ئەو باسەی سەرەوەدا ئەوە ئیسبات بووە کە حکومەتەکانی برادینییەکانی کورد ئەوەی بە کوردیان کردووە با بە دەواری شڕی نەکردووە، بەرهەمی ئیسلامی گەلی کوردیان بە تاڵان بردووە و بە چاوی سووك سەیری کوردیان کردووە و بەدناویان کردووە و بە گژ یەکیانەوە ناون و رەچەڵەك و رەگ و ریشەی کوردیان بردۆتەوە سەر رەچەڵەکی خۆیان و لە هەوڵی بەردەوامدان بۆ توانەوە و لەناوبردنی کوردی برای موسڵمانیان.

هەر لەو وتارەدا باسی لە سەردەمی چوار ئیمامەکە دەکات ئەبو بەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و سەردەمی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانی و

---

[١٤٨] مێژووی گەلی کورد ساڵح قەفتان ل ١٧٧. چاپخانەی سەلمان الاعزەمی ١٩٩\٦٩ز بغداد.

[١٤٩] چریکەی کوردستان ژمارە (٥) تەمموزی ١٩٨٢ز ل ٥٧-٧٧ نووسینی م.د لە گۆڤاری (ئەرەیبا) وەرگیراوە.

ئێرانی و تا دەگاتە سەردەمی صەدام و خومەینی کە چ کارەساتێکیان بەسەر کورد هێناوە و هەر بەو بۆنەیەوە شیعرێکی ئاراستەکراوی خومەینی بڵاوکردۆتەوە بەم شێوەیە دەدوێ:

*((خەڵکی وەهای ئەزانی — تۆ ئیمامی زەمانی!*

*کە خۆی خستە بەختی تۆ — ئیتر نابێ رەنجەڕۆ*

*زوڵم و زۆر بەرباد ئەکەی — ژێر دەستان ئازاد ئەکەی*

*لێقەوماوان شاد ئەکەی — خێر و خۆشی زیاد ئەکەی*

*کەچی دەرکەوت بەکردار*

*تۆش شاهێکی ستەمکار))*

ژمارە حەوتی گۆڤاری چرکیەی کوردستان لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٣ز دەرچوو ئەم بابەتانەی تیا نووسراوە:[١٥٠]

- عیێراق و ئێران دوای سێ ساڵ شەڕ، نووسینی (م.د.).
- تورکیا و عێراق و ئێران گەلەکۆمەکی لە کورد ئەکەن.
- کامەیە ئەرکی نووسەر و رووناکبیری کورد؟ نووسینی وەرزێر.
- کورد و ئۆتۆنۆمی، نووسینی پۆڵا.
- ئیسپانیا و نەتەوە جیاوازەکانی، نووسینی شاسوار.
- دیوانی چریکە.
- گوڵی سەربەستی، بەختیار زێوەر.
- ئەگەڕێمەوە، شیعری هاوار.
- سروودی رۆژی تازە، فەرهاد شاکەلی.
- ئەی هەوری رەش، وەرزێر.
- قوربانی تۆزی رێگەتم و چەپکە شیعری ئەنوەر قادر محمد.
- گۆرانیەکانی دایکم دەبن بە چی؟! شیعری خەبات.
- هاواری کوردە ئاوارەکانی ئوسترالیا، ئەمڕۆ بۆ کورد... یەکنەگرتن واتە مردن..!

---

[١٥٠] چریکەی کوردستان ژمارە (٧) تەشرینی یەکەم ١٩٨٣ز.

- هیوا –چیرۆکی ژمارە– نووسینی س.خ. سمکۆ.
- چەند سەرنجێك لەبارەی وتارەکەی شاکەلییەوە (ن.مارف).
- کە ژمارە شەشی چریکەم خوێندەوە، نووسینی وەرزێر.
- لەبارەی تورکیاوە، لە کرستیان سایەنس مونیتور وەرگیراوە.
- کوردستان قەلاّی پێشەوەی شۆڕشگێرانە.

کۆتایی

**تێبینی:**

بەداخەوە ژمارە شەشی چریکەی کوردستانمان دەس نەکەوت، هەر چەندی هەوڵێکی یەکجار زۆرمان دا..

لە ژمارە حەوتی چریکەی کوردستاندا دیاردەیەکی نوێ بەرچاو دەکەوێ کە لە ژمارەکانی پێشتر نەبوو، بابەتەکەش ئەوەیە کە دەرگای رەخنە کراوەتەوە بەلاّم رەخنەی زانستیانە و بنیاتکەرانە، نەك رەخنەی رووخێنەر.. دیارە لە ژمارە شەشی چریکەدا بانگەوازێکی (فەرهاد شاکەلی) بلاّوکراوەتەوە بە عنوانی ((ئەرکی نووسەر و رووناکبیری کوردی)) تیادا دیاری کراوە و لە بانگەوازەکەدا شاکەلی داوا دەکات رووناکبیران هەڵوێست وەربگرن دەربارەی سەرکردەی پارتە کوردیەکان، ئەوانی لە رێگای ڕاستی کوردایەتی لایان داوە، یان لە داهاتوو لائەدەن.. فەرهاد شاکەلی جگە لەوەی شاعیرە نووسەرێکی بە تواناشە و لەو ژمارەیە دوو رۆشنبیری کورد لە دەرەوەی وڵات وەلاّمیان داوەتەوە وە رەخنەیان لە ووتارەکەی گرتووە.

لەوانە (ن.مارف) لە ژێر سەرناوی (چەند سەرنجێك)دا[١٥١] دەنووسێت:

---

[١٥١] چریکەی کوردستان ژمارە (٧) تەشرینی یەکەم ١٩٨٣ز ل ٦٥-٦٦ن.مارف.

((کە لە ژمارە (٦)ی چریکەدا لە ژێر ناونیشانی ئەرکی نووسەر و رووناکبیری کورددا ناوی کاك فەرهاد شاکەلیم دی کە هەر لە چریکەدا چەند جارێك شیعرە جوانە دڵسۆزەکانیم خوێندۆتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە من کەمم شیعر دێتە بەر کەچی گورج ئەم پەلکە شیعرەیم هاتەوە بیر کە دەڵێت:

*لە دوای شەوی تاریك و رەش　　　　رۆژی زێرین هەڵدێتەوە*

*دوای زستانی سەخت و ناخۆش　　　　بەهارێکی شین دێتەوە..))*

((بەڵام بەداخەوە ئەوەی نووسەر باسی نەکردبوو ئەو شتانە بوو کە باوەڕم وایە نەك هەر من بەڵکو هەموو کوردێکی پاك و چاك، لەم رۆژە رەشەدا بە یەکەمین و گرنگترین ئەرك و فرمانی رووناکبیر و ناودار و پێشکەوتووانی کوردی دادەنێن، وە داوایان لێئەکەن کە بە هەموو هێز و توانایانەوە هەول بدەن لە پێناو جێبەجێکردنی ئەرکە گرنگەکەی خۆیان و ئەم ئاواتە پیرۆزەی گەلدا، لە باسنەکردنی ئەمەش ناخۆشتر ئەوەیە کە کاك شاکەلی سەرزەنشتی نووسەر و رووناکبیرەکانی کورد ئەکات کە بۆچی بەرامبەر سیاسی و خۆ بەپێشڕەو زانەکانەی کورد بێدەنگ وەستاون و پێیان ناڵێن قوربان تۆ لە من دڵسۆزتر نیت بۆ گەل و وڵات ئیدی بۆچی دەبێ تۆ رێگە بە من پیشان بدەیت؟!.))

دیارە لە بڵاوکردنەوەی ئەم ووتارە رەخنە ئامێزەی ن.مارف دەربارەی شاکەلی چریکەی کوردستان بڕیاری داوە لە دەرگای رەخنە و رەخنە لە خۆگرتن بدات و بیر و بۆچوونی جیاواز و بەرامبەر و دژ بە یەکتر بڵاوبکاتەوە، ئەم نەریتە لە رۆژنامەگەریدا کارێکی باش و سوود بەخشە، چونکە بە هۆی بیروباوەڕی جیاوازەوە خوێندەواری چریکە زیاتر شارەزای باس و کێشەکان دەبن کە بیروبۆچوونی جیاواز هەڵدەگرن و لە ئەنجامدا رای گشتی دروست دەبێت و سەر دەکەوێ..

لەهەمان ژمارەدا وتارێکی تری رەخنەگرانە دەربارەی ژمارە شەشی چریکە نووسراوە لە لایەن (وەرزێرەوە) دەڵێت:

کە ژمارە شەشی گۆڤاری چریکەی کوردستانم خوێندەوە.. دەمێ بوو، تامەزرۆی چاپکراوێکی کوردی، رۆشنبیری بووم و شەوان خەوم پێوە دەدیت، بۆی بووبوومە کۆرپەیەکی برسی و تینوو گاگۆڵکێم بۆ دەکرد، کە ژمارە شەشی کەوتە دەستم توانیم ئەو برسیەتی و تینویەتیەم بشکێنم و بە باوەشی پڕ سۆزەوە لە نێوانی دەستەکانمدا خەملی و هێدی هێدی لاپەڕە بە لاپەڕەیم خوێندەوە..

ئینجا دەنووسێت (رەخنەکانمان)

ا- بەشی هونەری:

ئەوەی ئاشکرایە گۆڤارێکی (٩٠) لاپەڕەیی کە ناوبەناو دەردەچێت و.. پێویستی بە رێکوپێکییەکی هونەری باش هەیە و دابەشکردن و رازاندنەوەیەکی جوانی گەرەکە.. دەبوایە لە رێکخستن و دابەشکردنی هونەری بەرهەمەکانیشدا رەچاوی بکرایە، ئەو هەڵانەش وا کراون بەم شێوەیەی لای خوارەوە روونی دەکەینەوە:

أ- وتاری کورد و ئۆتۆنۆمی:

دەبوایە لە بەشی یەکەمدا بێ نەك لە بەشی سێیەمدا.

ب- شیعری هاوڕێم بێکەس دەبوایە لە بەشی دووەمدا بێت نەك لە بەشی سێیەمدا.

ج- وتارێ لە پێناوی ئیملایەکی یەکجۆردا:

دەبوایە لە بەشی سێیەمدا بێ نەك لە بەشی پێنجەمدا.

وە بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم لایەنە هونەریە بەم شێوەیەی لای خوارەوە گۆڤارەکە دابەش دەکرێت:

بەشی یەکەم- پێشەکی وتاری سیاسی و لێکۆڵینەوە سیاسیەکان.

بەشی دووەم- دیوانی چریکە.

بەشی سێیەم- رەخنە و لێکۆڵینەوە.

بەشی چوارەم- چریکە و خوێندەوارانی.

بەشی پێنجەم- هەمە چەشنە.

## ٢- بەشی رەخنە:

لەم بەشەدا بەو پەڕی هەستکردن بە لێپرسینەوە و دڵسۆزییەوە لە پێناوی نەمری گۆڤارەکەدا ئەم چەند رەخنەیە دەخەینە بەرچاو:

أ- لە بەرگی پێشەوەی چریکەدا نەخشەی کوردستان کێشراوە و لە دەور و بەریدا ناوی ئیسرائیل نووسراوە، بۆ ئاگاداری رای گشتی دۆستەکانمان دەبوایە لە جیاتی ئیسرائیل ناوی فەلەستین بنووسرایە..

ب- وتاری هاوڕێ (م.عەلی) دەربارەی ئیملای کوردی لەنگ و کەم و کورتە.

ج- دەربارەی دیوانی چریکە، رەنگ و رووی نەبوونی بەرهەمی نوێی پێوە دیارە..

لەو دوو باسەی سەرەوەدا دەربارەی ژمارە حەوت و شەشی چریکە کە گرنگی تایبەتی داوە بە رەخنە و رەخنە لە خۆگرتن و ئەو بابەتانەی وەرزێر بڵاوی کردۆتەوە کە رەخنەی لە خودی گۆڤارەکە گرتووە لەباری هونەری و رێکخستن و بەرگ و نەخشە و ناوەڕۆکەوە، وە چریکەش سوپاسی کردوون و داوای لە رۆشنبیران و هونەرمەندان کردووە بەردەوام بن لە ئامۆژگاری و رێنەوینی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە و هەڵسانگاندنی لە هەموو روویەکەوە، بۆ ئەوەی گۆڤارەکە بێتە سەرچاوەیەکی باوەڕ پێکراوی هەموو

رووناکبیران لە هەندەران دیارە بابەتەکانی ناوگۆڤارەکە بە گشتی بابەتی باش و بەپێزن بۆ شکاندنی تینویەتی خوێندەوارانی چریکە لە دەرەوەی وڵات چونکە بابەتێکی تری تێدایە کورد لای بێگانە، کە ئەوەش بیروڕای گشتی دنیای دەروە دەردەخات دەربارەی کێشەی نەتەوایەتی کورد لە هەموو بەشەکانی کوردستاندا..

ژمارە (٨ و ٩)ی گۆڤاری چریکەی کوردستان لە ئەیلولی ١٩٨٥از دەرچووە، بریتیە لە ١٤٤ لاپەڕە و بە هەمان شێوە و قەوارەی ژمارەکانی پێشووتری و ئەم بابەتانەی تیا بڵاوکراوتەوە:

- کورد و مافی چارەنووس دیاریکردن.
- شینی ئەدیبانی کورد، نووسینی د.ک.فوئاد.
- چریکەی سەربەستی.
- چەند سەرنجێك لەبارەی وتاری (ستراتیژی سیاسی و سەربازی بزوتنەوەی نیشتمانی کوردەوە) هێمن.
- دیوانی چریکە.
- شاعیری نەمر گۆران، نووسینی هاوار.
- هەڵبژاردە: مەسەلەی کورد و نەبوونی پاڵپشتی دەرەوە، نووسینی ش.بەکر.
- تاوانی تورك لەم سەدەیەدا.
- چریکە و هەڵبژاردەی بڵاوکراوەکانی.
- رەخنە و بەربەرەکانی ناوخۆیی، نووسینی (م.د).
- ....

لە لاپەڕە یەکی گۆڤاری چریکەی کوردستان ژمارە (٨ و٩)دا وتارێك نووسراوە لە ژێر سەرناوی کورد و مافی دیاریکردنی چارەنووسی نەتەوەکان.

ئەم باسە ڕەخنە ئامێزە لێکۆڵینەوەیە لەسەر پرۆژەیەکی پارتی کۆمۆنیسیتی عێراقی لەبارەی کێشەی کوردەوە لەلایەن گۆڤاری (نداء الشغیلة) کە ڕۆژنامەی ناوەندی بزوتنەوەی سۆشیالیستی عەرەبیە، (الجریدة المرکزیة للحرکة الاشتراکیة العربیة) [١٥٢] لە وتارێکیدا لە بارەی کێشەی کوردەوە بە توندی ڕەخنەی گرتووە لەو پرۆژەیە کە دانی تەواوی ناوە بە مافی چارەنووسی کورد بە پێی سەرەتایەکانی بیروباوەڕی مارکسی و لینینی، (نداء الشغیلة) دەنووسێت (باوەڕمان وایە کە شیعاری دیاری کردنی چارەنووس ناکرێ هەروەها بە تەنیا بهێنرێتە کایەوە، بەڵکو پێویستە کە توند و ڕاستەوخۆ ببەسترێتەوە بە سروشتی قۆناغەکەوە و بەو هێز و بزوتنەوانەی کە تیایان (طبیعة المرحلة و القوی المحرکة فیها).. تا دوایی.

چریکەی کوردستان لە وەڵامی ئەو هەڵویستەی (نداء الشغیلة)دا دەنووسێت:

((جێی داخە ئەم برا عەرەبە سۆسیالیستە مرۆڤ دۆستە، ئازادی پەرستە، یەکێتی ویستە نەك هەر خۆی بەو بێ هێزی و بێ دەسەلاتی و دوور لە حوکم، هەر بە قسەش مافی چارەنووسی خۆ دیاری کردن بە نەتەوەی هاودەرد و هاودوژمن و هاوئاواتی خۆی ڕەوا نابینێ..)) [١٥٣]

---

[١٥٢] مجله نداو الشغیله العدد د/٥٥ نیسان ١٩٨٥م الجریده المرکزیه للحرکه الاشتراکیه العربیه.

[١٥٣] گۆڤاری چریکەی کوردستان ژمارە ٨ – ٩ ئەیلولی ١٩٨٥ز ل ١-٥.

هەر لەو بارەیەوە چریکە وتە بە نرخەکەی سەرهەنگ قەزافی بە نموونە هێناوەتەوە کە لە ١٤/١٢/١٩٨٠ز لە کۆبوونەوەی (مەدرید) کە بەسترابوو لە وەڵامی پرسیارێکدا دەڵێت:[١٥٤]

((راستە من عەرەبم و زۆریش بە تەنگ یەکێتی خاکی عەرەبەوەم، بەڵام ئەمە وام لێناکات کە خۆم لە راستی هەڵە بکەم و رەگەزپەرستانە و ئیمپریالیستانە بجووڵێمەوە.. کورد ئەرزی خۆیان هەیە ئەرزی کوردستان، کورد نەتەوەیەکن نەتەوەی کوردستان، نەتەوەیەکی بران، من دژی خراپە لەگەڵ کردنیانم دژی زۆر لێکردنیانم، دژی تەفروتونا کردنیانم، بەڵکو من پشتی خەباتی کوردیش ئەگرم.. من لەگەڵیانم لە رێگەی کۆکردنەوەی پارچەکانیان و دامەزراندنی نەتەوەیەکی کوردستانیدا کە شوێنی خۆی بگرێ لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە تەنیشت نەتەوەی عەرەب و ئێران و تورکەوە.. تا دوایی)).

مرۆڤ کە سەرنجی بیر و بۆچوونی هەندێ لایەنی عەرەبی دەدا دەربارەی کێشەی کورد دەبینێ بۆچوونی هەندێکیان زۆر شۆڤێنییانەیە و لەگەڵ تورك و فارسە رەگەزپەرستەکان هیچ جیاوازیان نییە.. بەڵام لایەنێکی گەش لەناوبزوتنەوەی رزگاری خوازی عەرەبیدا چوزەرەی کردووە و سەری هەڵداوە (تەقەبل و ئیستیعاب)ی مەسەلەی کوردیان کردووە، بە تایبەتی مارکسیەکان و پێشکەوتن خوازەکان و هەندێ کەسایەتی رۆشنبیری عەرەبی کە مافی رەوای کورد لایان گەڵاڵەبووە و خەملیوە...

بۆیە ئێمە لێرەدا دەتوانین بە دڵنیاییەوە بڵێین کە بزوتنەوەی عەرەبی نزیکترین دۆستی بزوتنەوەی رزگاری خوازی کوردە و رۆژ لە دوای رۆژ ئەم

---

[١٥٤] گۆڤاری چریکەی کوردستان ژمارە ٨ – ٩ ئەیلولی ١٩٨٥ز ل ٥-١٠.

رۆژنامەی الزحف الاخچر لە ١/٤/١٩٨٥ز وتەکانی پێشەوا سەرهەنگ قەزافی.

راستیه زیاتر گەشه دەکا و ئاشکراتر خۆی دەنوێنێ.. هەر بۆ نموونه شیوعیه عەرەبەکان بە گشتی و سەرهەنگ قەزافی و جەمال عبدالناصر و ئەحمەد بنبەله و مشعان جبوری و گەلێك رۆشنبیر و سیاسەتوانی عەرەب.

گۆڤاری چریکه له لاپەڕە ٤١ تا لاپەڕە ٥٩ لێکۆڵینەوەیەکی زانستیانەی بڵاوکردۆتەوە (چەند سەرنجێك) لە بارەی نووسینەکەی مامۆستا عصمت شەریفەوە لەسەر ((ستراتیژی سیاسی و سەربازی بزوتنەوەی نیشتمانی کورد)) نووسینی هێمن

ئەم لێکۆڵینەوەیە مناقەشەیەکی زانستیانەیە لەسەر نووسینەکەی عصمت شریف کە لە گۆڤاری دیراسات کوردیـیەدا لە کانونی دووەمی ١٩٨٥ز لە لایەن ئەنیستیتیوی کورد لە پاریسەوە دەرئەکرێ، بە پێی ئەو لێکۆڵینەوە رەخنە ئامێزەی (هێمن) کردوویەتی لەسەر ئەو باسە دیارە زیاتر جەخت ئەکا لەسەر هۆیەکانی سەرنەکەوتنی بزوتنەوەی کوردایەتی، وە دیاری و دەستنیشانی نەکردووە لە ووتارەکەیدا تەنیا بۆ ئەوە چووە گوایە بۆیە شۆڕشەکانی کورد سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە چونکە ئامانجیان روون و ئاشکرا نەبووە و داوای سەربەخۆیی تەواویان نەکردووە، بەڵام رەخنەگر دەڵێت ئەگەر هاتوو هەموو هۆیەکانی ژێرکەوتن دیاری نەکەین وەکو ئەو دکتۆرە وایە کە ناتوانێ دەردی نەخۆشەکەی دیاری بکات ناشتوانێ دەرمانی بۆ بنووسێ بۆیە دەبینین هێمنی رەخنەگر هۆیەکان دیاری دەکات کە بەلای ئەوەوە ئەمانەی خوارەوەن:

١- سروشتی چینایەتی سەرکردەکانی کورد (ئاغا و میر و شێخ و مەلا بوون).

٢- نەبوونی پارتێکی پێشڕەو و لێزان.

٣- سەیرنەکردنی مەسەلەی کورد وەك یەك مەسەلە لە هەموو پارچەکاندا.

٤- نەخەملاندنی باری ناوخۆیی و دەرەکی.

٥- لای زۆربەی سەرکردەکانی کورد وا باوبووە کە بەبێ یارمەتی دەرەکی سەرکەوتنی خەباتی کورد ئەستەمە.

لە لاپەڕە ٦٩ی چریکەدا نامەی کوردێکی ئاوارە بۆ برایەکی فەلەستینی بە شیعر نووسراوە، شیعرەکەش هی ب.أ.ر واتە بلەی ئەحە رەش، بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

*برای لێقەوماو ئاوارەی زەمین — بێبەش لە ماڵ و لە ماف و لە ژین*

*ناشێ نەزانی چەند لە یەك ئەچین — ئێمەی هەژار و گەلی فەلەستین؟*

*هەردوو وڵا تمان داگیر کراوە — هەردوو گیرۆدەی داوی ژێردەستین*

*دەستوری جەنگەڵ دیموکراتیە — چ لە کوردستان چ لە فەلەستین*

شیعرەکە ٣٢ دێڕە لە ١٩٧٧/١٢/٢٦ز نووسراوە.

دیارە گۆڤاری چریکە هەروەکو لە ژمارە یەکی بەرنامەی خۆیدا ئاشکرای کردووە ئەویش بریتی‌یە لە نزیك بوونەوە لە گەلانی جیهان، بە دیارکردنی جێگاو شوێنی بزوتنەوەی رزگاریخوازی کورد لە بەرەی ئازادی و دیموکراسی گەلانداو ناساندنی رووی راست و رەوای کێشە و داخوازیەکانمان وەك گەلێکی دابەشکراو لەلایەن چەند دەوڵەتێکی کۆنەپەرست و شۆڤێنیستی سەر بە ئیمپریالیزم وە دەرخستنی رووی گەشی خەباتی نەتەوەکەمان لە پێناو مافە رەواکاندا وە ریسواکردنی دوژمنی سەرسەخت و خوێن رێژ و خوێن مژ وە ئاشکراکردنی کاری نامرۆڤانەو رەوشتی درندانە و جانەوارانەیانی بەرامبەر میللەتەکەمان لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا و بە تایبەت لەو بەشانەی بڵێسەی ئاگری

تیا بەرزبۆتەوە هیوای سەرکەوتنی تیا نزیك و نزیکتر بۆتەوە، وە ئەو شیعرەی سەرەوە نیشانەی پێکەوە گرێدان و هاوخەباتی کورد و عەرەب بە گشتی و کورد و فەلەستینیەکان بە تایبەتی، دیارە شاعیر ویستویەتی سۆزی نەتەوەی عەرەب رابکێشێ بۆ لای کورد چونکە خەباتی هەردوو لای پێکەوە بەستووە و لێکیچواندووە.

لە دوا ژمارەی چریکەدا بابەتێك بڵاوکراوەتەوە لە ژێر سەرناوی هەڵبژاردەی بڵاوکراوەکان ئەم بابەتە بە لای ئێمەوە گرنگیەکی تایبەتی هەیە بۆ ئەو کەسانەی ئەم لێکۆڵینەوەیە بخوێننەوە و هەڵیبسەنگێنن، گرنگیەکەی لەوەدایە باسی ئەو بڵاوکراوانە دەکات کە لە ساڵی ١٩٨٥ لە هەندەران یان لە وڵات بە نهێنی دەرچووە بۆ هەر باحسێك پێویستە بزانێت لەو سەردەمە چ گۆڤار و دیوانی شیعر و کتاب و نامیلکەیەك دەرچووە لەبەرئەوە بە پێویستمان زانی لێرەدا بە کورتی پەنجە بۆ ئەو گۆڤار و دیوانی شیعر و نامیلکە و کتێبانە رابکێشین کە لەو سەردەمەدا دەرچووە بەم شێوەیەی لە پەراوێزدا هاتووە:[١٥٥]

---

١٥٥

- ژین ئەم کتێبە کۆکراوەی ژمارەکانی گۆڤاری ژینە کەوا لە ساڵەکانی ١٩١٨-١٩١٩ لە ئەستەمبول دەرچووە ٤٥٨ لاپەڕەی گەورەیە لە سوید چاپ کراوە.
- **The legal concept of self-determination and the Kurdish Question.**
- ئەم نامیلکەیە لە لایەن دکتۆر فوئاد محمد حسینەوە نووسراوە.
- دەروێشەکان بە دوایی راستیدا دەگەڕێن.
- ئەم شانۆگەریە لە لایەن مامۆستا (محمد الحلاج)ـە وە نووسراوە، محمودی مەلا عیزەت وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.
- پێنج بەرهەمی هاوار لەندەن هەڵبژاردەی شیعرەکانی هاوارە (کاروانی شۆڕش و پاش ئاشبەتاڵ).

ئاوازی گەرویەکی زیندوو

- دوو دیوانە شیعری کاك فەریاد فازلە ١١٨ لاپەڕە و ٢١٨ لاپەڕە لە لایەن پەیمانگای زمان و ئێرانیەکانی زانستگای ئازاد لە بەرلین بلاوکراوەتەوە.
- شیوەنێ بۆ کوردستان چەپکێ شیعری کاك یاسین وەرزێرە.

زەویتان بۆ دەژەنم و، لەگەڵ کازیوەیەکدا

- دوو بلاوکراوەی کاك رزگار عبدالله یە یەکەمیان چل لاپەڕەیە و شیعرە دووەمیان ١٣ کورتە چیرۆکە.
- بەندیخانە، شانۆگەریی کاك هاوڕێیە.
- داستانی هەڵۆی سوور، یەکێتی نووسەرانی کوردستان دەری دەکات.
- کەشکۆڵی پێشمەرگە، دوو چەپکە شیعری کاك جوامێرە.
- بانگەواز، گۆڵ چنینی هەڵبەستەکانی عومەری فاروقییە.
- چەپکێ خەمی کەسك، شیعری ئەحمەد عارفە.
- نهضة الاكــــراد الثقافيـــة و القوميـــة. لێکۆڵینەوەیەکی راپەڕینی کەلتووری و نەتەوەیی مێژوونووسی کوردی سۆفیەتی جەلیلی جەلیلە.
- گفتوگۆی شۆڕش لەگەڵ میری، کتێبێکی ١٢٢ لاپەڕەیە یەکێتی نیشتمانیی کوردستان دەری کردووە.
- هیوا ئەم گۆڤارە لە لایەن ئەنستیتۆی کورد لە پاریس شوباتی ١٩٨٥ ز دەرچووە.
- دراسات كردية، گۆڤارێکە ئەنستیتۆی کورد لە پاریس هەر جارەی بە زمانێك دەری دەکات.
- هەڵوێست، گۆڤارێکی رووناکبیرییە لە لایەن چەند لاوێکەوە لە لەندەن دەردەچێت.
- چەپکە گوڵ، چەند پارچە شیعرێکی شامی کرمانشانییە.
- بەربانگ، گۆڤارێکی فیدراسیۆنی کۆمەڵە کوردستانیەکانە لە سوید.
- ئارمانج، **ARMANC** گۆڤارێکی کوردییە کۆمەڵەی یەکێتی کارگەرانی دیموکراتی کوردستان لە سوید دەری دەکات.
- گزنگ، گۆڤارێکە لە لایەن یەکێتی نووسەرانی کوردستان لقی کەرکوکەوە دەردەچێت.
- رسالة العراق، گۆڤارێکە پارتی کۆمۆنیستی عێراق راگەیاندنی دەرەوەیان دەری دەکات.
- صدى كردستان، گۆڤارێکە پارتی دیموکراتی کوردستان دەری دەکات.
- الشعلة، مەشخەڵ، الجريدة المركزية للاتحاد الديمقراطي الكردستاني العراق دەری دەکات.
- نداء الشغيلة، الجريدة المركزية للحركة الاشتراكية العربية.
- الشرارة، رۆژنامەی ناوەندی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان.
- پرشنگ، گۆڤارێکی رۆشنبیری گشتییە پاشکۆی دەنگی خوێندکارانە کۆمەڵەی خوێندکارانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات دەری دەکات.
- الانتفاضة الشعبيه، الجريدة المركزية للجبة الوطنية القومية الديمقراطيـــة فـــي العـراق دەری دەکات.

بەلای ئێمـەوە ئـەو شـیکردنەوە و لێکدانـەوە و بۆچوونانـەی دەسـتەی نووسـەرانی گۆڤاری چریکە لەبارەی نامیلکەیـەکی سیاسـی چـەند لاوێکـی کوردی توندرەو کە ویستوویانە لە دەرەوە ناوبانگی بزوتنەوەی کوردایـەتی لەکەدار بکەن، بەوەی کێشە ناوخۆیەکانی خۆیان و عەیب و عار و کـەم و کورتیەکانی ناو بزوتنەوەی کوردایەتی بە دنیای دەرەوە بگەیـەنن، کە هیچ دەردێکـی نـاگوزەری و ناتفـاقی و نابەڵـەدی نـاوخۆ چارەسـەر ناکـات و کێشـەکان بنبڕ ناکات و دوژمنـانی میللەتەکـەمان دەیقۆزنـەوە بـۆ قـازانجی

---

- دەنگی خوێندکارانی کوردستان، گۆڤـاری کۆمەڵـەی خوێندکـارانی کـوردە (ئەکسا) لـە دەرەوەی وڵات.
- هێلانە، گۆڤارێکە تایبەتە بەو منداڵانەوە کە بە زمانی کوردی بە پیتی کرمـانجی سەروو دەخوێنن، لەلایەن یەکێتی کرێکارانی دیموکراتی کوردستانەوە لە سوید دەر دەچێت.
- یادی شەهیدانی ئۆردوگای زێوە، گۆڤارێکە پارتی دیموکراتـی کوردسـتان بـە کـوردی دەری دەکات.
- بەیاننامە، گۆڤارێکە کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا دەری دەکات.
- بانگەواز، کۆمیتەی پشتگیری کوردستان لە ئەمریکا دەری دەکات.
- لم یعد الصمت ممکنــــا، نامیلکەیەکە لـە سـوید چاپ و بڵاوکراوەتـەوە هـەمووی رەخنـە و هێرشـە بـۆ سـەر یـەکێتیی نیشتمانیی و شەخسـی تاڵەبانی لـە لایــەن سـالار عـەزیزەوە نووسراوە و بە ناوی (ئاش) واتە ئاڵای شۆڕشەوە بڵاوکراوەتەوە.

*راوبۆچوونی گۆڤاری چریکەی کوردستان لەسەر ئەم نامیلکەیە بەم شێوەیەی خوارەوەیە:*

((ئـەو نامیلکەیـە، زیـان بـە کێشـەی گەلەکـەمان ئەگەیـەنێ لـە دەرەوەی وڵات، وە هیــچ کێشەیەکی نـاوەخۆ چارەسـەر ناکـات، چونکـە خـەبات وەك کشتوکاڵ وایـە تـا لەسـەر زەویەکـە نەبێ لە کردن نایێت..

هیــچ ئامــانجێکی بڵاوکـەرەوەکان ناهێنێتــە دی و زیـانێکی زۆر ئەگەیـەنێ بــە دیمــەن و ناوبانگی بزوتنەوەی ئازادی خوازی نەتەوەکەمان لای خۆیی و بێگانەش دەبێتە هۆی تەشـەنە پێکردن و کڵپەپێ سەندنی ناکۆکی و هەراو هوریا لە ریزی کوردە ئاوارەکان سەر لێشێواندن و دابـەزاندنی ورەی خـەڵك و کـەم کردنـەوەی هیـوا و ئاواتیـان، ناهومێدیـەکی زۆر ئەخاتـە دڵـی کوردە ئاوارەکانەوە کە سەر بە هیچ لایـەك نـین، بـە دۆسـتەکانی بێگانـەمان نـائومێد دەکات و دوژمنە بێگانەکانمان دڵخۆش دەکات.)) لە چریکەی کوردستان ژمارە ٨- ٩ ئـەیلولی ١٩٨٥ز ل ١٣٧-١٣٩ بڵاوکراوەتەوە (م.د).

خۆیـان و کنـەو بنـەکردنی کـادر و تێکۆشـەرانی بزوتنـەوەی کوردایـەتی و ریسـواکردنی شۆڕشـی کـورد و نەخشـەدانان بۆ پیلانگـێڕان بـۆ لـەباربردنی هەرچی دەسکەوتی شۆڕشی کوردستان هەیە.

ئێمـە پێمـان وایـە دەسـتەی نووسـەران خزمـەتێکی باشـی ڕەوتەکـەیان کردووە و ئەو کۆمەڵە گەنجەیان هوشیار کردۆتەوە لە مەترسی کارەکەیان و هاتنەوە سـەر ڕێـی ڕاسـت، بـۆ ئـەوەی ڕق و کینـەی تایبـەتی و حزبایـەتی خۆیان بەلاوە بنێـن و بەشـداریی کاریگەرانـە لـە کـارۆ کـردەوەی هاوبـەش و هەماهەنگی گشتی‌دا بکەن لەسەر ئاستی نیشتمان و نەتەوە..

# صرخة كردستان

الملحق العربي

لمجلة

چریکەی کوردستان

## مجلة ثقافية عامة مستقلة

آب ١٩٨٦ العدد (٤-٥)

# صرخة كردستان
# الملحق العربي لمجلة
# چریکەی کوردستان

## صرخة كردستان

صرخـــة پاشکۆی گۆڤاری چریکەی کوردستانە وە پێنـچ ژمـارەی بـە عـەرەبی دەرچــووە بــە هــەمان دروشــم و نەخشــە و قــەوارە و نــاوەڕۆك و روخسـارەوە ژمارە یەکی صرخة لــە مـانگی حوزەیرانــی سـاڵی ١٩٨١ز لـە لەندەن بە زمـانی عـەرەبی دەرچووە و ئەم بابەتانــەی خـوارەوەی لـە خـۆی گرتووە:

- ايران في مهب العاصفة.
- حول الحرب العراقية الايرانية.
- الجماهيرية الليبية و حقوق القوميات.
- حكم الجنرالات في تركيا.
- حول انتخابات الرئاسة الامريكية.
- السادات و بيغن.
- المشكلة الافغانية.
- حديقة الادب.
- العراق دليل التعذيب.
- الارهاب يكتسح الاوساط العلمية العراقية.

- الحكم الذاتي النموذجي..

وە لە سەروتاری ژمارە یەکی صرخة كردستاندا هاتووە:

الاهداء

ان المساهمة في العمل من اجل توفيق اواصر الاخوة الكفاحية بين الشعب الكردي و الشعوب المناضلة في سبيل التحرر من الاضطهاد و الاستعمار و الاستغلال و المحبة للحرية و الديمقراطية و السلام في الشرق الاوسط خاصة و في العالم عامة هي احدى مهام مجلة جريكەی كوردستان –صرخة كردستان– التي تعبر عن آلام و آمال الأمة الكردية في جميع أجزاء وطنها كردستان المقسمة بين دكتاتوريات مذهبية رجعية و قومية شوفينية و عسكرية فاشية تحكمها بالحديد و النار باسم الفرس و العرب و الترك و هم براء منها. هذا أو بما ان الأمة العربية هي الاولى في قائمة الأمم و الشعوب التي تسعى لتوثيق أواصر الأخوة الكفاحية معها بالنظر لما بين الأمتين من الصلات التاريخية و الدينية و الثقافية و الجوارية من وحدة الاهداف و المصالح و الاعداء باعتبارهما حركتين ديمقراطيتين موجهتين ضد الامبرالية و القوى الرجعية الحليفة و العميلة لها, و من اجل التخلص من الاضطهاد و الاستغلال و التجزئة, و لما كان توثيق الاواصر يمر عبر طريق التعارف و التقارب و التفاهم نقدم الى اخواننا أبناء الامة العربية ترجمة بعض ما نشر على صفحات مجلتنا حول شؤون و شجون

**شعبنا و آراء بعض ابنائه حول عدد من القضايا العربيـــــة و العالميــة لخطوة في هذا السبيل, نرجو من الله التوفيق و من اخواننا الارشـــاد و التأييد. (هيئة التحرير).**

**صرخة كردستان**

**الملحق العربي لمجلة چریکەی کوردستان**

**لە ژمارە (٤ –٥)دا کە لە ئابی ١٩٨٦ز دەرچووە و (٢٠٨) لاپەڕە کەوتە بەر دیدی ئێمە و ئەم بابەتانەی تیا بڵاوبۆتەوە:**

- الحرب العراقية الايرانية.
- الامة الكردية و حقها في تقرير المصير, بقلم **سيوەيلى**.
- حديقة الادب: تحتوي على:

فكرة تعذبني, للشاعر المجري الخالد شندوربيتوفي.

ثورة الوعي, شعر ابن الخضراء نورالدين نصرالدين.

قد عدت مثلكم, شعر شاخەوان, معركة الحرية, علي الجوي.

عودة بالقارب, شعر ناظم حكمت, امل و ذكرى, من الشعر الفيتنامي.

نشيد الاتحاد, **خسرەو كلسرخى**, القصيدة الاخيرة, خسرۆ **روزبه**.

- لا تزدهر الثقافة الا في ظل الديمقراطية.
- حقوق الانسان و القضية الكردية, ترجمة شاهين بكر.
- اشارة القضية الكردية في لجنة حقوق الانسان.
- الاكراد في شرق الاناضول, صراع من أجل الهوية (مختارات).
- باسيل نيكيتن/ بقلم هلكوت حكيم.

- الشعب الكردي في الوثائق الاجنبية, ترجمة م. هاوار.
- الاكراد, بقلم صابر أحمد, عن (نشرة المثابة).
- وجهة نظر, حول الموقف الفوري للحرب, بقلم م.د.
- المنبر الحر, حول كتاب القضية الكردية في العشرينات, بقلم

**ئاگادار.**

- اقرار حق الشعب الكردي في تقرير مصيره.
- الاخ معمر القذافي يؤيد قيام دولة كردية.
- طرد اتحاد و جمعيات الطلبة البعثيين, ترجمة دكتور كتولي.
- مكافحة التسلح النووي دفاع عن القيم الانسانية.
- في ذكرى اولوف بالمه.
- كل ما يفيد صدام, يضر العراق.
- ادانة الاعتداء التركي.
- الاسلام و القومية, من مقال للدكتور فاضل رسول.

**ئەگەر سەرنجی بابەتە بڵاوکراوەکانی** (صرخة كردستان) **بدەین دەبینین بابەتی وەرگێڕاوی (تەرجەمەکراوی) چریکەی کوردستانی تێدا نابینین، بەڵام هەندێك بابەت و کێشەی بەردەوامی کوردستان و عێراق و هەرێمەکە لە هەردوو گۆڤاردا باسکراوە و لەسەری نووسراوە، وەك شەڕی عێراق ئێران، وە مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کورد و کورد لای بێگانە و مافی ئادەمیزاد و کێشەی کورد، ئەم بابەتانە لە (چریکە و صرخة) دا هاتووە، بەڵام هەر بابەتە بە بۆچوونی نووسەرەکەیە و هیچی تەرجەمەکراو نییە،**

هۆیەکەشی ئەوەیە ماوەی  دەرچوونی نێوان چریکە و صرخة دوورە تەنیا ژمارە یەکی صرخة لە حوزەیرانی ١٩٨١ز دەرچووە و ژمارە  چواری چریکە لە کانونی یەکەمی ١٩٨١ز دەرچووە، ئەم دوو ژمارەیە لە ساڵێکدا بلاوکراوەتەوە، ئەگەر نا ئەوانی تر ماوەی دەرچوونیان لە یەکتر دوورە و بابەتی تازە هاتۆتە پێشەوە بۆیە پێویستی بە بابەتی وەرگێڕاو نەبووە..

لە بارەی شەڕی عێراق و ئێران صرخەی کوردستان رای خۆی بەم شێوەیە دەربڕیوە:

((ان كراهية أهالي العراق الشديدة على اختلاف قومياتهم و أديانهم و مذاهبهم و معتقداتهم السياسية لنظام صدام الاجرامي و نضالهم الدؤوب من أجل اطاحته لا تعني اطلاقا انهم يرضون, لا بل و لا يقاومون احتلال وطنهم من قبل القوات الايرانية مهما كانت الاسباب و الدوافع..))[156]

واتە خەڵکی عێراق هەرچەند رقیان لە صەدام و رژێمەکەیەتی و بە هەموو توانا هەوڵی رووخانی ئەدەن، بەڵام قەت بەوە رازی نابن ئێران خاکیان داگیربکات و دەستەوئەژنۆ دانیشن خاکیان داگیر بکرێت لە ژێر هەر پەردە و بیانوویەك بێت..

دیارە ئەم هەڵوێستەی گۆڤاری صرخە بۆ رای گشتی عێراقی و عەرەبی هەڵوێستێکی نیشتمانی پاکە و گەلی عەرەب زۆریان پێ خۆشە و بەم هەڵوێستە عەرەب زیاتر لە گەلی کورد و بزوتنەوەی کوردایەتی نزیکرت دەبنەوە..

---

[156] صرخة كردستان العدد ٤-٥ ايلول ١٩٨٦م ص ٧٧.

**وە لە لاپەڕە (٧) وتارێکی پارتی کۆمۆنیستی عێراقی بڵاوکردۆتەوە دەربارەی تاوانی هێرشی ئەمریکا بۆ سەر کۆماری لیبی و تیایا هاتووە:**

((ان الحزب الشيوعي العراقي اذ يدين العدوان الامبريالي الامريكي الوحشي على الجماهيرية الليبية, يعلن تضامنه الحار مع الشعب الليبي المناضل و قيادته الوطنية في وقوفها الشجاع ضد العدوان الظالم و يدعو جماهير شعبنا عربا و أكرادا و أقليات قومية.. لابداء الدعم و المساندة للجماهيرية الليبية))[١٥٧]

**لە وتارەکەدا هاتووە پارتی کۆمۆنیست ناڕەزایی دەردەبڕێ بەرامبەر ئەو هێرشە تاوانکاریەی ئەمریکا بۆ سەر گەلی لیبی و هاودەردی و هاوکاری خۆیان و گەلی عێراق بە کورد و عەرەبەوە دەردەبڕن بۆ پشتگیری گەلی لیبی و سەرکردایەتیەکەی...تا.**

**وە هەر لەو بارەیەوە بروسکەیەکی جەلال تاڵەبانی سکرتێری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستانی بۆ سەرهەنگ معمر قەزافی بڵاوکردۆتەوە و تیایا هاتووە:**

((تلقينا نحن اخوانكم في الاتحاد الوطني الكردستاني و الثورة التحررية المندلعة في كردستان تلقينا بالغضب و الاستنكار الشديدين اخبار العدوان الامريكي الغاشم على الجماهيرية الليبية التي غدت قلعة للثورة و القوى التحررية في العالم.))[١٥٨]

---

[١٥٧] **صرخة كردستان العدد ٤-٥ ايلول ١٩٨٦م ص ١٦-٣٢.**

[١٥٨] نفس المصدر، ص ١٦-٣٢.

واتە ئێمەی براتان لە ی.ن.ك و شۆڕشی رزگاری بەرپابوو لە کوردستاندا بەوپەڕی ناڕازی بوونەوە زانیمان تاوانی شێتگیرانەی ئەمریکا بۆ سەر لیبیای گەلی بۆتە قەڵای شۆڕش و هێزی رزگاری خوازی جیهانی.. تا دوایی.

لە لاپەڕە (٤٩)دا بابەتێکی بڵاوکردۆتەوە (حقوق الانسان و القضية الكردية) كە وتاری سەرۆکی رێکخراوی مافی مرۆڤ بەڕێز (جیم دانJim Dunn) کە لە مانگی ئابی ١٩٨٥ز لە (کەمبیر) پایتەختی ئوستراليا کۆبوونەوەیەك بەسترابوو نوێنەرانی پارتە سەرەکیەکانی و حکومەت و لیژنەی مافی مرۆڤی ئوسترالی و رێکخراوی لێبوردنی نێودەوڵەتی و لیژنەکانی نەتەوە نیشتەجێیەکانی ئوسترالی تێدا بەشداربوون، لە وتارەکەی (جیم دان)دا هاتووە:

((ان الشعب الكردي يملك ميزات خاصة و يكون احدى اكبر الجماعات الاثنية في منطقة الشرق الاوسط, لا شك بان الاكراد يمثلون أكبر امة في العالم حرمت من حق انشاء دولة خاصة بهم تمكنهم من صيانة و تطوير تراثهم الغني.... لەسەری دەڕواو لە کۆتاییدا دەڵێت:

الحقيقة المرة و التي لها تأثير سلبي على الوضع الكردي هي وقوع وطنهم كردستان في منطقة تلتقي فيه خمسة دول مختلفة و هي تركيا و ايران و العراق و سوريا و الاتحاد السوفيتي, حيث يتعامل بعض هذه

الدول أفراد هذا الشعب معاملـــــة الاســـرى فعـــلا و خاصـــة تركيـــا و العراق..))[159]

**وە هـەر لـەو کۆبوونەوەیـەدا (سـیناتۆر دونـالد جیـب) سـەرۆکی پـارتی دیموکراتی ئوسترالی لە وتەیەکیدا گوتی:**

((يجب ان يكون للحكومة الاسترالية رأي واضح تجاه هـــذه القضايـــا أكانت في جزر تيمور القريبة أو في تركيا البعيدة من استراليا, ان مـــــن اولى واجباتنا كشعب هو أخذ المسألة الكردية الى الامم المتحدة.))

**بەو شێوەیە لەسەری دەڕواو لە کۆتاییدا دەڵێت:**

((كم مليونا من الشعب الكردي يجب أن يموت حتى يثير هـــذا البلـــد القضية الكردية في الامم المتحدة؟!, المنظمة العالمية الوحيدة التي بوسعها القيام بعمل مثمر في هذا المضمار, هل السبب يكمن في ضغـــط امريكـــا علينا؟! لان هذه القضية ستزعج الاتراك؟ هل وصلنا الى هذه الدرجة من الدناءة ام أصبحنا جبناء الى هذا الحد فاصبحنا لعبة في يد أمريكا..؟!))[160]

**لەلاپەڕە (٥٩)دا وتارێك نووسراوە لە ژێر ئەم سەرناوەی خوارەوە:**

((اثارة القضية الكردية في لجنة حقوق الانسان للامم المتحدة))

**تیایا هاتووە:**

((عقدت اللجنة الفرعية (لجنة ايقاف التمييز و الدفـــاع عـــن حقـــوق الاقليات) التابعة للجنة حقوق الانسان للامم المتحدة اجتماعـــها الـــدوري الثامن و الثلاثين في جنيف –سويسرة في الفترة الواقعة بين (٢٠-٢٦)اب ١٩٨٥م و كانت الدورة خاصة بمناقشة انتهاكات الدول الاعضاء لحقـــوق

---

[159] [159] **صرخة كردستان العدد ٤-٥ ايلول ١٩٨٦م ص٥٠ وتارى (جيـم دان) لـە (كمبير) استراليا.**

[160] **صرخه كردستان العدد ٤-٥ ايلول ١٩٨٦م ص٥٦، وتارى سيناتۆر دونالد جيب.**

الانسان و الحريات العامة.. و قد تم لاول مرة منذ عام ١٩٧٥م اثارة القضية الكردية و نضاله العادل من قبل ثلاث منظمات عالمية غير حكومية و ذلك بتقديم تقارير خاصة حول الاوضاع العامة للشعب الكردي المناضل لادراجها في جدول اعمال الدورة و مناقشة المسألة من أوجه مختلفة و طالبت بإثارة قضية الشعب الكردي في الجلسة الاربعين للجمعية العامة للامم المتحدة و منح الشعب الكردي الحق في الاشتراك في أعمال الامم المتحدة على غرار منظمة التحرير الفلسطينية و ناميبيا..))[١٦١]

التقرير الاول في جلسة ١٩٨٥/٨/٢٣م للسيدة (**ڤيرياگراف**) ممثلة العصبة العالمية من أجل حقوق و تحرير الشعوب.

التقرير الثاني في الجلسة الصباحية في ١٩٨٥/٨/٢٦م للسيدة (**پيپاتاكمان**) ممثلة مجموعة حقوق الاقليات.

التقرير الثالث في الجلسة المسائية في ١٩٨٥/٨/٢٦م للسيد (**ريكاردو اسيبۆزا**) ممثل المركز الاوربي العالم الثالث..

**أ- لەو سێ راپۆرتەدا هاتووە پێویستە بە وردی چاودێری باری کوردەواری بکرێت لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لە تورکیا و ئێران و عێراق کە بە بەردەوامی پێشێلی بەندەکانی (٥، ٦، ٧، ٩، ١٩، ٢٠، ٢٦، ٢٧) دەکرێت لە لایەن ئەو سێ حکومەتەوە..**

**ب- هەروەها لە راپۆرتەکاندا هاتووە دەڵێت بە توندی داوا دەکەین وە زۆر پێویستە دایەلۆکی (مناقشە)ی کێشەی سیاسی کورد بکرێت لە چوارچێوەی نەتەوە یەکگرتووەکان، وە داوا دەکەین لە دەزگاکانی ئەو**

[١٦١] صرخه كردستان العدد ٤-٥ ايلول ١٩٨٦م ص ٥٩.

ڕێکخراوە و لیژنەی مافی مرۆڤ کە ڕێز لە بڕیارەکانی خۆی بگرێت و کێشەی کورد لە بەرنامەی خۆی دابنێت بۆ ئەوەی میللەتی کورد کە ژمارەی لە (٢٠) بیست ملیۆن مرۆڤ زیاترە بتوانێ مافی قسەکردنی هەبێت لە سەکۆی نەتەوەیەکگرتووەکان وەکو فەلەستینی و نامیبیاکان.

ج- هەر لەو ڕاپۆتانەدا هاتووە، کێشەی کورد کێشەیەکی جیهانییە و دەبێ لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، ئاشکرایە زۆربەی گەلی کورد تووشی نائومێدی بوونە دەربارەی باری نالەباری خۆیان و داوای (عەدالەت) دادپەروەری و مافی ئادەمیزادی خۆیان دەکەن وەك تاك و کۆ... تادوایی.

وە لە لاپەڕەی (٦٢)دا ڕاپۆرتێك بڵاوکراوەتەوە لە ژێر سەرناوی:

((الاكراد في شرق الاناضول- صراع من اجل الهوية))

ڕاپۆرتەکە ڕۆژنامەی لۆمۆندی فەرەنسی نووسیویەتی و ڕۆژنامەی (الخليج) وەری گێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی لە ١٩٨٥/٧/٢٧ بڵاوی کردۆتەوە و تیایا نووسراوە:

کورد لە تورکیا لە هەموو مافێکی مرۆیی بێبەشە و لە لایەن حکومەتی تورکیاوە بەچاوی سووك سەیر دەکرێت، زمانی کوردی، فۆلکلۆری کوردی، خوێندن و نووسین بە کوردی، تەلەفزیۆن و ڕادیۆ بە زمانی کوردی هەمووی قەدەغەیە، وە هەتتا کورد لە ناخی خۆشیا نابێ خۆی بە کورد بزانێ بەڵکو دەبێ خۆی بە تورکی شاخاوی بزانێ..

ڕۆژنامەکە دەنووسێ:

سلیمان دەمیرێل سەرەك وەزیرانی پێشووی تورکیا کە ئێستا لە ماڵی خۆیەتی و رێگای پێنادەن کاروچالاکی سیاسی بکات لێمان پرسی دەربارەی چارەسەری کێشەی کورد گوتی:

راستە بەم زوانە چارەسەر ناکرێت، بەڵام پیلانی زۆرمان لەبەردەستدایە بۆ بەربەرەکانی کوردەکان، بەهێز، وە من ئەوە بە ئاشکرا دەڵێم کە رەحمیان پێناکەین و رێگای هیچ جموجۆڵێکی سیاسی کوردەکان نادەین..[162]

رۆژنامەکە لەسەری دەڕواو دەنووسێت:

هەرچەندە بیروبۆچوونی جیاواز هەیە لە تورکیا دەربارەی کورد، بەڵام چەپڕەوەکان دەڵێن دەبێ پێشتر هەوڵ بدرێت تورکیا دیموکراتی بکرێت و عەسکەرتاری تیا نەمێنێت ئەوسا دەتوانرێ چارەی کێشەی کوردیش بکرێت لە چوارچێوەی دیموکراتیەتدا..

بەو شێوەیە دەبینین گۆڤاری (صرخة کردستان) بابەتەکانی زۆربەی زۆری دەربارەی کێشەی سیاسی کورد و ویستویەتی خوێندەوار و رۆشنبیری عەرەب بەو کێشەیە ئاشنا و شارەزا بکات و رای گشتی نەتەوەی عەرەب بۆ پشتگیری لەو مەسەلەیە داین بکات.

وە هەر بۆ نموونە لە لاپەڕە (١٧٢)دا هاتووە برامان سەرهەنگ قەزافی لایەنگری دامەزراندنی دەوڵەتی کوردییە، لە لاپەڕە (١٧٣)دا هاتووە سەرهەنگ قەزافی لە کۆنگرەی دووەمی مەسابەی (مثابة) جیهانی بۆ بەرەکانی ئیمپریالیزم و سایۆنیزم و گۆشەگیری نەتەوایەتی و کۆنەپەرست

---

[162] صرخە کردستان ژمارە ٤-٥ ئەیلولی ١٩٨٦ز ل ٦٨.

و فاشیزمدا لە ئێوارەی ١٩٨٦/٣/٥ز داپێ خۆشحاڵیی خۆی دەربڕی بە ئامادەبونی نوێنەری هەموو گروپەکانی کورد لەو کۆبوونەوەیەدا.

قەزافی لەو کۆنگرەیەدا دەڵێت:

ئێستا لەم کۆبوونەوەیەدا نوێنەری نەتەوەی کوردمان لەگەڵە، ئەو نەتەوەیەی کە تووشی جۆرەها ئەشکەنجە و ستەم و زۆرداری هاتووە لە لایەن دراوسێکانیەوە کە رێگایان لێگرتووە بۆ ئازادی و سەربەخۆیی و یەکێتی..

وە دەڵێت:

ئێمە ناتوانین وەزعی ئەم نەتەوەیە زۆرلێکراوە لە بیر خۆمان بەرینەوە و بە ئاشکرا دەڵێین و بە هەموو دنیای رادەگەیەنین کە ئەم میللەتە مافی یەکێتی خاك و سەربەخۆیی تەواویان هەیە..

# هەڵسەنگاندنی گۆڤاری چریکە بەلای ئێمەوە

گەر بێتو بە دیدو نیگایەکی وردەوە سەرنجی ژمارەکانی گۆڤاری چریکەی کوردستان بدەین چەند بۆچوون و تێبینیەکی ڕاست و ڕەوانمان بۆ دەردەکەوێ:

گۆڤاری چریکە لە دوای هەرەسی شۆڕشی ئەیلولی مەزن و لەسەردەمی بەخۆداچوونەوە و ڕاچەڵەکین و بە ئاگاهاتنەوە و ڕاپەڕینی نوێی نەتەوەکەمان هاتە مەیدانی ڕۆژنامەگەری و فەرهەنگی و سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردیەوە لە هەندەران، فەرمان و ئەرکی چریکە بارێکی گران بوو بە کۆڵی سەرنووسەر و خاوەنی گۆڤارەکەوە.

قۆناغەکە زۆر ناسك و نالەباربوو، بزوتنەوەی کورد دوای ئەو شکستە گەورەیە پارچەپارچە و لێپرسراوو کادرەکانی وێڵ و سەرگەردان بوون بە وڵاتانەوە، پیلانی داگیرکەرانی کوردستان بۆ کڕینی ویژدانی تێکۆشەرانی میللەتەکەمان لەو پەڕیدا بوو.. خەڵکی نەفس نزم و سووك و بێبار دەورەیان لە ڕژێم دابوو.. سۆڤیەت و بلۆکی سۆسیالیستی و دۆستەکانیان لەناو کوردستان وایان بڵاودەکردەوە بزوتنەوەی کورد چونکە سەر بە ئیمپریالیزم بوو، داردەستی ئێران و ئەمریکا بوو، گوێی نەدایە ئامۆژگاری یەکێتی سۆڤیەت بۆیە ئەنجامی بەو ڕۆژە ڕەشە گەیشت.. توانای دارایی حکومەتی عێراق زۆر زیادی کردبوو، بەرمیلی نەوت لە (١٢) دۆلارەوە گەیشتە (٣٨) دۆلار معاهدەی عێراقی و سۆڤیەتی ئیمزا کرابوو لە مانگی

هەنگوینیدابوو، پەیوەندی عێراق بە حکومەتە عەرەبی و دەرودراوسێ و دەوڵەتانی بێ لایەن باندونگ و ئەفریقیا و ئەمریکای لاتینی زۆر بەهێز بوو، حکومەتی عێراق بە تەواوی لە خۆی بایی بوو کەوتە وێزەی شیوعیە هاوپەیمانەکانی و گرتن و لە سێدارەدانی کادرە تێکۆشەرەکانی و راونانی ئەوانی تریان.. وە هیچ حیسابێکی بۆ گەلی کورد نەدەکرد و کەوتە گواستنەوەی کۆمەلانی خەڵکی لادێ و شارو شارۆچکەکان بۆ ئۆردوگا زۆرەملێی ریسواکەرەکانی و تەخت کردنی شار و شارۆچکە و گوند و مزگەوت و قوتابخانە لە کوردستان، وە داماڵینی چەك لە هەموو کورد و پرچەککردنی عەشایەری عەرەب و نیشتەجێ کردینان لە ناوچە نەوتیەکانی کوردستان، بە کۆمەڵ گواستنەوەی فەرمانبەر و تێکۆشەرانی میللەتەکەمان بۆ عەرەبستان، وە بەستنی پەیمانی دوو قۆڵی و نهێنی لەگەڵ تورکیا و ئێران لە دژی بزوتنەوەی کوردایەتی و بە زۆر خەڵك کردنە بەعس و سرینەوەی بەندەکانی بەياننامەی ئاداری ١٩٧٠ز و نەهێشتنی کۆڕی زانیاری کورد و یەکێتی نووسەرانی کورد و توانەوەیان لە بۆدەقەی عێراقی و عەرەبی و هەڵوەشاندنەوەی رێکخراوەکانی لاوان و قوتابیان و مامۆستایان و ئافرەتانی کوردستان، صەدام لە تەلەفزیۆنی عێراق اعلانی کرد جارێکی تر چەکدار لە کوردستان پەیدا نابێتەوە و بە ئاشکرا گوتی ((جلال لو يطلع نخلة براسه ماراح يشوف عشر مسلحين وراءه)).

واتە جەلال تاڵەبانی دراخورما لەسەری شین بێت جارێکی تر دە چەکدار بە دوای خۆیەوە نابینێت.

هەموو ئەو دیمەنە تاریك و ئاڵۆزە لە لایەك..

لە بەرامبەردا عەدالەتی مەسەلەی کورد و کێشە رەواکەی خەڵکی کوردستان، هەستی بەرزی نەتەوایەتی و خۆنەویستی تێکۆشەرانی

میللەتەکەمان، دوای ئەو گەلە کۆمەکیەی لە کورد کرا لە جەزائیر بە پرس و ئاگادرای رووس و ئەمریکا و بە بەرچاوی دنیاوە، وە لە ئەنجامی کاردانەوەی (رد الفعل) سیاسەتی (تەعریب و تەبعیس و تەهجیر) گۆڤاری چریکەی کوردستان هاتە مەیدانی خەباتی سیاسی و رۆژنامەگەری کوردیەوە لە هەندەران، چریکە هەرچەندە لە رووی هونەر و تەکنیکەوە (چاپ و رۆنیۆ و تیپ و تایپ و مەرەکەب و رێنووس و رێزمان و کاغەز و قەوارەوە) کەم و کورتی زۆرە، هۆیەکەشی بۆ توانایی دارایی خاوەن گۆڤارەکەیە، بەلام لە رووی هونەری دارشتن و هەلبژاردنی بابەتەکان و سەرباسەکان و ناوەرۆکەوە زۆر پێشکەوتووە، هەروەها شێوەی نووسینی زمان واتە ئەو شێوەیەی بابەتەکانی پێنووسراون زۆر لە برەودایەو لە ریزی پێشەوەی گۆڤارە کوردیەکان دەژمێردرێ، لە هەموو ژمارەکانی چریکە بابەتی بەپێزی تێدایە لەسەر زمان و شیعر و چیرۆك و لێکۆلینەوە و هەوال و دەنگوباسی دنیا و کورد لای بێگانە و مافی چارەی خۆنووسین و مێژوو و رۆشنبیری و خەباتی سیاسی.. بەلای ئێمەوە گۆڤاری چریکە کەلێنێکی باشی پرکردۆتەوە، لە مەیدانی رۆژنامەگەری و رۆشنبیری کوردی لە دەرەوەی ولات..

# بەرهەم و داهێنانی برایم ئەحمەد

## لە گۆڤاری چریکە و صرخة کوردستاندا

واتە لە نۆ ژمارەی چریکە و پێنج ژمارەی صرخة کوردستاندا (٣٠) سی بەرهەمی خۆی تیا بڵاوکردۆتەوە بە کوردی و بە عەرەبی.

دەتوانین ئاماژە بەوە بکەین گۆڤاری چریکە بە لای برایم ئەحمەدەوە درێژە پێدەری گۆڤاری گەلاوێژە و هەوڵی داوە چریکە ببێتە گەلاوێژی دووەم، هەرچەندە لە رووی شێوە و بارست و قەوارەوە لە گەلاوێژ دەچێت، بەڵام لە باری ناوەڕۆك و رەنگ و بۆن و بەرامەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ

گەلاوێژدا، چونکە زەرف و زەمان و سەردەم جیاوازی زۆری هەیە کە زیاتر لە سی ساڵ نێوانیانە.. هەرچی گەلاوێژە گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی بوو، زۆربەی هەرە زۆری ئەدیب و رۆشنبیری کورد تیایدا بەشداریان دەکرد لە دەرچوون و بەردەوام بوونی لە وڵاتدا، چریکەی کوردستان لە دەرەوەی وڵات بە کەساسی و مەلوولی دەردەچوو، بابەتەکانی سیاسی و رۆشنبیری گشتی بوون، هەرچەندە بابەتی زمانەوانی و ئەدەبیشی بڵاودەکردەوە، بەڵام چونکە ئەدیب و رۆشنبیرانی ناو نیشتمان لەمپەڕ لەبەردەمیان هەبوو، نەیان دەتوانی بەشداری تێدابکەن، چریکە بە هەوڵ و توانا و دارایی کزی تایبەتی برایم ئەحمەد خۆی دەردەچوو، ئەوانی بە بەردەوامی هاوکاریی‌یان دەکرد تەنیا دکتۆر کەمال فوئاد و کەمال میراودەلی و محمد رەسول هاوار و تۆفیق وەهبی بوون جاروبار فەرهاد شاکەلی بەرهەمەکانی خۆی بۆ دەناردن.

بۆیە بەلای منەوە ناکرێ چریکەی کوردستان بە درێژە پێدەری گەلاوێژ دابنرێ با ئەوە ئاواتی خاوەنەکەشی بووبێت، جگە لەوەش چریکە مانگانە نەبوو لەماوەی (٧) ساڵدا (٩) ژمارەی لێ‌دەرچوو بە کوردی و پێنج ژمارەی بە عەرەبی لێ‌بڵاوکرایەوە، لە رووی ئاستی رۆشنبیریی نەتەوەیی‌یەوە چریکە پێشکەتووە بەڵام لەبەر بێ توانایی دارایی و دوورە وڵاتی‌یەوە لەبارەی ئەدەبی‌یەوە لە ئاستی گەلاوێژنەبوو.

- پێم وانی‌یە چریکە بەرە و پێشەوە چووبێت بە بەراورد لەگەڵ گەلاوێژدا.

لەبارەی زمان و داڕشتنەوە: دیارە سەردەمی چریکە زمانی کوردی زیاتر گەشەی کردبوو، بۆیە دەبینین زمانی بابەتەکانی چریکە تۆکمەتر داڕێژراوە و پاراوترە و رستەکان لەبارەی رێزمانەوە جوانتر چۆتە قاڵبی دارشتنەوە...

رێباز و میتودی چریکە روونترە لە رێبازی گەلاوێژ، هەرچی گەلاوێژبوو ئامانج و ئاواتی گەشەکردنی زمان و ئەدەبی کوردی بوو، رێبازی چریکە رێبازێکی سیاسی و رۆشنبیری و شۆڕشگێڕی بوو.

بابەتەکانی گەلاوێژ زیاتر وەصفی بوون، بابەتەکانی چریکەی کوردستان شێوازی تەحلیلی لە خۆگرتبوو ئامانجی روونکردنەوەی کێشەی رەوای گەلی کورد بوو بۆ دنیای دەرەوە ناساندنی مەسەلەی کوردستان بوو بە جیهان.

(مەدای مەعریفی) واتە هێزی دەقەکان لە چریکەی کوردستاندا شێوازی تەحلیلی تیا بەدی دەکرێ.

لە گەلاوێژدا ئایدایی هونەری و جەمالیەتی دەقەکان بەرچاوترە، لە پراکتیکدا سلۆگاکان –شیعارات– لە چریکەدا زۆر زەقە کەچی لە گەلاوێژدا کەمتر بەرچاو دەکەون.

# (زمانەوانی)

برایم ئەحمەد لەبارەی زمانی کوردیەوە زۆر خۆی خەریك کردووە.. چەندین لێکدانەوە و بیروبۆچوونی ڕەنگینی لەبارەی ڕێنووس و ڕێزمانی کوردی دەربڕیوە..

دیارە لەو سەردەمەدا ڕێنووس بەپیتی عەرەبی لەزمانی کوردیدا کێشەی زۆری درووست کردووە چونکە نووسین بەزمانی کوردی لە گرۆگاڵ و پێڕەوکەدا بووە.

ڕۆشنبیرانی کورد هەوڵی زۆریان داوە زمانەکەمان لە ووشەی بێگانە بژارو پاك بکەنەوە.

ڕێکخستن و داڕشتنی پیت، ووشە، ڕستەی ڕەوان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان زانیوە. بۆئەوەی نەوەی تازە پێ ڕابێن و بێنە سەر شارێگای ڕاستی زمانەوانی..

شاراوە نیە پسپۆڕی بەناوبانگی کورد (تۆفیق وەهبی) سەرقافڵەی ئەو کاروانە بووە و دەیان ووشەی بۆ زمانەکەمان داڕشتووە کە لەگەڵ سەلیقەی زمانی زگماك بگونجێ و واتای تەواو بدات بەدەستەوە.

برایم ئەحمەدیش دەیان ووتاری دەربارەی زمان و زمانەوانی، پیتە بزوێن و نەبزوێنەکان لەزمانی کوردی و سەرو بۆر و کۆبی دانان بۆ هەندێك لەو پیتانە.

تابەتەواوی لە ئاخاوتندا بێتە دەرەوە و بەئاسانی و بەبێ گریێ و گولّ (تەلەفن) بکرێت.

لە گۆفارو ڕۆژنامەکاندا، لە دەمە تەقێ و لێکۆڵینەوەکاندا پەنجەی لەگەڵ تۆفیق وەهبی و عەلادین سەجادی و چەندین شارەزاو پسپۆڕی زمانەوانی گرتووە.

هەرچەندە نامانەوێ درێژە بەم باسە بدەین لەبەر زۆری بابەتەکان بەلاّم گومانی تێدانیە برایم ئەحمەد کوردی زانێکی ڕەوان و بەهرەمەندێکی ژیرو بە تواناو دڵسۆزی زمانەکەمان بووە...

هە موو زمانزانەکانی سەردەمی خۆی و دواتریش دان بەو ڕاستیەدا دەنێن کەناوبراو بەڕاستی شاگوڵی سەرچڵەکان و سوارچاکی ڕم وەشێن بووە.

بەیاری زمانی کوردی ئاودێر کردووە، بەبیری تیژو بەهەستی قووڵی چۆتە ناو دنیای ڕێنووس و ڕێزمانی کوردی یەوە و نووسینەکانی تائێستا سەنگی خۆیان لەدەست نەداوە.

لەم بارەیەوە چەند نموونەیەك دەخەینە بەردەستی خوێنەری بەرێز کەلە گۆڤارەکاندا بلاّوی کردۆتەوە:-

١- وتەی پێشکەش کردن، گۆڤاری گەلاوێژ، ساڵی یەك ژمارە (١) بەغدا ١٩٣٩ز لاپەڕە (١-٢).

٢- خۆپاراستن لە لایەنگیری ناڕاستی./ گۆڤاری (شەفەق) ژمارە ٥-٦بەغدا ساڵی ١٩٥٨ز لاپەڕە ٦-١١.

٣- چۆن زمانەکەمان بنووسین/ گۆفاری هیوا/ بەشی یەکەم ژمارە ٤ساڵی یەك بەغدا ١٩٥٧ز ل١٠-١٧، بەشی دووەم لە ژمارە ٦ساڵی یەك بەغدا ١٩٥٧ز لاپەڕە (٨-١٩).

٤- فرمانی ئێستامان/ گۆفاری هیوا/ ژمارە نۆ ساڵی یەك بەغدا ١٩٥٨ز لاپەڕە ٧-١٨.

وەچەندین ووتاری تر لەو بارەیەوە نووسراوە.

# برایم ئەحمەد لەدیدی رۆشنبیرانی کوردەوە

دوای ئەو هەموو خەبات و داهێنـان و بەرهەمانە بابزانین نووسەران و ڕۆشنبیرانی خۆماڵی لە بارەی برایم ئەحمەد و گەلاوێژەوە چیان نووسیوە؟

## هێمن مهابادی:

شاعیری گەورەی کورد (هێمن مهابادی) لەبارەی گەلاوێژەوە دەڵێت: (من لەسەردەمێك خەریکی کوردی فێربوون بووم کەپرشنگی (گەلاوێژ) ی گەش خەریك بوو وردە وردە ئاسۆی لێڵ و تەماوی زمانەکەمان ڕوون و ڕوونتر بکاتەوە و فۆلکلۆری ئەدەبیمان ببوژێنێتەوە و ئەدەبەکەمان بەرەو پێش بەرێت و بەردی بناغەی زمانی یەکگرتووی کوردی دابمەزرێنێ...[١٦٣]

## عەلائەدین سەجادی:

مامۆستا عەلائەدین سەجادی لە نامەیەکدا، کەدەربارەی ڕێنووسی کوردی بۆ برایم ئەحمەدی ناردووە ڕۆژی (١٩٥٧/١٠/٧) ی زایین لە باسی هەوڵەکانیان بۆ نووسینی زمانی کوردی و چارەسەرکردنی کێشەکانی وێنەی هەندێ دەنگ لە زمانی کوردیدا بەم شێوەیە لەرۆڵی خۆی و برایم ئەحمەد دواوە:

[١٦٣] - گۆڤاری بەیان ژمارە(١٨٤) ساڵی ١٩٩٩ ل ٨ لەنێوان تۆفیق وەهبی و موکریانی.

((بیستم مەقالێکت ناردوە بۆ گۆفاری هیوا ، لەلایەن ئیشارەتەکانەوە قسەت کردووە، هەرئەوەندەم بیستووە و هیچی تر..ئیتر نازانم چی‌یە؟ نازانم تائەو ساڵە کەمن و تۆ دانیشتین و قسەمان لێدەکردوفیکری هەردووکمان هاتە سەر ئەوە کەچوار حەرف هەیە مشکلە پەیدادەکات (ر، ی، ل، و) ئەمانەبوون. ئەوەبو قەرار بوو کەئەمانە بۆ ئەوەی لێك جیابکرێنەوە هەریەکە حەوتێکیان لەسەربێ.

لەپاشا من ناردم ئەم ئیشارەتانەیان داڕشت و یەکەم شتێك کەبەمانە لەچاپدرا رسالەی (ناوی کوردی بوو) لەوێدا من باسم کردووە لە مقەدمەکەدا کە ئەمانە لەسەر فیکری من و تۆ بووە، ئیتر لەغەیری ئەم چوارە من بەش بەحاڵی خۆم موافق نیم بۆ هیچی تر)).[١٦٤]

## مام جەلال تاڵەبانی:

مام جەلال تاڵەبانی سکرتێری (ی، ن، ك) دەڵێت:

(پێویستە لە پێشەوە ئەو ڕاستی یە بسەلمێنین کە پێکهاتەی کەسایەتی مامۆستا برایم ئەحمەد تێکەڵاو بوونی بەهرە و توانا و بیروهۆش و هەست و خۆستی خۆیەتی، هەر لەماڵەوە لەسەر دەستی مامی ڕەوشت و خووە بەرزەکانی وەك سەرڕاستی و ڕاستگۆیی و سەراحەت و جورئەت و قسەی حەق لەڕووی دوژمندا و بێز کردنەوە لە دوو ڕووی و نۆکەرایەتی بێگانە و هەستی کوردایەتی و جوامێری و دلێرایەتی فێربووە).[١٦٥]

---

[١٦٤] - علاءالدین سجادی دانای نیشانەکانی پیتی کوردی گۆڤاری ڕۆژی نوێ ژمارە ١٢ ساڵی ١ سلێمانی ١٩٦٠ ل ١٦

[١٦٥] - کوردستانی نوێ ژمارە (٢١٥٠) لە ٢٠٠٠/٥/٢٠

## نەوشیروان مستەفا ئەمین:

نەوشیروان مستەفا ئەمین سیاسەتمەداری گەلەکەمان:
ژیان و چالاکیەکانی برایم ئەحمەد بەسەر پێنج قۆناغدا دابەش دەکات لە قۆناغی ژیان و ئەدەبدا دەڵێت:
(دەتوانین بڵێین وتاری (شاعیرەکانمان) مەبەست ووتاری برایم ئەحمەدە، چوارچێوەیەکی تیوری‌یە بۆ گۆڕینی شیعری کوردی لە ڕووی ناوەڕۆك و شێوەدا. هەوڵێکە بۆ ڕخنەیەکی وردی ئەدەبی بۆ دەربازکردنی شیعری کوردی لە قاڵبی کلاسیکدا بەرەو نویٚ کردنەوە و ئەم ووتارە تا ئێستا نرخێکی ئەدەبی هەیە).[١٦٦]

## پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ:

دەڵێت: (گۆڤاری گەلاویژ بە دیارترین گۆڤاری ئەدەبی کوردی دادەنرێت، ئەمەش بەو هۆیەوە کە ماوەیەکی زۆر بەردەوام بووە توانیوێتی بەرەیەکی فراوان لە نووسەرانی کورد وێرای جیاوازی بیرو باوەڕیش لە لاپەڕەکانیدا کۆبکاتەوە).[١٦٧]

## کۆنسەی سەرۆکایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە):

کۆنسەی سەرۆکایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە) برایم ئەحمەد بە (سومبولی یەکێتی نەتەوەیی ئاڵای ئازادی گەلەکەمان دادەنێت).

---

[١٦٦] - ڕۆژنامەی کوردستانی نویٚ ژمارە (٢١٤٩) لە ٢٠٠١/٥/١٨

[١٦٧] - د. عزالدین مستەفا رسولٚ، دەربارەی ڕۆژنامەگەری کوردی چاپخانەی (دارالجاحف) بەغدا ١٩٧٣ ل ١١

هەروەها دەنووسن و دەڵێن (دەتوانین بڵێین برایم ئەحمەد ڕۆشنبیرێکی هەڵبژاردەو سەرۆکێکی پایەبەرزی گەلی کورد بوو). [١٦٨]

## مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان:

مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان ئاوا تاریفی برایم ئەحمەد دەکات:

(سیاسەتمەدار و تێکۆشەر و ناسراوی کورد ئەدیب و ڕووناکبیر و ڕۆژنامەنووس و یاساناسی ناوداری گەلەکەمان کە خزمەتێکی زۆری بزووتنەوەی کورد و باری ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتی کوردەواری کردووە). [١٦٩]

## سەرۆکی حوکمەتی کوردستان کۆسرەت ڕەسول عەلی:

بەم جۆرە لە برایم ئەحمەد دواوە: (سەرکردەیەکی لێهاتوو شارەزاو ڕۆشنفکرێکی دیموکرتخواز لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمەوە بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلی کوردی لە کوردستانی عێرقدا بەڕێوەبردووە). [١٧٠]

---

[١٦٨] -بەیاننامەی کۆنسەی سەرۆکایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان- نیسانی ٢٠٠٠

[١٦٩] - بەیاننامەی مەکتەبی سیاسی یەکێتی نیشتمانی کوردستان – قەلاچوالان ٢٠٠٠/٤/٨ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارە ٢١١٥ ٢٠٠٠/٤/٩

[١٧٠] - پرسەنامەی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران، ڕۆژنامەی هەرێم ژمارە ١٩٥لە ٢٠٠٠/٤/١٠ل ١

## دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم:

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم برایم ئەحمەد بە (یەکێك لە تێکۆشەرە دێرینەکانی کوردایەتی و بە مۆمێك لە مۆمە گەشەکانی ڕووناکبیری کوردی دادەنێت).[171]

## گەلەری زاموای سلێمانی:

گەلەری زاموای سلێمانی دەڵێت: (برایم ئەحمەد زوخاوی کوێرەوەری یەکانی بڕی و گوێی بە درك و داڵ نەدا، لە هەرکوێ گوڵێکی سووری بینیبێ بۆی چووە).[172]

## بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ:

بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ لە وەفاو ئەمەکداری خۆیدا بەرامبەر ئەو کەڵە مێردە ڕایگەیاندووە کە (سیاستمەدارو ڕۆماننووس و شاعیرو نووسەرو دادوەر. نرخاندنی کارەکانی برایم ئەحمەد بەرزو بەڕێز دەگرێت و ڕێگا ڕۆشنەکەی هەرگیز تاریکایی داینا گرێ و مەلی ڕۆحی هەمیشە لە ئاسمانی نەمریدا بەرزەفڕەو دیارە).[173]

- **عەبدوڵڵای حەسەن زادەی** سکرتێری گشتی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران لە پێناساندنی برایم ئەحمەددا نووسیویێتی (ئەدیب و سیاسەتوانی ناسراو و بەناوبانگی کورد....).[174]

---

[171] - کوردستانی نوێ ژمارە ۲۱۱٦لە ۲۰۰۰/٤/۱۰ل۳

[172] - هەمان سەرچاوە.

[173] - هەمان سەرچاوە.

[174] - کوردستانی نوێ ژمارە ۲۱۱۷لە ۲۰۰۰/٤/۱۱ل۱

- **مەکتەبی سیاسی حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان** برایم ئەحمەدیان بە (ئەدیب و نووسەرو سیاسەتمەداری گەورەی گەلەکەمان داناوە).[175]

- **مەکتەبی سیاسی حیزبی سۆسیالستی دیموکراتی کوردستان** برایم ئەحمەد بە (تێکۆشەرو ئەدیب و شۆڕشگێڕی گەلەکەمان دادەنێ).[176]

- **شاعیرو نووسەرو ڕۆشنبیری کورد (خالد دلێر):** پێی وایە (بلە) (شاعیرو نووسەرو سیاسەتمەدارێکە کە بە درێژایی تەمەنی تێکۆشەرێکی شۆڕشگێڕی ڕیزی پێشەوەی کاروانی خەباتی خەڵکی کوردستان بووە).[177]

- **کەریم ئەحمەدی سکرتێری حیزبی شیوعی کوردستان:** بەم چەشنەی خوارەوە برایم ئەحمەدی هەڵسەنگاندووە (تێکۆشەری نەتەوەیی دیاری بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی نیشتمانی کوردستان کە ژیانی خۆی لە پێناوی مافی چارەی خۆنووسین بۆ گەلی کوردستانی بەهەموو میللەتانی بڕا تورکمان و کلدان و ئاشوری‌یەوە خەباتی هاوبەشی عەرب و کورد بۆ هێنانە کایەی عێراقێکی دیموکراتی فرە حیزبی فیدراڵی تەرخان کردبوو).[178]

---

[175] - هەمان سەرچاوە.

[176] - هەمان سەرچاوە.

[177] - کوردستانی نوێ ژمارە ٢١١٧لە ٢٠٠٠/٤/١١ل٣.

[178] - کوردستانی نوێ ژمارە ٢١١٧لە ٢٠٠٠/٤/١١ل٣.

- **سەنتەری ئیزیدیان** لە دەرەوەی وڵات پێیان وایە (برایم ئەحمەد نموونەی تێکۆشەرێکی خۆراگرو سیاستمەدارێکی کۆڵنەدەری کوردستانی و ڕووناکبیرو نووسەرێکی داکۆکی کار بوو لە کوردی نەدارو زوڵم لێکراوو لە پێناوی ئەو بنەمایانەدا ژیانی خۆی بەخت کرد).[179]

- **پرۆفیسۆر د. جەمال نەبەز** لە نرخاندنی برایم ئەحمەددا نووسویەتی: (لە گۆڕەپانی زمان و وێژە و بزووتنەوەی ڕامیاری کورددا، بە درێژایی سەدەی بیستەم، بابەتێکی دیارو بەرفراوانە و شایانی لێ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەی زانستیانەی ڕۆشنبیرانەیە).[180]

- **دکتۆر عەزیز الحاج** سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیری کوردی فەیلی عێراقی دەڵێت:(برایم ئەحمەد کەسایەتی کوردی عێراقی پایەدار کەڕۆلێکی گرنگی لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد لە گۆڕەپانی سیاسی عێراق دا گێراوە بەشداری لە پەرەپێدانی ڕووناکی و ئەدەبی و تازەی کوردیدا کردووە).[181]

- **عەلی قازی** کوڕی شەهیدی پێشەوا (قازی محەمەد) کە ناسراوە بە کوڕی ڕەش، برایم ئەحمەد بە ڕۆڵەی هەڵکەوتووی گەلی کورد دادەنێ و دەڵێ (کە پێش پێکهاتنی کۆماری مهاباد و لەکاتی کۆماردا یارمەتی کۆماری داوە و جێ‌پەنجەی (بلە) زۆر دیارو ئاشکرابووە)[182]

---

[179] - هەمان سەرچاوە.

[180] -جەمال نەبەز- بەرلین ٢٢ی‌خاکەلێوە، ٢٦١٢بەرامبەر١١ی نیسانی ٢٠٠٠ز.

[181] - عزیز الحاج- پاریس- ١١ی نیسانی ٢٠٠٠ز ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ٢١١٩لە ٢٠٠٠/٤/١٣ل٣.

[182] - کوڕی ڕەش- عەلی قازی- بۆن ئەڵمانیا ٢٠٠٠/٤/١١ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژ٢١١٩لە ٢٠٠٠/٤/١٣ل٣.

- **پرۆفیسۆر شاكرۆ خدۆیی**- بەڕێوەبەری سەنتەری لێكۆڵینەوەی كورد لە مۆسكۆ، برایم ئەحمەد بە (كەسایەتی سیاسی ناسراو لە مێژووی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی هاوچەرخی كورد) دادەنێ كە (هەموو ژیانی خۆی لە پێناو پاشەڕۆژێكی درەوشاوە بۆ گەلی كورد تەرخان كردووە).[١٨٣]

- **شاعیری ناسراوی كورد (ئەحمەد هەردی)**: برایم ئەحمەد بە (سیاسەتمەدارو ڕووناكبیری گەورەو هاوڕێی دێرینی خۆی داناوە كە لە سەرەتای چلەكانەوە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی نزیكی لەگەڵیدا بووە و لەڕووی سیاسی و ئەدەبی‌یەوە زۆر شتی لێوە فێر بووە و سودێكی زۆری لێ وەرگرتووە و دەڵێت چاكەی زۆری بەسەرمەوە هەیە..).[١٨٤]

- **مەلا ئەحمەدی بانی خێلانی**- كۆمۆنیستێكی بوێر و ئازاو وشكە سۆفیەكی شیوعیەت لە كوردستانەكەی خۆماندا بیروڕای دەربارەی برایم ئەحمەد بەم ووشە ڕەنگینانە دەردەبڕێت: (برایم ئەحمەد كەسایەتی تێكۆشەرو سیاسەتمەدارو ڕووناكبیری ناوداری گەلەكەمانە و كەڵە پیاوێكی لێهاتووە كە لە نیوسەدە زیاتر شوێن پەنجەی لە بواری سیاسەت و ڕۆشنبیریدا بەرچاوە و گەنجینەیەكی زمان و ئەدەب و كولتووری گەلەكەمان بوو.. گۆڤاری گەلاوێژ و ژانی گەل و چریكەی

---

[١٨٣] - پرۆفیسۆر شاكر خدۆیی مۆسكۆ- كوردستانی نوێ ژ٢١٢١لە٢٠٠٠/٤/١٥ل٣.

[١٨٤] - ئەحمەد هەردی لەندەن ٢٠٠٠/٤/١٥كوردستانی نوێ ژ٢١٢٢لە ٢٠٠٠/٤/١٧ل ١.

کوردستان و چەندان بەرهەمی تری بەنرخی ئەو ئەستێرەی گەشاوەی ئاسمانی ئەدەبو ڕۆشنبیری کوردن..

- برایم ئەحمەدی ماندوو نەناس بە درێژایی تەمەنی خۆی لەپێناوی ئامانجەکانی گەلی کورد و بیرو بۆچونەکانیدا دوور لە هەڵپەی کورسی و پلە و پایەی شەخسی لە هەردوو مەیدانی ڕۆشنبیریدا بێ وچان لە کارو خەباتدا بوو)[185].
-
- سدیقی بۆرەکی (صەفی زادە) نووسەری مێژووی وێژەی کوردی و دەیان پەرتوکی کوردی تر لە کوردستانی ڕۆژ هەلأت: (برایم ئەحمد بەزاناو نووسەرو خەباتگێڕێکی هەرە بەرزی کورد دادەنێ)[186].
-
- سەلاحەدینی موهتەبی کە ڕۆشنبیرێکی گەورەی ڕۆژهەلأتی کوردستانە و خەڵکی شاری بۆکانە و ئێستا ئاوارەی ئەورووپایە، لە کۆچی دوای برایم ئەحمەددا بەم شێوەیە هەستی خۆی دەردەبڕێ: (پێش هەزارساڵ (ڕودەکی) ی شاعیری ئێرانی مەرگی زانایەکی زەمانەی خۆی ئاوا هەڵدەسەنگێنێ:

(لەژمارەی چاوان یەکمان لێ کەم بۆتەوە و لەژمارەی عەقڵ زیاد لەهەزاران بۆ گەلی کورد لەو سەرەتای بەهارە نەك هەرژمارە، بەڵکو مێژوی فەرهەنگ سیاسەت لەئێوارەیەکی خەفەتباردا مال ئاواییان لێکردین....).

---

[185] - ئەحمەدی بانیخێلانی، ستۆکهۆلم- ٢٠٠٠/٤/١٤کوردستانی نوێ ژ٢١٢٢لە ٢٠٠٠/٤/١٧ل ٣.

[186] - سدیقی بۆرەکی (صەفی زادە) کوردستانی نوێ ژ ٢١٢٤لە ٢٠٠٠/٤/١٩ل ٢.

نەدوژمن دواتیری خۆی هاویشتووە و نەگەل دوا نووچی خۆی داوە، بەڵام ئەوەندەش کەکراوە مەودا مەزنەکەی کە پێوراوە لە قەباڵەی مێژوودا بە ناوی برایم ئەحمەد مۆرکراوە...حەقیقەتێك لەبەرچاوی گشت لایەکمان ڕوون و بەرجەستەیە : داهێنان و دامەزراندنەکانی برایم ئەحمەد لە بواری سیاسەت و خەبات و ئەدەب و نووسین، پەخشان و شیعر و ڕۆژنامەگەری و باوەڕی کۆمەڵایەتی و بەرەنگاری داگیرکەر، بەژداری‌یە گرنگ و پڕبایەخەکەی لە کێشەی ئەزەلی نیوان جەهل و زانست وانیشتەجێ بوون لەناو خاکی نیشتمان و لە مێشکی ڕۆڵەکانیا لە گەڵ مەرگی خاوەنەکەی نەك نەفەوتاون و نەشێواون بەڵکو زۆر لە رابردوو پتەو ترو پەرەگرتووترن).[187]

■ **دکتۆر کەمال میراودەلی** نووسەری پێشکەوتن خوازو ڕۆشنبیری گەلەکەمان ئاوا برایم ئەحمەد دەناسێ (نووسەرو سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیرێکی گەورەی نەتەوەکەمان بوو کە پایەی هەمیشە بەرزی و بەرهەمی زیندووی دەمێنێتەوە ... لەچەند مەیدانێکی گرنگی ڕۆشنبیری و سیاسی نەتەوەییدا دەورێکی مێژوویی پێشڕەوانە و دامەزرێنەرانەی سەرەکی گرنگی هەبوو، کەبەداخەوە تائێستا نرخ و بایەخی تەواوی خۆی نەدراوەتێ، برایم ئەحمەد مرۆڤێکی ڕووناکبیری مەزنی خۆدروستکەرو خۆپێگەیەنەر بوو، مامۆستایەیەکی گەورەی قوتابخانەی کوردایەتی و کوردستان پەروەری بوو.. ڕێبەرێکی ڕووناکبیرو مەدەنی نموونەیی بوو).[188]

■ نووسەری ئەم کتێبە برایم ئەحمەد بە (ڕابەری ڕێکخستنی کوردایەتی و کەڵەپیاوێکی بەتوانا لە ڕووی سیاسی و هوشیاری و ڕووناکبیری یەوە دادەنێ).[189]

[187] - سەلاحەدینی موهتەبی- ستۆکهۆڵم ٢٠٠٠/٤/١٠کوردستانی نوێ ژ ٢١٣١لە ٢٠٠٠/٤/٢٧ل ٧.

[188] - د. کەمال میراودەلی- کوردستانی نوێ ژ ٢١٣٢لە ٢٠٠٠/٤/٢٧ل ٧.

[189] - ئەحمەد شەریف عەلی (کوردستانی نوێ) ژ ٢١١٩لە ٢٠٠٠/٤/١٣ل ٧.

# برایم ئەحمەد
# بە دیدی رۆشنبیر و دبلۆماتە
# عەرەبی و بیانییەکان

بۆ ئەوەی بزانین رۆشنبیرو سیاسەتمەداران و ئەدەب دۆستانی عەرەبی و بیانی چۆن دەروانن برایم ئەحمەد و لە میدانی فیکرو سیاسەتدا چ پلەو پایەیەکی بۆ دادەنێن، دەبێ چاوێك بەو بروسکەو ئەو نوسراوانەیاندا بگێڕین، کە بەبۆنەی کۆچی دوایی یەوە ناردوویانە:

- سەلاح ئەلزەواوی بالوێزی فەلەستین لە کۆماری ئیسلامی ئیران ی لە ٤/٥/٢٠٠٠دا:

(برایم ئەحمەد بەدیارترین پێشڕەوی گەلی کورد دادەنرێ).[١٩٠]

- رۆژنامەی تایمسی لەندەنی لە ٢٨/٤/٢٠٠٠دا برایم ئەحمەدبە کەسایەتیەکی لووتکە لە قەڵەم دەدا و لەبارەیەوە دەڵێ:

(برایم ئەحمەد یەکێك لە دیارترین کەسایەتی کوردەکانی عێراقە لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا، پیاوێکی چالاك و خاوەن بیر و باوەڕێکی چەسپاو بوو، لەپاڵ درێژەدان بەخەبات لەپێناوی ئازادی سیاسی و کەلتوری کورد. بەرهەم و داهێنانە ئەدەبیەکانی سەرچاوەی ئیلاهام بەخشی

[١٩٠]- سەلاح الزەواوی- باڵیۆزی فەلەستین- کوردستانی نوێ ژ ٢١٣٨لە ٦/٥/٢٠٠٠ل ١.

دوونــەوەی کــورد بــوو بــۆ دەرك كــردن بــە جوانــی زمانــە دێرنەكــەیان و پەیڕەوكردنی ڕێبازەكەی).[191]

■ **پیتــەرهاین-** وەزیــری دەوڵــەتی بــەریتانیا بــۆ كاروبــاری دەرەوە لــە ۱۷/٤/۲۰۰۰دا ســەرنجی بــۆ ئــەوە ڕاكێشــاوە كــە: (برایــم ئەحمــەد كەسایەتی‌یەكی ناســراوو ڕێزلێگـیراو بـوو نـەك هـەر لـە نێـو كۆمـەڵانی خەڵكی كوردستان بەڵكو لە نێو كۆمەڵگەی نێو دەوڵەتیشدا).[192]

■ **دانیـال میـــتران ی-** دایكـە پەرۆشـەكەی كـورد- خـێزانی سـەرۆكی پێشووی فەرەنسابە دڵی پڕگریانەوە وتوویەتی:

(برایـم ئەحمـەد ی شـاعیر و نووسـەرو سیاسـەتمەدار كەخەباتی كـرد بـۆ ئاشتی و ئازادی هەروەها وڵاتەكەی و گەلەكەشی خۆش دەویست.. یەكێك بوو لەئێمەو هـی هـەموومان بوو. هـەروەك چـۆن خـۆی ووتـی بەباشـی نـەژیا بۆمردن بەڵكو مرد (ژیا) لەپێناوی ژیاندا پەیامی هیوا و ئازادی و یەكێتی (یەكبوونی) بۆ نەوەكانی داهاتوو بەجێ‌هێشت).[193]

■ **ئەنجوومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی** لە عێراق دەڵێن:

---

[191]- The Times كوردسانی نوێ ژ ۲۱۳۸له ٦/٥/۲۰۰۰ل ۲.

[192]- پیتەر هاین (وەزیری دەوڵەتی بەریتانیا بۆ كارو بـاری دەرەوە) ۱۷/٤/۲۰۰۰ كوردستانی نـوێ ژ ۲۱٤٥له ۱٤/٥/۲۰۰۰ل ۱.

[193]- دانیال میتران- ستاف و كارمەندی فرانس لیبەرتی- كوردستانی نوێ ژ ۲۱٤٦له ۱٥/٥/۲۰۰۰ل ۱.

(ئێمە وەك سیاسەتمەدارێكی ئازاو چاو نەترس برایم ئەحمەدمان ناسیبوو، ڕۆشنبیرێكیش بوو كە هەموو ژیانی بێ پچڕان و پسانەوە بۆ خزمەتی گەلەكەی تەرخانكردبوو. بەئامادەبوونی دیاری خۆی و بە بیروبۆچوونە ئامانجدارو پرشنگدارەكانی لە هەموو سیمینار و كۆنگرەكانی تایبەت بە عێراق تا دواساتەكان جێگاو شوێن و سەنگ و ڕێزێكی تایبەتی هەبوو لەسەر ئاستی عێراق و عەرەب بەگشتی.. یەكێ بوو لە پێشەنگەكانی بانگەشەی برایەتی و پێكەوە ژیانی ئاشتیانە لە عێراق و برا عەرەبەكانی خۆش دەویست و پارێزەریشیان بوو...).[١٩٤]

- **شبلی** ملاط- پاریزەری نێودەوڵەتی و پرۆفیسۆر لە یاسا، لە ڕۆژنامەی (الحیلة) لە ٢٠٠٠/٥/٢٨دا لە مەڕ برایم ئەحمەد بەم شێوەیە دەنووسێت:

(لەچەند هەفتەی ڕابردوودا دوو ڕوخساری درەوشاوەی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەم سەدەیەدا دیارنەمان... كەهەر یەكێكیان لەچەندین مەسەلەدا لەوەی تر جیایە (جۆرج لینجوفسكی) مامۆستای زانستە سیاییەكان لە زانكۆی (بیركلی) كە نە بەنەژاد و نە بەزمان و نە بەسەربردە ناگاتەوە. پارێزەری كۆچكردووی كورد مامۆستا برایم ئەحمەد كە بەدرێژایی سەدەی بیستەم ناوەكەی بەخەباتی گەلی كوردی عێراقەوە گرێ دابوو.. یاریدەدەری نزیكی مەلا مستەفای بارزانی بوو لە خۆشی و ناخۆشیدا...

[١٩٤]- وتاری ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە عێراق- غالب الاسدی لە ئاهەنگی چلەی ماتەمینی برایم ئەحمەد لە قەڵاچۆلان ٢٠٠٠/٥/١٧.كوردستانی نوێ ژ ٢١٤٩لە ٢٠٠٠/٥/١٨ل ٣.

ئەگەر خەباتی برایم ئەحمەد تا دوا ڕۆژەکانی کە هەرچەند مانگێك لەمەوبەر لە نیورك گفتوگۆیەکی یاسایی بەپێزمان کرد، ئەگەر ئەو خەباتە هەمیشە بەپارێزەرێکی بەڕێزی لەسەرخۆ لە قسەو ڕاستگۆ لە ناونیشان و ڕەفتاردا بەسترابێتەوە.... ئەوائەمڕۆ کوا ئەم ڕاستگۆییە، هەم لە حوکم و هەم لە ئۆپۆزسیون لە عێراق دا؟ کەشەڕی ناوخۆو پەیمانە شکێنراوەکان، باکورە کوردیەکەی عێراق و باشورە عەرەبیەکەی لەت و پەت کردووە؟ دیارنەمانی (برایم ئەحمەد) و (جۆرج لینجوفسکی) لە یەك کۆمەڵەی هاوبەشی تاڵدا یەك دەگرنەوە، ئەویش ئەوەمان دێنێتەوە یاد کە خۆرهەلاتی ناوەڕاست نەوەیەك لە کەڵە پیاوانی داڕێژەری ئێستاو پاش ڕۆژێکی لەدەست دەدات، کەوەك و ئەم دووانە (جنتڵمان بوون) ئێستا خەڵکی خۆبەزلزان و پارە خواز ناوچەکەیان تەنیوەتەوە).[195]

- **مونزر ئەلموسلی**[196] لە نامەیەکدا بەبۆنەی پرسەی برایم ئەحمەدەوە ناردویەتی نووسیوێتی:

(برایانی ئازیزی کورد، هەواڵی کەسەر باری ئەوەم پێگەیشت کە گەلی ئازیزی کورد یەکێك لە دیارترین و بەتواناترین سەرکردەکانی بزووتنەوەی

---

[195]- شبلی ملاط ڕۆژنامەی الحیاە لە ٢٠٠٠/٤/٢٨ ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژ ٢١٥٩لە ٢٠٠٠/٥/٣٠ل ٢.

[196]- مونزر ئەلموسڵی نووسەرێکی ناسراوو بەناوبانگی عارەبی سوریە و کتێبێکی لە بارەی کوردەوە داناوە ڕوناکبیرێکی عەرەبی نەتەوە پەرستە ئێستا نوێنەری (دیمشق)ە لە ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل- مجلس الشعب السوری- دۆستێکی نزیکی کوردە.

ڕزگاری خوازی نیشتمانی کوردستانی لە چەرخی تازەو یەکێك لە بانگەشە کارەکانی دێرینی برایەتی عەرەب و کوردی لەدەست دا...

مەرگ مامۆستای کۆچکردوو برایم ئەحمەدی ڕاپێچ کرد، بەڵام ڕۆڵی پێشڕەوانە و فیکری تازەگەرانە و تێکڕای مێژووەکەی هەرگیز ناپێچرێتەوە، ئێمەی عەرەب بە چاوی ئەو پیاوە ڕەسەنە ئازایە تەماشای دەکەین کە یەکەم کەس بوو مژدەی داو بانگەشەی بۆ پێویستی برایەتی نێوان عەرەب و کورد کرد و یەکەم هەوڵی فیکری چاپکراوی وەکو کتێب دانا کەتێیدا بانگەشە بۆ ئەم برایەتیە دەکات و سەروەری و سوودەکانی بۆ گەلەکە ڕوون دەکاتەوە، لەوەتی چلە کانەوە ڕەنگە یەکەم لاوی ڕووناکبیری کورد بووبێ ئایدۆلۆژیایەکی نەتەوەیی و سیاسی و پێشکەوتنخواز بۆ کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا دابنێ و لەگەڵ چەند کەسێکی ڕووناکبیری هاوتای خۆی حیزبێکی مێژوویی دابمەزرێنێ کە لە ڕیزەکانیدا خەڵکە هەڵبژاردەکە و پێشڕەوی ڕووناکبیری کورد کۆبکاتەوە لە پێشەوەیاندا مامۆستا (جلال تاڵەبانی) مەبەستیشم پارتی دیموکراتی کوردستانە).[197]

■ **<u>خاتوو جۆنز</u>**: جێگری سەرەکی یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا لە بروسکەیەکی پڕ پەژارەو غەمدا بەبۆنەی کۆچی دوایی برایم ئەحمەدەوە نووسییەتی:

(تازە هەواڵە ناخۆشەکەی مردنی سەرکردەیەکی مەزنی گەلی کوردم بیست، ژیانی برایم ئەحمەد هەتاهەتایە بەشێکی ناوەندی لە مێژوی گەلی کورددا دەمێنێتەوە، لەجیاتی دۆستە زۆرەکانتان لێرە لەوەزارەتی دەرەوەی ئەمەریکاتکایە پرسەمان لێ قبوڵ بکەن).[198]

---

[197] - مونزر الموسلی ٢٠٠٠/٤/١٧ کوردستانی نوێ ژ ٢١٣٤له ٢٠٠٠/٤/١٩ل ١- ١١.

[198] - ئەلیزابێس جۆنز- جێگری سەرەکی یاریدەدەری وەزیر ٢٠٠٠/٤/١١ واشنتۆن- کوردستانی نوێ ژ ٢١٢٠له ٢٠٠٠/٤/١٥ل ١.

فرانـک ریتچـارد دۆنـی لـه وەزارەتـی دەرەوەی ئەمـەریکا: دەڵێـت خەمباربووم بەزانینی لە دەسـتدانی برایـم ئەحمـەد یـەکێك لـە پێشـەنگ و مەزنەکانی تێکۆشانی دژی دیکتاتۆری لە عێراقدا).[199]

- حیکمـەت عـەلی- لێپرسـراوی ڕێکخسـتنی عـێراقی پـارتی بەعسـی عـەرەبی سۆشیالسـتی سـوریا برایـم ئەحمـەد بـە...( سـەرکردەی دیـار لـە بزووتنـەوەی ڕزگاریخوازی کـوردو گـەلی عـێراق (دادەنـێ) وە بـە بیرمـەند و تێکۆشەرێکی نەبەز کەزۆربەی ژیانی بۆ پشتگیری و پشتیوانی و بەشداری لـە خـەباتی نیشـتمانی و نەتـەوەیی لـەپێناوی ئـازادی و دادپـەروەری لەسەرتاسەری عێراق ناسیوە)

وە کۆچکردنی برایم ئەحمەد بەخەسارەتێکی گەورە لە بزووتنەوەی نیشتمانی عێراقی و عەرەبی و نێو دەوڵەتی لەقـەڵەم داوە.. بەتایبـەتی کەڵەپیاوێکی سیاسـەتمەداری لەدەسـت دا کـە گۆڕەپانـەکانی خـەباتی درێژخایـەن وەکـو سـەرکردەیەکی گـەورەو خۆڕاگـر دژی فاشـیزم و دیکتاتۆریەت باش ناسیویانە).[200]

---

[199] - وەزارەتـی دەرەوەی ئـەمریکا واشـنتۆن دی سـی ۲۰ ٥ر۲ لـە۱۰ /٤/۲۰۰۰- کوردسـتانی نـویٚ ژ ۲۱۱۸لە ۱٤/٤/۲۰۰۰ل ۱.

[200] - حکمەت عەلی بروسکەی ماتەمینی- کوردستانی نویٚ ژ ۲۱۱۸لە ۱۲/٤/۲۰۰۰ل ۱.

- **<u>ئەحمەد جبریل</u> ئەمینداری گشتی لیژنەی مەرکەزی بەرەی میللی ڕزگاری خوازی فەلەستین سەرکردایەتی گشتی لە ٢٠٠٠/٤/١٣دا برایم ئەحمەد بە:**

**(تێکۆشەر لەپێناوی ئازادی و تێکۆشەری ڕێگای بەخشین بە گەلێك کە فیداکاریەکانی لە ڕیزەکانیدا لەبیر ناکرێت باس دەکات).[٢٠١]**

- **<u>وەزارەتی ڕۆشنبیری کۆماری ئیسلامی ئێران</u> لە ٢٠٠٠/٤/٨دا کۆچکردنی برایم ئەحمەد بەم شێوەیە ڕادەگەیەنێ:**

**(ئەمڕۆ بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە هەواڵی کۆچی دوایی مامۆستا برایم ئەحمەد، یەکێك لەدیارترین سەرکردەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی لە کوردستانی عێراقمان بیست).[٢٠٢]**

**بەم چەشنە واتە لەدوای کەمێ نیشاندانی ئەو بیرو بۆچونانەی لەلایەن نووسەرو ڕۆشنبیرو سیاسەتوانی کورد و عەرەب و بیانی‌یەوە لەسەر برایم ئەحمەد نووسراون ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە هەموو ئەو بەڕێزانە برایم ئەحمەدیان بە کەسایەتی‌یەکی مەزن و جوامێرو کارامە و زیرەك و لێهاتوو لەخۆ بوردوویان داناوە. ناچارم پتر درێژە بەم بابەتە نەدەم و دەکرێ ئەوە**

---

[٢٠١] - بروسکەی ئەحمەد جبریل- ئەمینداری گشتی بەرەی ڕزگاریخوازی فەلەستین بەبۆنەی کۆچی دوایی برایم ئەحمەدەوە- ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ ژ٢١٢١ لە ٢٠٠٠/٤/١٦ل ١.

[٢٠٢] - وەزارەتی ئیتلاعاتی کۆماری ئیسلامی ئێران- تاران ١٣٧٩/١/٢١بەرامبەر ٢٠٠٠/٤/٨ کوردستانی نوێ ژ ٢١١٥لە ٢٠٠٠/٤/٩ل ١.

جێبێڵم بۆ ئەوانەی دوای خۆم، کەبەکاری پسپۆڕی یەوە خەریك دەبن، یەکەیەکەی چیرۆك و شیعرو وتارە سیاسی‌یەکانی برایم ئەحمەد بەوردی شی بکەنەوە و ڕێبازە فیکریەکەی دیاری بکەن و کاریگەری ئەدەب وفیکری (بلەی ئەحەڕش) لەسەر کۆمەلانی خەلك پلە بە پلە دیارو دەست نیشان بکەن.

# لەکۆتایدا....

ماوەتەوە بڵێم ئەگەر کەم و کوڕی و ئاراستەیەك لەم لێکۆڵینەوەدا هەبێت بەهیچ شێوەیەك نیشانەی کەمتەرخەمی و بێ‌توانایی نووسەر نیە. ئەوەی زانراوە و بلاوکراتەوە و بەرچاومان کەوتووە کۆمانکردۆتەوە و بیرو بۆچونی خۆمانمان لەمەڕ دەربڕیوە. دیارە ناوی کتێبەکەی ئێمە (برایم ئەحمەد ژیان و بەهرە و داهێنانی) یەتی نەك لێکۆڵینەوەی وردو قوڵ لەبەرهەمەکانی چونکە بەرهەمەکانی زۆرن لە ڕەخنەو پەخشان و شیعرو زمانەوانی و چیرۆك و وەرگێڕان و وتار، هەریەك لەم بابەتانە پێویستی بە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەیەکی وردو زانستی هەیە و دەکرێ نامەی دکتۆرای لەسەر بنووسرێ ئومێدەوارم نەوەی دوای ئێمە ئەو کارە لەئەستۆ بگرن. دیارە مرۆڤ ناتوانێ هەموو کەموکوڕیەکانی خۆی پڕبکاتەوە هەرچەندە شارەزاو لە خۆبردوش بێت منیش ئەوەی بۆم کرابێت و لوابێت درێغیم نەکردووە. هیوادارم توانیبێتم خزمەتێکی کەمی ئەدەبی کوردیم کردبێت....

# ((خلاصة الكتاب باللغة العربية))

في كتابنا المتواضع هذا حول الاديب والشاعر و السياسي (ابراهيم احمد) نستنتج و نستنبط مايلي:

- ابراهيم احمد والمعروف أدبياً باسم (**بلەی ئەحەرەش**) ولد من ابوين اميين ومن عائلة متواضعة الحال في بداية اندلاع الحرب العالمية الاولى، تلقى في بداية حياته العلوم الدينية الاولية و القران الكريم في الكتاتيب والمساجد مع اطفال كانوا في عمره، ثم واصل دراسته في محافظة السليمانية حتى المرحلة الثانية في المتوسطة، واستمر في الدراسة في محافظة بغداد وحتى حصوله على شهادة (البكاليوريوس) في كلية الحقوق.
- كان شخصية فعالة في مجال الثقافة الكردية وادابها طوال القرن العشرين.
- كان شاعرا سياسيا وكاتبا ولغويا وقاصا وصحفيا وبليغا في كافة هذه المجالات، مع كونه سياسيا ومحاميا معروفا كان حلو الكلام والحديث لطيف المعشر سريع البديهة.
- في افكاره المستنيرة وتحاليله المتعمقة وكتاباته التقدمية تتضح وطنيته وتعقله بقضايا شعبه وثقافته الواسعة.
- نلتمس بوضوح دعمه لحقوق ومتطلبات الكادحين في كردستان. وقد قضى سنوات من حياته بين غياهب وجدران السجون وتعرض لأبشع التعذيب والغربة والتشرد على امتداد سنوات حياته.

- خدم الادب الكردي و قضاياه باسلوب مركز، وان قصصه (مخاض الشعب- **ژانی گەل**) و (العوز- **کوێرەوەری**) و (الشوك والزهرة- **دڕك و گوڵ**) قد سدت ثغرة كبيرة في فراغ القصة الكردية.
- ندرت الكتابة والبحوث والتحقيقات حول ابراهم احمد وكتاباته السياسية والادبية اثناء حياتة، وذلك بسبب الحضر السياسي، لذا ان مصادر كتابنافي هذا الصدد اقتصرت فقط على كتاباته مع تحليلنا وتقييمنا الشخصي له. ويتضح ان الخلافات السائدة بين الكرد كان له الدور في اهمال وتهميش نتاجات هذا الكاتب، ونستطيع القول بانه كان مظلوما، والمعروف (ان الكرد لا يقدرون الانسان العظيم الا بعد مماته).
- كان بليغا ورائعا في مقالاته الصحفية، حيث كان لصحف (**گەلاوێژ- خەبات-چریکەی کوردستان**) الدور الفعال في خدمة الادب والثقافة والحركة التحررية الكردية وكان هو الكاتب والمرشد وصاحب امتيلز لاغلب تلك الصحف.
- كان رصين الاسلوب، بليغ العبارة، قوي الحجة في كتاباته، وطني النزعة في شعاراته، ثوريا في قصائده.
- اشعلت و امضت قصيص ابراهيم احمد في العصر الملكي ثورة وهاجة في اوساط الشعب، وكانت تلك القصص على خشبات المسرح بصورة تبرز وتوضح عوز وفقر الشعب، وكانت تلك القصص والمسرحيات مشجعة للثورة ضد الطبقة الحاكمه والطبقة المستغلة.

- رغم قلة قصائد الشاعر ابراهيم احمد، حيث ان غالبيتها كانت قصائد سياسية الا انها مثلت فيها الروح الثوريه والتعبئه الجماهريه ضد الطغيان والاستبداد والظلم حتى البيشمركة بدأوا يتغنون بهذه القصائد، وكانت حافزة للعزم والاصرار للوصول الى الهدف والمبتغى، وكانت القصائد روعة من ناحية الشكل والمضمون والنواحى الفنية الاخرى بحيث خطت نحو القمة والخلود ومن الواقعية الى الواقعية الاشتراكية.

- كان ابراهيم احمد سياسيا عظيما و مفكرا كبيرا ومتنورا ومثقفا قل نظيره في القرن العشرين بين طبقات المثقفين لشعبنا – حسب تصوري واعتقادي–وكان رائد تنظيم القومية الكردية ومبدع فكرة (اخوة الكرد والعرب) وان كتابه (الاكراد والعرب) خير دليل على تصورنا، وكان رائد مسار الحركة الكردية في جنوب كردستان.....

- حياته في الطفولة من فقر وبؤس وعوز عائلته والمحيطون بهم من أبناء شعبه، ومأساة الحرب العالمية الأولى، والقحط الكبير و (سفر بلك)، وتأسيس وانهيار حكومة الشيخ محمود في السليمانية، ومقتل الأبرياء في ال(٦) من أيلول الأسود، كل هذه هز ابراهيم احمد من الأعماق، من صلبه إلى مخ ولب عظامه، وأثر فيه وفي قصصه وأشعاره ومقالاته وكتاباته وظهر جليا واضحاً فيها، وأصبح مصدر إلهام نتاجاته.

- نحن نعتقد بأن إبراهيم احمد كان إنساناً عظيماً ورجلاً كبيراً ومضحياً، ولم يكن طامعاً في المناصب والدرجات الوظيفية والمال،

بديل انه ترك مهنته (القاضي) لأجل إصدار مجلة **(گەلاوێژ)** حيث لم يكن لهذه المجلة أي ربح مادي، وكان يديرها بالديون والقروض، كل هذا لأجل خدمة الأدب والثقافة الكردية وتثقيف أبناء أمته، وجلي أن مثل الرجل العظيم نادر الظهور في أوساط الأمم والشعب.

في كتابنا هذا...... تطرقنا الى العديد من نتاجاته وابدينا اراءنا وتحاليلنا حول الكثير منها، وتحدثنا عن مفاهيم ومقاصد ومغزى الكتاب في نصوصه، ولكننا لم نتعمق في كل التفاصيل، لان المواضيع متشعبة و كثيرة بحيث يتوجب ان تجرى تحليلات كثيرة و بحوث مستفيضة على كل نص على حدة،ويتوجب ان تدرس المواضيع وتقدم كرسائل واطروحات للدراسات العليا (الماجستير والدكتوراه) ولان موضوع كتابنا هذا تركز على (حياته ونتاجاته) لذا لم نستطع الخروج عن الحدود المرسومة والمسموحة لهذا العنوان على امل قبول اعتذاري بهذا الخصوص.

مع شكري وتقديري للجميع

# CONCLUSION

**In the end of this book we can show its conclusions intensively as below: -**

1. Ibrahim Ahmad Fatah, who was nicknamed Blay Aha Rash, was born in Sulaimaniyah city from humble, illiterate and working parents at the beginning of First World War, As a child like his coage friends he studied religious doctrines in mosquse first. Since then he was able to read and write Islamic holly verses in religious schools. Afterwards, he was accepted in state school and was able to reach second year stage in intermediate school. Then he completed his study in preparatory school and college of law in Baghdad.
2. He became famous personality of Kurdish intellect and literature through out twentieth century.
3. Ibrahim Ahmad was a talented and competent novelist, political poet and write. Besides, he was

bilingual and journalist, Notwithstanding he was lawyer and politician, he has sense of humor and was ready to answer any question directly.

4. His view points, meditations and writings testifies vividly that he was experienced intellect, progressive, patriotic and nationalist. He advocated rights and demands of toiled class of Kurdistan. Owing to this, he faced torture, refuge, imprisonment, wound and hard struggle throughout his life.
5. He contributed enormously to Kurdish literature. His stories like Bla, ZhaniGal (pain of people), Kwerawary (Despondancy) and novels like Drk u Gul (thorn and flower) have a tremendous prestige in the realm of Kurdish stories.
6. During his life very little was written on himself, his political and literal writings and inventions since they were censored by invaders. This is why our source of deliberations stem from his own subjects and our particular inside Kurdistan and appraisal of his subjects. Admittedly, infighting and

arguments inside Kurdistan played a role of ignoring and concealing analysis on his works. Therefore, we can say that he was betrayed and we can say that Kurds are recognized as alive killer and deceased worshiper.

7. In respect of Journalism he was a skilful Journalist Galawezh magazine, Khabat and Chrikay Kurdistan paper of which Ibrahim Ahmed was a concessionaire and guide had an enormous contribution to literature, enlightenment and movement of Kurdistan people liberation.
8. His stories in the bleak era (Kingdom era) created a revolution among Kurdish people. His works were played on the stages, uncovered extraordinary situation of Kurdish community and conducive to uprising against social rank discrimination and nationalistic systems.
9. Although his poems were few numerically, they were political and stereotype among Peshmarga and political activists of our nation as in the gloomy days they gave morale and will to the people. In terms of technique and art, they reached summit in

essence and appearance and changed from realistic approach to actual social realism one.

10. We believe that Ibrahim Ahmed was a unique great politician and intellect of our nation in twentieth century. He was a leader of Kurdish organization and founder of fraternal belief between Kurds and Arabs. The booklet of (Kurds and Arabs) and the approach of Kurdish movement in southern Kurdistan which Ibrahim Ahmad was its founder are proofs of our attitude.
11. In our subject we referred to most of his publications and gave our opinion of most of them, moreover almost all of his publications were analysed and his intention and meaning of his publications were discussed. It is crystal clear that we did not make a detailed analysis of all of his works altogether for the subjects are many.
12. Braem Ahmad spent his life through subsistence and poverty that his folks and acquaintances experienced, catastrophe of first world war, famine and Safarbalik (compulsory and random recruitment for first world war), the rise and fall of shekh Mahmud in Sulaimaniyah, terrorism and the bleak day of 6 September all of which affected him

with great pain and were reflected by his stories and poems, essays and writings and became the mainstay of his inspiration and conceits.

13. We believe that Braem Ahmad was a great toiler and never degraded himself for the sake of money or promotion of rank. His retirement from the position of judgeship to persevere, with incurring debts, in his efforts to publish Galawezh Magazine is a palpable substantiation, albeit it was not gainful work. His main objective was to enrich Kurdish literature and culture and to enlighten his nation. It is crystal clear that a great reputed man like him is very rare.

It is possible that each of the subjects, like (story, poem, translation, essay, journalism and linguistics) has its special deliberation for PHD and master thesis. Because our discussion was entitled life and works of Ibrahim Ahmed we could not deviate from it, so in this aspect I apologize.

# سەرچاوەکان

**بە زمانی کوردی**

١- د.ئاورە حمانی حاجی مارف -رابەری سەرچاوە- دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بەغداد ١٩٨٩ز.

٢- ئەحلام مەنسور -بینایی هونەری- دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم سلێمانی ١٩٩٩ز.

٣- ئەژی گۆران -ڕۆمان و پیشەی نووسینی رۆمان- چاپخانەی ئۆفسێتی مەشرق بەغدا ١٩٨٢ز.

٤- ئورخانی غالب -نەمری لە ئەدەبدا- چاپخانەی ئۆفسێتی ئازاد - سلێمانی ١٩٩٨ز.

٥- ئومێد ئاشنا -بەرەو هەوار -کۆمپیتەری ئەستێرە- سلێمانی ١٩٩٦ز.

٦- ئومێد ئاشنا -چەند وێنەیەك لە شیعری جیهانی. کۆمپیتەری ئەستێرە -سلێمانی ١٩٩٦ز.

٧- ئومێد ئاشنا -سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد -کۆمپیتەری ئەستێرە- سلێمانی ١٩٩٦ز.

٨- ئومێد ئاشنا -ولات پەرستی- کۆمپیتەری ئەستێرە- سلێمانی ١٩٩٦ز.

٩- ئومێد ئاشنا -سەرجەم شیعرەکانی برایم ئەحمەد- کۆمپیتەری ئەستێرە- سلێمانی ١٩٩٦ز.

١٠- ئیبراهیم ئەحمەد -درك و گوڵ چاپی سوید- ستوکهوڵم ١٩٩٢ز.

١١- ئیبراهیم ئەحمەد -ژانی کەل- چاپخانەی کاکەی فەللاح سلێمانی ١٩٧٣ز.

١٢- ئیبراهیم ئەحمەد -کوێرەوەری- چاپخانەی پیرۆز -تاران ابان ماه ١٣٤١هـ.

١٣- ئیبراهیم جەلال -خوارووی کوردستان و شۆڕشی ئەیلول- چاپخانەی ژیار سلێمانی -١٩٩٩ز.

١٤- باوکی سیناهی -جنێو بژێرێك لە چێشتی مجێوری هەژار موکریانی -چاپخانەی ژیار- سلێمانی ١٩٩٩ز.

١٥- د. جەمال نەبەز -کوردانی سەرگەردان و براموسڵمانەکانیان- بڵاوکراوەی کۆمەڵەی خوێندکارانی سلێمانی ١٩٩٨ز.

١٦- د.جەمال نەبەز -من شێواندومە لێتان- یان هەر خۆتان سەر لێشێواون -سوید ١٩٨٩ز.

١٧- حەسەن جاف -چیرۆکی نوێ کوردی- دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا ١٩٨٦ز.

١٨- حەمە سەعید حەمە کریم دیداری شیعری کلاسیکی کوردی - دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا ١٩٨٦ز.

١٩- حسین عارف -چیرۆکی هونەری کوردی- چاپخانەی دار الحریە بەغدا ١٩٧٧ز.
٢٠-حسین موحەمەد عەزیز -پێنج کات ژمێر لەگەل برایم ئەحمەد- چاپخانەی باران ١٩٩٥ز.
٢١- خالە دلێر -هەندێ وتار و چاوپێکەوتنی وێژەیی- چاپخانەی حەوادس بەغدا ١٩٨٥ز.
٢٢- د. دڵشاد عەلی- بنیاتی هەڵبەست- چاپخانەی رەنج سلێمانی ١٩٩٨ز.
٢٣-د.رەحیمی قازی -پێش مەرگە- چاپخانەی المانیا ١٩٦١ز.
٢٤-رەووف حەسەن -کرێکار و چیرۆکی کوردی- چاپخانەی عەلا ء بەغدا ١٩٨٢ز.
٢٥-سالح قەفتان- مێژووی گەلی کورد- چاپخانەی سەلمان الاعزەمی- بەغدا ١٩٧٨ز.
٢٦-عومەر مەعروف بەرزنجی -لێکۆڵینەوە و بیبلۆگرافیای چیرۆکی کوردی چاپخانەی کۆری زانیاری کورد بەغدا ١٩٨٧ز.
٢٧-عەبدول جەبار موحەمەد جەباری -مێژووی رۆژنامەگەری کوردی چاپخانەی ژین سلێمانی.
٢٨-د.عەبدولا غەفوور -ئەتنۆ- دیموگرافیای باشووری کوردستان لە بلاوکراوەکانی سەنتەری لیکۆڵینەوەی ستراتیژی کوردستان سلێمانی ٢٠٠٠ز.

٢٩- عەبدول رەزاق بیمار -پەخشانی كوردی- دەزگای رۆشنبیری و بڵاوكردنەوەی كوردی بەغدا ٢٠٠٠ز.

٣٠-د. عەزیز شەمزینی -جوڵانەوەی رزگاری نیشتمانی كوردستان- لە بڵاوكراوەكانی سەنتەری لێكۆڵینەوەی ستراتیژی كوردستان سلێمانی ١٩٩٨ز.

٣١- د. عەزیز گەردی -ئەدەبی بەراوردكاری -چاپخانەی كۆڕی زانیاری بەغدا ١٩٨٩ز.

٣٢- د.عەلی شەریعەتی -عیرفان بەرامبەر ئازادی- وەرگێرانی هەژار موكریانی -چاپخانەی ئینتشاراتی سروشی پەخشی كوردی -تاران ١٩٨٠ز.

٣٣-د.عیزەدین مستەفا رەسول. ئوستاد -چاپخانەی سەفوەت- سلێمانی ١٩٩٧ز.

٣٤- د. عیزەدین مستەفا رەسول. دەربارەی رۆژنامەگەری كوردی. چاپخانەی دار الجاحظ بەغدا ١٩٧٣ز.

٣٥-غەفوری میرزا كریم -یادگاری لاوان و دیاری لاوان- چاپخانەی كوری زانیاری بەغدا ١٩٨٧ز.

٣٦-غەفوری میرزا كریم -كێو ماڵێ بەنێو بیرەوەریەكانمدا- چاپخانەی هەمیشە- سلێمانی ٢٠٠٠ز.

٣٧-د. فازل جاف -شانۆ- ڕوانینی نوێ- چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر ٢٠٠٠ز.

٣٨-فەتاحی ئەمیری -هاوارە بەرە- ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەیوبی. ورمێ ١٩٩٩ز.

٣٩- فواد حەمە خورشید -کورد- لێکۆڵینەوەیەکی زانستییە- چاپخانەی تیشك سلێمانی ٢٠٠٠ز.

٤٠-فەرەج عەلی فودە -پێش رمان- وەرگێر بروسکە- چاپی یەکەم سلێمانی ١٩٩٩ز.

٤١- د. کامل حەسەن بەسیر -مێژووی رەخنە سازی. دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا.

٤٢- کاکەی فەلاح -کاروانی شیعری نوێ کوردی- چاپخانەی کۆڕی زانیاری بەغدا ١٩٧٨ز.

٤٣-د. کەمال مەزهەر ئەحمەد -تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی رۆژنامەگەری کوردی. چاپخانەی کۆڕی زانیاری- بەغدا ١٩٧٨ز.

٤٤- کەریمی حیسامی -ئەفسانە کوردیەکان- ستوکهۆڵم-١٩٩٩ز.

٤٥- لەتیف هەڵمەت -ئەو هۆنراوەیەی کە تەواو ئەبێ و تەواو نابێ- چاپخانەی حەوادس بەغدا ١٩٧٩ز.

٤٦-د. کەمال مەزهەر ئەحمەد -چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد. چاپخانەی الادیب بەغدا ١٩٨٥ز.

٤٧-کەیوان ئازاد ئەنوەر -چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی نوێ و هاوچەرخی گەلی کورد. سلێمانی ٢٠٠٠ز.

٤٨-گەلاوێژخان -بەرەو ئەشکەوتی دلێران- لەندەن ١٩٩٤ز.

٤٩- محەمەد دلێر حمد ئەمین -رۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ- نامەی ماجیستێر بۆ زانکۆی سەلاحەدین- هەولێر ١٩٨٩ز.
٥٠-محەمەد حەمە ساڵح توفیق -هونراوە و چیرۆکی فۆلکلۆری- چاپخانەی ئەژین سلێمانی ٢٠٠٠ز.
٥١- محەمەد رەسول هاوار -سمکۆی شکاك و بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد. چاپخانەی ئاپێك سوید ١٩٩٥ز.
٥٢- مستەفا زەنگەنە -سۆزە نهێنییەکانی ناوداران- چاپخانەی بەغدا ١٩٨٥ز.
٥٣-مستەفا ساڵح کەریم- هونەری کورتە چیرۆك نووسین- چاپخانەی دار الرسالە بەغدا ١٩٨٥ز.
٥٤- مەحمودی مەلا عیزەت -کاروانی بێ کۆتایی- دەزگای چاپ و پەخشتی سەردەم سلێمانی ٢٠٠٠ز.
٥٥- میرزا موحەمەد مەنگوری -بەسەر هاتی سیاسی کورد- چاپخانەی روون سلێمانی ٢٠٠٠ز.
٥٦-نەوزاد عەلی ئەحمەد -مامۆستا برایم ئەحمەد و رۆژنامەی خەبات- سلێمانی ٢٠٠٠ز.
٥٧-نەوشیروان مستەفا ئەمین -پەنجەکان یەکتر ئەشکێنن- چاپخانەی زانکۆ سلێمانی ١٩٩٧ز.
٥٨-نەوشیروان مستەفا ئەمین- خولانەوە لە ناوبازنەدا- چاپ و بلاوکردنەوەی مەڵبەندی ئاوەدانی کوردستان- بەرلین ١٩٩٩ز.

٥٩- نەوشیروان مستەفا ئەمین -سەردەمی قەڵەم و موراجەعات. پەخشی سەردەم سلێمانی ١٩٩٩ز.

٦٠-نەوشیروان مستەفا ئەمین -لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ- چاپخانەی زانکۆی سلێمانی ١٩٩٧ز.

٦١- وریا جاف -کاروانی رۆژنامەگەریی کوردی -چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر ١٩٩٨ز.

٦٢- هەژار موکریانی -بارزانی- چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری هەولێر- ١٩٩٨ز.

٦٣-هەژار موکریانی -چێشتی مجێور- چاپی پاریس ١٩٩٧ز.

٦٤-هێمن مهابادی- چەپکێ گوڵو چەپکێ نێرگز، چاپخانەی ئینتیشاراتی رەهرو- مهاباد- ١٩٩٨ز.

## ٢- بەزمانی عەرەبی

١- ابراهيم احمد -الاكراد و العرب- مطبعة صلاح الدين-بغداد- ١٩٣٧م.
٢- د. برهان غليون- اغتيال العقل- مكتبة مدبولي- القاهرة- ١٩٩٠م.
٣- د. برهان نغليون -اغتيال العقل- مكتبة -مدبولي- القاهرة ١٩٩٠ز.
٤- جرجيس فتح الله و ديفيد ادامسن -الحركة الكردية و انشقاق ١٩٦٤م دار ئاراس للطباعة و النشر اربيل ١٩٩٩م.
٥- جعفر عباس حميد -التطورات السياسية في العراق. مطبعة النعمان- بغداد ١٩٨٦م.
٦- د. جميل نصيف التكريتى -ايضاءة تأريخية على قضايا أساسية. دار الشؤون الثقافية العامة- بغداد ١٩٩٣م.
٧- د.جميل نصيف التكريتى -نظرية الادب- مترجمة عن عدد من الباحثين السوفيت دار رشيد للنشر بغداد ١٩٨٠م.
٨- حبيب محمد كريم -صفحات من نضال الشعب الكردي. مطبعة الپارتى ١٩٩١م.
٩- حسن السعيد -نواطير الغرب -مؤسسة الوحدة للدراسات- بيروت ١٩٩٢ز.
١٠- حسن العلوي -اسوار الطين -دار الكنوز الادبية. بيروت لبنان ١٩٩٥م.
١١- حسن العلوي -العراق دولة المنظمة السرية. طبع في لندن ١٩٩٠ز.

١٢- د. دلاور محمد صابر -نفخات علمية- مطبعة وزارة التربية اربيل ١٩٩٩م.

١٣- سعد البزاز -الاكراد في المسألة العراقية- منشورات الاهلية- الملكة الاوردنية -عمان- ١٩٩٧م.

١٤- شاكر حسن أل سعيد. مقالات في التنظير و النقد الادبي. مطبعة دار الشؤون الثقافية- بغداد ١٩٩٤م.

١٥- د.شكري عزيز الماضي. في نظرية الادب- دار الحداثة للنشر- بيروت ١٩٨٥م.

١٦- المحامي شيخ سالار الحفيد -على العسكرى و الحكم للتأريخ مطبعة- سليمانية ٢٠٠٠م.

١٧- العميد عبد الرزاق محمد اسود -المدخل الى دراسة الاديان و المذاهب. الدار العربية للموسعات بيروت ١٩٨١م.

١٨- د. عبد الستار جواد -اوراق للريح- دار الشؤون الثقافية- بغداد ١٩٩٢م.

١٩- د. عبدالستار طاهر شريف -الجمعيات و المنظمات و الاحزاب الكردية في نصف قرن. شركة المعرفة للنشر و التوزيع بغداد.

٢٠- د. عدنان عباس على -فخ العولمة- مترجمة عن هانس و هارالد- اصدرها المجلس الوطني للثقافة و الاداب كويت ١٩٩٨م.

٢١- د. عزالدين اسماعيل- الادب و فنونه. دار الفكر العربي. ١٩٧٣م.

٢٢- د. عزالدين مصطفى رسول -الواقعية في الادب الكردي. دار المكتبة العصرية صيدا- بيروت ١٩٧٣م.

٢٣- الشيخ عطا الطالباني - عندما تتكلم الارقام- مطبعة وزارة الثقافة- السليمانية ١٩٩٩م.

٢٤- د. علي الوردي. مهزلة العقل البشري. انتشارات الشريف الرضى. طهران ١٩٥٦م.
٢٥- فؤاد حمه خورشيد -العشائر الكردية- مطبعة الحوادث بغداد ١٩٧٩م.
٢٦- د. فؤاد معصوم. أخوان الصفاء- دار المدى للثقافة و النشر. سوريا ١٩٩٨م.
٢٧- قدري جميل باشا -مسألة كردستان- مطبعة بيروت ١٩٩٧م.
٢٨- محمد خليل امير -علاقة الاكراد بمذابح الارمن- اعادة طبعه في السليمانية ١٩٩٩م.
٢٩- د. محمد فاروق البهان -نظام الحكم في الاسلام. مطبعة جامعة تكريت -العراق ١٩٧٣م.
٣٠- د. محمد منذر عياش -مفهوم الادب. مترجمة عن تزيفيثان تو دوروف دار الذاكرة. حمص سوريا ١٩٩٠م.
٣١- محي الدين صبيحي -نظرية الادب. مترجمة عن اوستن وارين- رينية ويليك. مطبعة خالد الطرابيشي. ١٩٧٢م دمشق.
٣٢- د. نصر حامد ابو زيد- نقد الخطاب الديني- دار سينا للنشر مصر ١٩٩٤م.
٣٣- ياسين النصير- الاستهلال في البدايات في النص الادبي -دار الشؤون الثقافية بغداد- ١٩٩٣م.
٣٤- يوسف عبدالمسيح -اصول أدب الحداثة -مترجمة عن مايكل- ه - نيفنسن- دار الشؤون الثقافية العامة- بغداد ١٩٩٢م.

## گۆڤارەکان

- گۆڤاری گەلاوێژ ژمارەکانی (١-١١٦) ساڵی ١٩٣٩-١٩٤٩ز بەغداد.
- گۆڤاری دەنگی گێتی تازە ژمارە (٢) بەرگی چوار مایسی ١٩٤٥ز بەغدا.
- گۆڤاری نزار ژمارەکانی(١-٢٢) ساڵی ١٩٤٨ز-١٩٤٩ز بەغدا.
- گۆڤاری شەفەق ژمارە (٨)ئابی ١٩٥٨ز کەرکوك.
- گۆڤاری بڵێسە ژمارە (٩) نیسانی ١٩٦٠ز سلێمانی.
- گۆڤاری رۆژی نوێ ژمارەکانی (١-٩) ساڵی ١٩٦٠ز سلێمانی.
- گۆڤاری رزگاری ژمارەکانی (١-٧) ساڵی ١٩٦٩ز سلێمانی.
- گۆڤاری روناهی ژمارە (١) ساڵی ١٩٦٢ز بەغدا.
- گۆڤاری برایەتی ژمارەکانی (١، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ ، ٦ ، ٧ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ) ١٩٧٠ز بەغدا.
- گۆڤاری دەفتەری کوردەواری ژمارەکانی (٢-٣) ساڵی ١٩٧٠ز بەغدا.
- گۆڤاری نووسەری کورد ژمارەکانی ساڵی ١٩٧١ز تا ساڵی ١٩٨٢ز بەغدا.
- گۆڤاری کۆری زانیاری کورد ژمارەکانی ساڵی ١٩٧٤ز ساڵی ١٩٧٥ز ساڵی ١٩٧٨ز ساڵی ١٩٨٠ ساڵی ١٩٨١، ساڵی ١٩٨٨، بەغدا.

- **گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارەکانی (٢ ، ٣ ، ٤٢ ، ٥٠ ، ٥١ ، ٥٢ ، ٥٤ ، ٥٥ ، ٥٦ ، ٥٧ ، ٥٨ ، ٧١ ، ٧٤ ، ٧٥) ساڵی ١٩٧١ز ١٩٨٦ بەغدا.**
- **گۆڤاری چریکەی کوردستان ژمارەکانی (١-٩) ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٥ز لەندەن.**
- **گۆڤاری بەیان ژمارە (٥) ساڵی ١٩٧١و ژمارە (١٨٤) ساڵی ١٩٩٩ز بەغدا.**
- **گۆڤاری صرخە کوردستان ژمارەکانی (١-٥) ساڵی ١٩٨١-١٩٨٦ز لەندەن.**
- **گۆڤاری رەنگین ژمارە (٩) ساڵی ١٩٨٨ز بەغدا.**
- **گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژمارە (١٢١) ئاداری ١٩٨٩ز بەغدا.**
- **گۆڤاری سەنتەری برایەتی ژمارەکانی (٣-١٦) ساڵی ١٩٩٧-٢٠٠٠ هەولێر.**
- **گۆڤاری کاروان ژمارەکانی (١١٦ ، ١٣١ ، ١٣٥ ، ١٣٦ ، ١٣٧ ، ١٣٨ ، ١٤١ ، ١٤٣) ساڵی ١٩٩٧- ٢٠٠٠ز هەولێر.**
- **گۆڤاری ڕامان ژمارەکانی (١٣ -٥٢) ساڵی ١٩٩٧ز - ٢٠٠٠ز هەولێر.**
- **گۆڤاری گەلاوێژی نوێ ژمارەکانی (١-٢٠) ساڵی ١٩٩٧ز - ٢٠٠٠ز سلێمانی.**
- **گۆڤاری هەزار مێرد ژمارەکانی (١-١٠) ساڵی ١٩٩٧-٢٠٠٠ز سلێمانی.**
- **گۆڤاری پەیڤین ژمارەکانی (١-٨) ساڵی ١٩٩٩-٢٠٠٠ز سلێمانی.**

- گۆڤاری ڕێبازی نوێ ژمارەکانی (١١ ، ١٢ ، ١٥ ، ١٦) ساڵی ١٩٩٨ز – ٢٠٠٠ز سلێمانی.
- گۆڤاری سەردەم ژمارەکانی (١ ، ٦ ، ٨ ، ١٠ ) ساڵی ١٩٩٩ز–٢٠٠٠ز سلێمانی.
- گۆڤاری ئاینده ژمارەکانی (١ ، ٢ ، ٣ ، ٤ ، ٥ ، ٨ ، ٩ ، ١٠ ، ١١ ، ١٢ ، ١٣ ) ساڵی ١٩٩٩ز–٢٠٠٠ز سلێمانی.
- گۆڤاری ئێستا ژمارەکانی (١٢ ، ١٣ ، ١٤ ، ١٥ ، ١٦ ، ١٧ ، ١٨ ) ساڵی ١٩٩٩ز سلێمانی.
- گۆڤاری باسکار ژمارەکانی (١ ، ٢ ، ٣ ) ساڵی ١٩٩٨ز–٢٠٠٠ز لەندەن.
- گۆڤاری رابوون ژمارە ٢٩ ساڵی ٢٠٠٠ز ئوپسالا –سوید.

## رۆژنامەکان

- رۆژنامەی ژیان– ژمارەکانی (٢٤١ ، ٢٤٣ ، ٣٢٦ ، ٣٢٨ ، ٣٣٠ ، ٣٣٤ ، ٣٣٥ ، ٣٥٥ ، ٣٥٦ ، ٣٥٧ ) ساڵەکانی ١٩٣٠ ، ١٩٣٢ ، ١٩٣٣ ز سلێمانی.
- رۆژنامەی ژین– ژمارە (٧٧٨) لە ١٥/٣/١٩٤٥ز سلێمانی.
- رۆژنامەی خەبات ژمارەکانی (١-٤٦٢) ساڵەکانی ١٩٥٩، ١٩٦٠، ١٩٦١ز بەغدا.
- رۆژنامەی کوردستان ژمارەکانی (١-٥) ساڵی ١٩٦١ز بەغدا.
- رۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٢٩) لە ساڵی ١٩٧١ز بەغدا.
- رۆژنامەی التآخی ژمارە (١٤٤٩) تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧٦ز بەغدا.
- رۆژنامەی هەرێم ژمارە (١٩٥) لە ١٠/٤/٢٠٠٠ سلێمانی.
- رۆژنامەی کوردستانی نوێ ژمارەکانی ( ٢١١٥ ، ٢٢١٦ ، ٢١١٧ ، ٢١١٨ ، ٢١١٩ ، ٢١٢١ ، ٢١٢٢ ، ٢١٢٣ ، ٢١٢٤ ، ٢١٣١ ، ٢١٣٢، ٢١٣٣ ، ٢١٣٨ ، ٢١٤٥ ، ٢١٤٦ ، ٢١٤٩ ، ٢١٥٢ ، ٢١٥٩ ) ساڵی ٢٠٠٠ سلێمانی.

## دیدار و فاکس و بەیاننامە

- دیداری تەلەفزیونی میدیا لەگەڵ برایم ئەحمەد لە شەوی ٢٠٠٠/٤/١٨ تەلەفزیۆنی خاك دووبارە پەخشی کردووە.
- فاکسی تایبەتی برایم ئەحمەد بۆ نوسەری ئەم کتێبە لە ١٩٩٩/١١/٢٥ز.
- لە وەڵامی نامەی نووسەری ئەم کتێبەدا لە لایەن برایم ئەحمەدەوە بە فاکس لە ١٩٩٩/١٢/٩ز.
- بەیاننامە و بانگەوازی کۆنسەی سەرۆکایەتی پارتی کرێکارانی کوردستان لە نیسانی ٢٠٠٠ز دا.
- گەلاوێژ خانی هاوسەری برایم ئەحمەد لە چاوپێکەوتنێکی تایبەتیدا لەگەڵ نووسەری ئەم کتێبە لە سلێمانی لە ٢٠٠٠/٧/٢٤دا.

# پێڕست

# سوپاس و پێزانین

سوپاسی بێ پایانم بۆ بەڕێزان:

- ❖ پرۆفیسۆر دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ.
- ❖ پرۆفیسۆر دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارف.

که هاوکارو هاندەرم بوون لە نووسینی ئەم کتێبە، لەخوای گەورە داواکارم تەمەنیان درێژ بێت.

- ❖ بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری کاك (فەتاح زاخۆیی) یارمەتی دام بۆ بەچاپگەیاندنی.
- ❖ مامۆستا عەبدولقادر ئەمین ئەحمەد ئەرکی زۆری کێشا بۆ سەرپەرشتی لەچاپدانی.

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا...

* ناوی ئەحمەد کوڕی شەریفی عەلی برایمی قادر جیمەنی (لەك)ە.
* لە هاوینی ١٩٤٢ز لە شارۆچکەی دووبز- لە کەرکوك لەدایك بووە.
* خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و ئامادەیی لە هەولێر تەواو کردووە.
* لە زانکۆی بەغدا بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاسا (قانون) وەرگرتووە.
* لە زانکۆی صەلاحەدین بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە ئەدەب و زمانی کوردی وەرگرتووە.
* لە زانکۆی سلێمانی بڕوانامەی ماجستێری لە ئەدەبی کوردی وەرگرتووە.
* لەدوای ڕاپەڕین لە تەشکیلاتی یەکەم حکومەتی هەرێمی کوردستان پۆستی بریکاری (وەکیل) وەزارەتی ناوخۆی پێسپێردراوە.
* لە ١٩٩٥/١٠/٥ز پۆستی بریکاری وەزارەتی دارایی و ئابووری پێسپێردراوە.
* لە ١٩٩٧/١١/٢٢ز پۆستی بریکاری وەزارەتی کشتوکاڵ و ئاودێری پێسپێردراوە.
* لە ١٩٩٨/٥/١١ز لە سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران کراوە بەڕاوێژکار.
* لە ٢٠٠١/١/٢ز بەسەرۆکی دیوان دامەزراوە.
* لە ٢٠٠١/٦/١٢ز کراوە بە یاریدەدەری سکرتێری گشتی بۆ کاروباری یاسایی لە سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان.